ژێرار شالیان

# تراژیدیای کورد

## (راپۆرتێك بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان)

وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە

وریا رەحمانی

پێداچوونەوەی

ئاسۆ کەریم

هەولێر - ٢٠١٠



**ناونیشانی ئەم کتێبە بە ئینگلیزی**

THE KURDISH TRAGEDY, GERARD CHALIAND, ZBOOKS, LONDON AND NEWJERCY, IN ASSOCIATHION WITH UNRISD

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **تراژیدیای کورد (راپۆرتێك بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان)**
- نووسینی: ژێرار شالیان
- وەرگێڕانی: وریا رەحمانی
- پێداچوونەوەی: ئاسۆ کەریم
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- پیتچنین: وەرگێڕ
- بەرگ: مەریوان زەندی
- ژمارەی سپاردن: (٨٢)
- نرخ: (٤٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٠
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٤٣٤)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

**پێشکەشە بە:**

بەڕێز و خۆشەویست کاك (عارف نادری)

بەیادی رۆژانی پێشمەرگایەتی

**ژێرار شالیان** نووسەری ناسراوی نێونەتەوەیی لە بواری شەڕی پارتیزانی و بزووتنەوە رزگاریدەرەکان و دۆستی نەتەوەی کورد، لە دوای شەڕی کەنداو لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێك لەسەر بارودۆخی کوردەکان هەڵبژێردرا، کە کتێبی "تراژیدیای کورد" بەشێکە لەم راپۆرتە. ژێرار شالیان هەروەها خاوەن دەیان بەرهەمی دیکەیە کە بەشێك لەوانە بریتین لە:

١- نەتەوەی بێ دەوڵەت (کورد وکوردستان)

٢- شۆڕش لە جیهانی سێیەم

٣- بەرخۆدانی فەلەستین

٤- خەباتی چەکداری لە ئەفریقا

٥- خەبات بۆ ئەفریقا و ستراتیژی زلهێزەکان

٦- جووتیارانی باکووری ڤییەتنام

٧- ستراتیژییە پارتیزانییەکان

٩- گەنجینەی حەماسەکانی جیهان

١٠- ئەتلەسی هەزارە: مەرگی ئیمپراتۆرییەکان

١١- راپۆرتیك لە ئەفغانستان

١٢- مێژووی ترۆریزم

١٣- ئیمپراتۆری مەغۆل

١٤- هونەری جەنگ لە مێژووی جیهاندا

١٥- ئەتلەسی ستراتیژیك: ژیۆپۆلۆتیکی بەراوردکاری زلهێزەکانی جیهان

١٦- ئیمپراتۆرییە گەڕۆکەکان

١٧-کەمینەکان لە سەردەمی دەوڵەت — نەتەوەدا

United Nations
Research Institute for Social Development

ئێنیستیتۆی توێژینەوەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNRISD) ڕێکخراوێکی توێژینەوەیی سەربەخۆیە کە گرنگی بە کێشە کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکانی پێشکەوتن دەدات. کاری ئەم ڕێکخراوەیە لەو روانگەیە سەرچاوە دەگرێت، کە بۆ ڕێسابەندکردنی پێشکەوتنی کارا، تێگەیشتن لە بوارە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان زۆر پێویستە، لەبەرئەوەی کە لەم ڕێگایەوە چۆنیەتی کاریگەری ئەم سیاسەتانە لەسەر گروپە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان هەڵدەسەنگێندرێت. پرۆگرامە توێژینەوەییە چەند لایەنەییەکانی ئەم ڕێکخراوەیە لە لایەن ستافێکی بچووك لە ژنێڤ و هاواهەنگکارانی بیانی دادەڕژێت و بە هاوکاری تیمە توێژینەوەییە نەتەوەییەکانی نێو زانکۆکان و ئینیستێتۆ محەلییەکان (زۆرتر لە وڵاتە پێشنەکەوتووەکان) دەکەوێتە قۆناخی جێبەجێکردن.

پرۆگرامە توێژینەوەییەکانی هەنووکەی UNRISD ئەم تەوەرانە لە خۆ دەگرێت:

"پێشکەوتنی بەردەوام لە ڕێگای بەشداری خەڵك لە بەڕێوەبردنی سەرچاوەکان، دینامیکە کۆمەڵایەتییەکانی لە نێوبردنی دارستانەکان لە وڵاتە پێشنەکەوتووەکان، کاریگەریی پەرەسەندنی کشتوکاڵ لەسەر بەڕێوەبردنی بەردەوامی دارستانە ئیستواییەکان، ژنان، ژینگە و حەشیمەت، گۆڕانکارییەکانی ژینگە و پرۆسەکانی پێشکەوتن، قەیران، گۆرانکارییە کۆمەڵایەتییەکان، بەشداریکردن و گۆڕانکارییەکانی پەیوەندییە خاوەندارییەتییەکانی کۆمەڵگا کۆمۆنیستی و پۆست کۆمۆنیستییەکان، ناکۆکییە ئیتنیکییەکان و پێشکەوتن، توندوتیژی سیاسی و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، پەنابەران، ئەوانەی کە گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان و کۆمەڵگای محەلی، کاریگەرییە ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی بەرهەمهێنان، بەکارهێنان و بازرگانیکردن بە ماددە سڕکەرەکان و پێوانە چۆنایەتییەکانی پێشکەوتن".

# پێشەکیی نووسەر بۆ چاپی کوردی

لە کاتی نووسینی ئەم راپۆرتە بۆ کومیسیونی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پاش شەڕی کەنداو کە لە سەرەتای نەوەدەکاندا کرا بە کتێب و لە ژێر ناوی "تراژیدیای کورد"دا بلاو بووەوە، کێشەی کورد لەو کاتەوە تا ئێستا بەرەوپێشچونێکی بەرچاوی بە خۆوە بینوە.

لە ئێران، کێشەی کورد بەرەوپێشچوونیکی ئەوتۆی بە خۆوە نەبینیوە، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (PDKI) لەت بووە و کەوتووەتە ناو بارودۆخیکی زۆر دژوار و لە رێبەرایەتییەکی بوێر وەك ئەوەی عەبدولرەحمان قاسملوو بێبەش بووە.

لە سوریا، پەیوەندی نیوان دەولەتی سوریا و کەمینەی کوردی ئەو ولاتە کە نزیکەی دوو میلیون کەسن، خراپە، بۆ نمونە چەند سال لەمەو پێش بارودۆخەکە لە قامیشلۆ ئالۆز بوو.

لە لایەکی دیکەوە لە تورکیا، لە کاتی هاتنەسەرکاری"پارتی داد و گەشەپێدان"(AKP) دەرفەتی چارەسەربوونی کێشەی کورد لە ریگای ناسەربازی زیاتر رەخساوە و کوردەکان مافی ئەوەیان بە دەست هێناوە زمانەکەیان بە کار بهێنن، لە حالێکدا کە لەیلا زانای ئەندامی پارلمان بە هۆی قسە کردن بەم زمانە، زیاتر لە ١٠ سال لە بەندیخانەدا بوو. لەگەڵ ئەمەشدا پارتە کۆنەپارێزەکانی تورکیا و بەشێك لە سوپا هەوڵ دەدەن لە رێگای داخستنی پارتگەلێك وەك "پارتی کۆمەلگای دیموکراتیك"(DTP) ، ئاژاوە بنێنەوە.

باشترین بارودۆخ بو گەلی کورد لە عێراق رەخساوە. سەرەتا لە نێوان ١٩٩١ و ٢٠٠٣ و بە تایبەت لە ١٩٩٧ تا ٢٠٠٣ لە رێگای بەرنامەی نەوت لە بەرامبەر خۆراك و پاشان دوابەدوای رووخانی رژێمی سەدام حوسەین، بارودۆخی کوردەکان زۆر باشتر بووە.

لە ساڵی ٢٠٠٣وە، بە رێبەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان(کە مەسعود بارزانی سەرۆکایەتی دەکات) و یەکێتی نیشتمانی کوردستان(کە جەلال تالەبانی سەرۆکایەتی دەکات) کوردەکان توانیویانە بە شێوەیەکی چالاك، کوردستانێکی نیمچە سەربەخۆی تا رادەیەك خۆشبەخت پێکبهێنن. بە هەرحال بارودۆخی سیاسی هەستیار دەبێت ئەگەر بێت و سەربازانی



ئەمریکا لە دیسامبری ٢٠١١ لە عێراق بچنە دەرەوە. روونە کە نوری مالکی ئەو پەڕی هەوڵی خۆی دەدات دەولەتێکی ناوەندی بەهێز دابمەزرێنێت.

ئەگەر سەربازانی ئەمریکا، عێراق بە جێ بهێلن، سونییەکان و گەلێ لە شیعەکان هاوپەیمانییەك دژی ئوتۆنۆمی هەرێمی کوردستان پێکدەهێن. کێشەی کەرکوك بێگومان کێشەی سەرەکی دەبێت، هەلۆێستی تورکیاش چی دەبێت، دیسان جێگای پرسیارە.

ئەوەی کە ئێمە لەم دە ساڵەی رابردوودا بینیومانە ئەوەیە کە کوردەکان نەتەنها توانیویانە وەك پێشمەرگە شەر بکەن(کە لە ١٩٢٠ دەستی پێکرد)، بەلکو سەلماندوشیانە کە دەتوانن وەك کیانێکی نیمچە سەربەخۆ حکومەت بکەن و پێشبکەون. ئەم پێشکەوتنە لە بارودۆخیکی تایبەتدا هاتووەتە ئاراوە و زۆربەی دراوسێکانی کوردەکان لەمە خۆشحال نین.

بە هەرحال بە لەبەرچاو گرتنی ئەم هۆکارانە، داهاتوو چۆن دەبێت، دیار نییە.

سپاس بۆ کاك وریا رەحمانی کە هەلساوە بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە، هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم.

**ژێرار شالیان**
**پاریس**
**١٩-١-٢٠١٠**

# پێشەکیی وەرگێڕ

بەسەرهاتی کورد زۆر لەوە ناخۆشترو کارەساتبارترە کە ناوی بنرێ تراژیدیا. زۆر زەحمەتە مرۆڤ بتوانێت ناوێکی گونجاو بۆ چارەنووسی پڕ ماتەمینی و خوێناوی کورد بدۆزێتەوە. بەهەرحاڵ تراژیدیا، ژینۆساید، کارەسات یان هەر ناوێکی دیکە بۆ ئەم مەبەستەی ئێمە زۆر گرینگ نییە، ئەوەی کە گرینگە هۆکارەکان و ئافرێنەرانی ئەم دۆخەن. بەواتایەکی دیکە هۆکاری سەرهەڵدانی دیاردەی تراژدیای کورد چییە و کێ بەرپرسیاری خولقاندنی ئەم کارەساتەیە، کورد بۆ خۆی، داگیرکەران، زلهێزەکان؟

گەلێ کەس لەو بڕوایەدان کە هۆکارە نێوخۆییەکان وەك خیانەت، جیاوازی ئایینیو عەشیرەتی، لاوازبوونی سیاسەت و دیپلۆماسی، دواکەوتوویی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوونەتە هۆکاری یەکلاییکەرەوەی نەگەیشتنی کورد بە مافی خۆی. راستە ئەم هۆکارانە هەرکام بۆ خۆیان دەوریان لە پێکهاتنی ئەم دۆخەدا هەبووە، بەڵام هۆکاری یەکلاییکەرەوە نین.

کوردستان خاوەن هەڵکەوتێکی جوغرافیاییو ژیۆپۆلتیکی تایبەتە و دەتوانین بڵێین لە هەستیارترین شوێنی جیهان واتا رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستیشدا لە گرینگترین شوێن واتا مێزۆپۆتامیا هەڵکەوتووە کە ئاخێزگەی شارستانییەت بووەو لە رووی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەوە کاریگەریی زۆری کردووەتە سەر هاوکێشەکانی جیهان، هەر بۆیە بە درێژایی مێژوو بەردەوام جێگای ململانێی سیاسی و ئابووری هێزە نێوخۆییو ناوچەییەکان بووە. بە تایبەت لە سەرەتای سەدەی ۱۹ەوە هێزێکی درەکی هاتووەتە ناو هاوکێشە سیاسییەکانی ئەم ناوچەیەو بە هاتنی ئەم هێزە بیانییە (کە تەنها بە شوێن بەرژەوەندیی سیاسی و ئابوورییەکانی خۆیدا بووە) رەوشی ناوچەکە گۆڕاو ئاکام و لێکەوتەی زۆری لێکەوتەوە کە یەکێ لەوانە ئەوە بوو کە ئیدی چارەنووسی دانیشتیوانی ناوچەکە لە دەست خۆیاندا نەماو گەلێك فاکتۆر و هاوکێشەی جۆراوجۆر تێکەڵی چارەنووسی ئەم نەتەوانە بوو.

کورد بە هۆی ئەوە کە خاوەن شوێن و هەڵکەوتێکی جوغرافیایی و ژیۆپۆلتیکی تایبەت لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا بوو، زۆرتر کەوتە ژێر کاریگەریی ئەم هاوکێشە نێونەتەوەییانەو





زلهێزەکان راستەوخۆ دەستیان لە چارەنووس و رەوشی دوارۆژی ئەم نەتەوەیە وەرداو بە کورتی چارەنووسی بوو بە قوربانی بەرژەوەندی ئەم زلهێزانە. بریتانیا، روسیاو فەڕەنسا تەنها بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی خۆیان و بێ رەچاوکردنی مافی گەلان، نەخشەی ناوچەکەیان گۆڕی و لە ئاکامی ئەم داڕێژتنە نوێیەدا، گەلێ لە نەتەوەکان گەیشتن بە مافی خۆیان و بێ ئەوەی کە هیچ هەوڵێکیان دابێ، بوون بە خاوەن دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان، بەڵام هەندێ نەتەوەی دیکەش لە ئاکامی ئەم داڕێژتنە نادادپەروەرانە و یەکلایەنەییەدا لە مافی دامەزرانی دەوڵەتی خۆیان بێبەشکران کە بەرچاوترینیان نەتەوەی کورد بوو کە سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەی کە گەورەپیاوان و رێبەرانی ئەم نەتەوەیە دایان، نەبوو، بە خاوەن دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی، بگرە بوو بە ژێردەستی نەتەوەو دەوڵەتەکانی دیکەو سەرەتاییترین مافەکانی لێ زەوت کرا. کورد بوو بە یەکەم قوربانی رەوتی نوێی نادادپەروەرانەی مێژوو، تەنیا لەبەر ئەوەی کە دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی لەگەڵ بەرژەوەندی ئەم زلهێزانە یەکی نەدەگرتەوە. واتا ئەگەر لە چوارچێوەی بەرژەوەندی زلهێزەکاندا ببایا، بێ ئەوەی کورد هیچ خەباتێکی بکردبایا یان تەنانەت ئاگاشی لێ نەبایا (وەك گەلی ئەفغانستان، سوریا، عێراق، بەحرەین، کووەیت و..) دەبوو بە خاوەن دەوڵەت و سەروەری، بەڵام چونکە بە پێچەوانە بوو، لە مافی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی بێبەش کراو هەرچەندە خەباتیشی کرد، بێئاکام بوو.

پاش ئەم قۆناخی دابەشکردنی ناوچە لە لایەن زلهێزەکان کە لە ئاکامیدا کورد پارچە پارچە بوو و کەوتە ژێردەست و دەسەڵاتی داگیرکەران کە هیچ رێزێکیان لە سەروەری و مافی ئەم گەلە بەشخوراوە نەدەگرت، کورد هیچ رێگایەکی بۆ نەمایەوە جگە لەوەی کە دەست بکات بە خەباتێکی رزگاریی دوور و درێژ و خوێناوی و گەلێ لە رۆڵە قارەمانەکانی ئەم نەتەوەیە لەم رێگا پیرۆزەدا گیانی خۆیان فیدا کرد، بەڵام بەداخەوە ئەمجارەش بەرژەوەندی زلهێزەکان سەری هەڵدایەوەو تێکەڵ بە زێدەخوازی دەوڵەتە داگیرکەرەکان بوو و لە ئاکامی ئەم هاوپەیمانییە دزێو و شەیتانییەدا راپەڕینە یەك لە دوای یەکەکانی کورد هەرەسیان هێنا[1] و پاش ئەوە، کوشتیانو

---

١- نموونە بەرچاوەکانی ئەم مژارە بریتین لە: هاندانی رەزاخان بۆ سەرکوت کردنی راپەڕینی سمکۆ لە لایەن بریتانیا، سەرکوتی راپەڕینی شێخ مەحموود و بومبباران کردنی سلێمانی بە دەستی بریتانیا، هاوکاری کردنی تورکیا لە لایەن دەوڵەتی فەڕەنسا بۆ تێکشکاندنی راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران، قوربانی کردنی کۆماری مهاباد و هاوکاری کردنی رێژیمی بەعس لە لایەن دەوڵەتی سۆڤیەت، خیانەت بە شۆڕشی ئەیلوول و هاندانی

سووتاندیان و کاولیان کرد. دەوڵەتە داگیرکەران، مانی خۆیان لە نەمانی ئەم گەلە بندەستەدا دەدیتو بۆ گەیشتن بەم ئامانجە دزێوەی خۆیان درێغیان لە هیچ کردەوەیەکی نامرۆڤانەو نائەخلاقی نەکرد. بۆنی نەوت و دەنگی barووت جیهانی ئازادی کوێر و کەڕ کردبوو.

کەوابوو کورد بۆ رزگاری خۆی دەبوایا چی کردبایا کە نەیکرد. کام نەتەوە بە قەد کورد بەهای بۆ ئازادی و رزگاریدا؟ کورد هەموو رێگایەکی تاقی کردەوە، دەستی دۆستی بۆ هەموو کەسێك درێژکرد، متمانەی بە گەلێك لایەن کرد، بەڵام خیانەتی پێکراو سەرەنجام بەم ئەنجامە گەیشت کە هیچ دۆستێکی نییە جگە لە شاخەکان.

لە یەکەم نەتەوەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست بووین کە خۆمان ناسی، داوای مافی خۆمان کردو بووین بە قوربانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ لە وڵاتی ئاگر، ئاسن وخوێندا. بە تاوانی ئەوەی کە دەمانەویست کورد بین و کوردبمێنین و لەسەر خاکی باوباپیرانمان بە ئازادی و سەربەرزی بژین، بەهایەکی گرانماندا، ئەوەندە گران کە تەنانەت مێژووش بە شەرمەوە نکوڵی لێدەکات، تەنانەت نەوادەکانی چەنگیز و هۆلاکۆش لە بەرامبەر ئەم هەموو دەستدرێژی و تاوانانە نەیاندەتوانی بێدەنگ بن[1].

لە سەدەی بیستەم، یەکەم نەتەوەبووین کە لە بەرامبەر بیروڕای بە رواڵەت ئازاد و مافی مرۆڤپەروەری رۆژئاوا! و بانگەشەکەرانی ئازادی و یەکسانی! بووین بە قوربانی چەکی کیمیایی دڕندەترین دوژمنانی ئاشتی و ئازادی و قوربانی ئاپارتایدی سیستماتیکی دەستپەروەردەکانی باوەپیارانی دیموکراسیو شارستانی.

پاش ئەو هەموو شەرمەزاری و سەرشۆڕییە بۆ مرۆڤایەتی هیوامان ئەوە بوو کە سەردەم، سەردەمی مافی مرۆڤە و لە سایەی راگەیاندنی ئازاد و دیموکراسیدا دەگەین بە مافی یەکسانی. سەرمان بەرز بوو، کە ئێستا کە بووین بە مەزنترین نەتەوەی بێدەوڵەت لە جیهاندا، دەبین بە خاوەن مافی کەمینەکان و دیوانی بێدادی نەتەوەیەکگرتووەکان رێز لە کەمینە بوونمان دەگرێ، بەڵام وڵاتەکەمان بوو بە تاقیگەی پێشێلکردنی بێ شەرمانەی مافی کەمینەکان. بە هاندانی باوەپیارانی ئازادی و دیموکراسی مەزنترین ئاوارەی جیهانیمان خولقاند، بەڵام

---

کوردانی عێراق لە لایەن ئەمەریکا و تەنیا هێشتنەوەیان لە بەرامبەر سەرکوتی دڕەندانەی سەدام و گرتن و تەسلیم کردنەوەی عەبدوڵڵا ئوجەلان بە تورکیا لە لایەن ئەمەریکا.

١- ئاماژە بە وەیە کە لە کاتی شۆڕشی ئەیلوول، دەوڵەتی مەغۆلستان تەنیا دەوڵەتێك بوو، کە داوای لە نەتەوە یەکگرتووەکان کرد دەوڵەتی عێراق بە هۆی سەرکوتی بێ بەزەییانەی کوردان شەرمەزار بکات.





نەماندەزانی ئاوارەی پلەدووین و رێگایەکی دوورودرێژمان لە بەرە بۆ ئەوەی کە تەنانەت وەك ئاوارە بناسرێین و مافی ئاوارەکانمان پێ رەوا ببینن.

چارەنووسی کورد مایەی عەزابی ویژدانی مرۆڤایەتییە لە بەرامبەر دادگای مێژوودا.

* * *

*"هەمیشە چەوسێنەرە کە شێوازی خەبات دیاری دەکات، نەك چەوساوە. ئەگەر زاڵم لە توندوتیژی کەڵك وەرگرێ، چەوساوەش هیچ رێگایەکی جگە لە دەستبردن بۆ توندوتیژی بۆ نامێنێ. سەبارەت بە ئێمە، خەباتی چەکداری و توندوتیژی تەنیا شێوازی رەوای بەرگری لە خۆ بووە. ئەگەر دەوڵەت بڕیاری دەدا، لە شێوەی ئاشتیخوازانە کەڵك وەرگرێت، کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقاش لە رێکاری ئاشتیخوازانە سوودی دەبرد. شەرمەزارکردنی توندوتیژی لە ئەستۆی ئێوەیە، نەك ئێمە. ئێمە دەتوانین ببوورین، بەڵام ناتوانین لەبیر بکەین." (نێلسۆن ماندێلا)*

"دانیل میتران" چالاکیی نێونەتەوەیی بواری مافی مرۆڤ، ساڵی ١٩٩٧ لە ئاخێوەرییەك لە پارلمانی فەڕەنسە ئاماژە بە خاڵێکی سەرنجڕاکێش دەکات: "کوردەکان تەنیا تیرۆر بووانێکن کە هەمیشە بە توندوتیژ ناودێرکراون". ئەم رستەیە دەرخەری راستییەکی تاڵ و تۆقێنەری بزووتنەوەی ئازادیخوازی نەتەوەی کوردە لەم دوو سەدەیەی دواییدایە. نەتەوەیەك کە بەردەوام حەقیقەتی بوونی لە تەواوی لایەن و رەهەندەکانییەوە نکۆڵی لێکراوە.

بە راستی کامین بەڵگە، پیشاندەری پەرەپێدانی توندوتیژی لە لایەن کوردانەوەیە، چالاکییە دیپلۆماسییەکانی شەریف پاشا لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس یان پیلان داڕشتنەکانی دەسەڵاتدارانی سەرەڕۆیی و ملهوڕی لە پەیماننامەی لۆزان، دڵنیایی هەمزەئاغای مەنگووڕ یان سوێند لە قورئان نووسراوەکانی ئەمیر نیزام، باوەڕی سمکۆ بە ئاشتی یان پیلانی بایەقۆشانی شەوپەرست لە بۆسەی شنۆدا، متمانەی جەعفەر ئاغای شکاك یان خیانەتی شەوانەی فەرمانڕەوایانی زۆربێژی، پەرۆشییەکانی سەید رەزا، شێخ سەعید و شێخ مەحموود یان دڕندایەتی ئەوانیتر، ئاشتیخوازی مەلا مستەفا یان پیلانی خۆتەقاندنەوەی نێردراوانی داگیرکەری، دیموکرات بوون و مرۆڤدۆستی پێشەوا قازی یان چێوی سێدارەکانی گۆڕەپانی "چوارچرا"؟

لە کامین لاپەڕەی مێژووی نووسراوی ئەم وڵاتە، کە هەمووشی دەسکرد و سازکراوی بیری خراپو داخراوی داگیرکەرانە، دەکرێ تیرۆر، پیلان یان خەیانەتێك بەم نەتەوەوە بلکێندرێ و

ببێت بەهۆکاری توندوتیژی و خوێنڕشتن و بوونی کوردیان لە نەبوونی ئەویتردا مانا کردبێت. کورد ئەگەرچی باشتر لە هەموو نەتەوەیەك مەرگ فام دەکاو دەیناسێ، بەڵام ئەوەی کە زیاتر لە هەموو شتێك لەم خاکەدا لە ئارادایە، ڕۆحی ژیانو بووژانەوە و خۆشەویستی و مرۆڤدۆستییە. باوەڕی بە بە دیموکراسی، یەکسانی و برایەتی، ئەوەندە لە جەستە و خوێنی ئەم نەتەوە چەوساوەو قڕکراوەدا، ڕەگی داکوتاوە کە هەزاران ئەنفال، هەڵەبجە، کۆچ، تەعریب و دوورخستنەوەی دیکە، ناتوانێت ڕەسەنایەتی مرۆڤ لە ناخیدا بکوژێت و بە کورد بسەلمێنێت کە لۆژیکی چەك، باڵاترینە.

* * *

هێندەی کە بە جەرگ و دوورەترسن
کەمتر لە بەیەك گەین ئەپرسن
کەس بۆ کەس نابێ چاو دەبەربێ
هەرکەس دەیەوێ زل و لەسەر بێ
لەم سەر ڕەقیەو دەماری زلیان
بێگانە دەبن سواری ملیان
کوردیش ببایە یەکدل و یەکدەست
دەستیان دەکەوت ژیانی سەربەست
پەیدا دەبو باوو گەورەیی‌و ژین
ناومان دەرئەکرد بە بیر و زانین.

**"ئەحمەدی خانی"**

لە ڕوانگەی مامۆستا ئەحمەدی خانی ـ بناغەدانەری بیری نەتەوەیی کورد ـ هۆی سەرەکی دیلی و ژێردەستی کوردەکان، هەروەك لە شیعری سەرەوەدا دەردەکەوێ، نکولی کردن لە یەکدی و قەبوولّ نەکردنی یەکترە. لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، ئەمە بە واتای بەردەوامبوونی کارەسات و خولقاندنی سەرەمڕی تراژیدیای کورد بووە. لەوکاتەوە کە تۆمی بێبڕوایی و خۆفرۆشی لە ڕێگەی ئارپاگ (وەزیر و فەرماندەی هێزەکانی ماد) هاتە چاندن، کەلێن و نەخۆشینێکی پیس داوێنی گرتووین کە لە دەروونەوە دەمانخوات‌و دەمانپرووکێنێتەوە، ئەویش بێبڕوایی‌و ناتەبایی، دەمارگرژی‌و خۆبە زلزانینێکی نادروست و نازانستییە کە کەسایەتی تاکی کوردی



تووشی گرژی‌و شێواندن کردووە. هەمیشە بە شوێن سێبەری دەسەڵاتێکدا گەڕاوین کە پەنامان بێ و حەشارمان بدات، لە حاڵێکدا کە خۆمان باشتر لە هەر کەس بیرۆکەی چەوتی ئەو باڵادەستەمان ناسیوەوە، ڕوومەتی ڕاستەقینەیمان بینیوە، کەچی بەوەشەوە شانازیمان بە "پاسەوانی مەتبەقی سوڵتان" بوون کردووە، لە هەرلا کە کوژرابێت، کورد کوژراوەو بە یەك تیر دوو ئامانجیان پێکاوە، لە بیرۆکەی ئەواندا کورد، کوردە، بەوتەی ژنەڕاڵە تورکەکان "بێچوە گورگ دەبێتە گورگ"و....

تاکەی دەبێ بەجێی شنەی ئازادی و ڕۆشنگەری ڕۆشنبیری کورد، بە زوڵمی دوژمنان بە خۆ بێن و هەبوونێکی جیاواز لە دیترانەوە فام بکەین. لە شەڕی سووردا ئەوان بە چەکی جۆراوجۆر سینگی پێشمەرگە و گەریلاکانمانی دەپێکاو بەندیخانەکان ژوانگەی هەمیشەیی‌و پەتی سێدارەش هاوڕێی ماڵئاواییمان بوو، بەڵام لە "شەڕی سپی"دا دوژمن کەسایەتی مرۆڤی کورد دەڕووخێنێ، هێماو نموونەو ڕێنوێنی تۆ و من لە ڕێگەی خۆدی کوردەوە دەخاتە ژێر تەوژم‌و زەبرو زەنگ‌و دەیخاتە ئەوپەڕی نەهامەتی و مردنەوە. شەڕێکی ناوخۆیی‌و براکوژییەکی بێ دەنگ دەست پێدەکات، ئەمە کوشتنێکی بەردەوامە، تیرۆری کەسایەتی، تیرۆرێکی ڕەش و پڕ مەترسییە. لە ترسی یەکدی، یەکتر دەشکێنین، کەسایەتی کەلاوەی مرۆڤی کورد هەموو هەوڵەکان دەخاتە قۆناخی ناتەبایی‌و بەربەرەکانیەوە، ڕەخنە دەکاتە ڕووخان‌و کۆمەڵگەیەکی مەند و پەشێو دەخولقێنێ. گەر لە شەڕی سوور بەرهەڵستی نەیاران بووین، لە گێژاوی شەڕی سپیدا یەکتر دەخۆین. لە شەڕی سوور دارێکمان دەبڕا، هەزاران دار باڵایان دەکرد، کانیاوێکیان بتۆنڕێژ دەکرد، سەدان ڕێژاو لە لوتکەوە دائەبارین، پێشەوامان دەچووە سەردار، سێدارەکان بێزوی ئازادییان دەکرد و دایکانی کورد لە ماڵاندا چیرۆکی ئەوین و ئازادییان بۆ کۆرپەکان دەگێڕایەوەو...

پەنجەی تاوان و لادەری بەرامبەر بە هەموومان ڕاکێشراوە، کەس متمانە بەکەس ناکات، هەموو قسە و باسێك لەلایەن ئەوانەوە ئاو دەخواتەوە، گشتمان ناپاکین، حاشا لە خیانەتی کەسمان ناکرێت، هەموو تاوانبارین، داغی سیخۆڕی دوژمن لە سەردڵی هەمووماندە، هەردووش سامالّ و خاوێن و چرۆین، بەڵام هەر وەك نیشتیمان، دابەشکراوو لەتلەتین، دڕکی ئاسنی ترس نەتەنیا چوار سنوور، بگرە هەزاران سنووری دەسکردی پێچاوە بە دەوروبەرماناو سێبەرەکانیش جێگای بڕوانین...؟!

* * *

خوێنەرانی بەڕێز، بە سەرهاتی وەرگێڕانی ئەم کتێبە خۆیشی تراژیدیایەکە، ساڵی ١٩٩٩ بوو، خوێندکاری زانکۆی تاران بووم، دوابەدوای گیرانی "ئاپۆ" و دەنگدانەوە جیهانییەکەی گەلێ لە خوێندکارانی تورك و فارس دەربارەی کێشەی کورد پرسیاریان لێمدەکرد و دەربارەی مێژووی کورد سەرچاوەیان دەویست، بەڵام سەرچاوەیەکی ئەوتۆ نەبوو پێیانبناسێنم، هەربۆیە کەوتمە بیری ئەوەی کتێبێکی پوخت لەم پەیوەندییەدا وەربگەڕێنمە سەر زمانی فارسی. ئەو کاتە وەزارەتی دەرەوەی ئێران کتێبخانەیەکی زۆر گەورەی هەبوو کە دەربارەی کوردیش کتێبی جۆراوجۆری بەتایبەت بە زمانی ئینگلیزی هەبوو، دوای گەڕان بە ناو کتێبخانەکەدا سەرەنجام کتێبی "تراژیدیای کورد"م دەستکەوت و دەستبەجێ دەستم کرد بە وەرگێڕانی و پاش یەك مانگ کاری بێوچان وەرگێرانەکەی تەواو بوو. پاشان کتێبەکەم بردە خزمەت مامۆستا ئیبراهیم یونسی کە یەکێ لە گەورەترین نووسەر و وەرگێڕەکانی ئێران بوو و بۆ خۆیشی کورد بوو، ئەویش زۆر پێیخۆش بوو و تەشویقی کردم بە زووترین کات چاپی بکەم.

لەوانەیە خوێنەرانی بەڕێز ئاگادار نەبن کە لە ئێران هەموو کتێبێك پێش لە چاپ و بڵاوبوونەوە پێویستی بە مۆڵەتی وەزارەتی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی (وەزارەتی کولتوور و پەروەردەی ئیسلامی) هەیە و وەرگرتنی ئەم مۆڵەتەش ٦ مانگ تا ٣ ساڵ دەخایەنێت، سەرەڕای ئەوەش کە تا ئێستا بە هەزاران کتێب مۆڵەتیان بۆ دەرنەچووە و ڕێگە بە چاپیان نەدراوە (بە تایبەت ئەو کتێبانە کە پەیوەندیان بە کێشەی کوردەوە هەیە). هەربۆیە منیش کتێبەکەم بۆ وەرگرتنی مۆڵەت تەسلیم بەو وەزارەتە کرد و چاوەڕوانی دەرچوونی مۆڵەت بووم بەڵام پاش تێپەڕبوونی نزیکەی یەك ساڵ هیچ دەنگوباسێك نەبوو، پرسیارم کرد وتیان کتێبەکەمان ناردووە بۆ "ئیدارەی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی" لە سنە بۆ وەرگرتنی بیروڕای ئەوان، لە "ئیدارەی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی" سنە پرسیارم کرد وتیان کتێبی وامان قەد بە دەست نەگەیشتووە، سەرەنجام بۆم دەرکەوت کتێبەکە لەو کەینوبەینەدا ون بووە، هەربۆیە سەرلەنوێ تەسلیمم کردەوە و بۆ خۆیشم بردم بۆ ئیدارەی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی لە سنە، ئەوانیش پاش مانگێك وەڵامیان بە وەزارەتی فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی لە تاران دایەوە کەوا کتێبەکە لە روانگەی ئەوانەوە کێشەی نییە و تەنها پێشنیاریان کردبوو چەند خاڵێکی سانسۆر بکرێت. نزیکەی یەك ساڵی دیکەی بەسەردا تێپەڕ بوو، بەڵام مۆلەتی بۆ دەرنەچوو و هەرچی پرسیاری هۆکارەکەیم لە کاربەدەستان دەکرد وەڵامێکی روونیان نەدەدایەوە، هەربۆیە وەك دوا چارە دەست بە داوینی وەزیری فەرهەنگ و ئیرشادی ئیسلامی ئەو کاتی ئێران (کە سەر بە کابینەی بەناو ریفورمخوازان بوو) بووم و لە نامەیەکدا





ئاماژەم بەوە کرد کە ئەم کتێبە هیچ خاڵێکی دژ بە کۆماری ئیسلامی تێدا نییە(خۆم پێشتر بەشی پەیوەندیدار بە کۆماری ئیسلامیم لە کتێبەکە سڕیبووەوە) و داوام لێکرد لە مەسەلەکە بکۆڵێتەوە و ئەویش پاش تێپەڕبوونی ٦ مانگی دیکە وەڵامیدایەوە کە کتێبەکە لە کۆبوونەوەی ٦٠٧ی ئەنجوومەنی کتێب خراوەتە بەرباس و بڕیاری ڕەتکردنەوەی دەرچووە. بەم شێوەیە پاش نزیکەی سێ ساڵ وەڵامی نەرێنیان دایەوە و نەمتوانی کتێبەکە بڵاو بکەمەوە.

چەند ساڵ تێپەڕ بوو تا ئەوە کە ساڵی ٢٠٠٤ برادەرێکی نزیك ئاگاداری کردمەوە لە شاخ خولێکی فێربوونی زاراوەی کورمانجی کراوەتەوە و پێشنیاری پێکردم لەم خولەدا بەشداری بکەم، منیش کە لە مێژبوو چاوەڕوانی دەرفەتێکی وەها بووم بە خۆشحالییەوە پێمنایە ناو ئەم ڕێگا پڕ مەترسییە. لە کۆمیتەی زمان و ئەدەبیات لە شاخ پێشوازییەکی زۆر باشیان لێکردین. ئێمە بە گشتی ٤٠ کەس بووین، ٣٣ کچ و ٧ کوڕ لە هەموو پارچەکانی کوردستان و تەنانەت کوردێکی وڵاتی گورجستان، تەنها من کوردی پارچەی لای ڕۆژهەڵات و سۆرانی زاراوە بووم. پاشان ئێمەیان دابەشکرد بە سەر دوو پۆلدا، ئەوانە کە قەد خوێندن و نووسینیان بە ئەلفەبێی لاتینی نەدەزانی کەوتنە پۆلی یەك و ئەوانەی کە تۆزی شارەزای ئەم ئەلفوبێیە بوون کەوتنە پۆلی دوو، منیش کەوتمە پۆلی دوو. دوو مامۆستای زۆر بەڕێزمان هەبوو، کوڕێك و کچێکی خەڵکی باکووری کورستان کە بەو پەڕی ڕێز و دڵسۆزییەوە پەروەردەیان بە ئێمە دەدا، بە تایبەت بە هۆی ئەوەی تەنها من لە نێویاندا سۆرانی زاراوە بووم، ئاوڕی زۆرتریان لە من دەدایەوە. پاش ٤٥ ڕۆژ ئەزموونیان لێمان گرت و دەرچووم.

لە ڕۆژانی کۆتایی خولەکە باسی ئەوەم بۆ مامۆستاکانمان کرد کە چەند کتێبێکم دەربارەی کورد کردووە بە کوردی و فارسی، کتێبی "تراژیدیای کورد"یشم پێبوو، یەکێ لە مامۆستاکانمان کە کچێکی خەڵکی جزیرەی باکووری کوردستان بە ناوی زۆزان بووو و بە راستی شارەزای زمانی کوردیش بوو پێشنیاری پێکردم کتێبەکە بکەم بە کورمانجی و وتی یارمەتیت دەدەم و هاوکات تایپیشی دەکەم. منیش سەرەتا دوودڵ بووم چونکە بە راستی لە خۆمڕا نەدەبینی بتوانم کارێکی وەها ئەنجام بدەم، ئەویش لەو ماوە کورتەدا، بەڵام سەرەنجام بڕیارمدا شانی لێبدەم، هەربۆیە بە هاوکاری خاتوون زۆزان دەستم کرد بە وەرگێڕانی و پاش ١٤ ڕۆژ کاری بێوچان تەواوم کرد، من ڕاستەوخۆ لە ئینگلیزی دەمکرد بە کرمانجی و مامۆستا زۆزانیش هەم لە سەر کۆمپیوتەر دەینووسی و هەمیش هەڵەکانمی سەرڕاست دەکردەوە.

بەسەرهاتی ئەو دوو مانگە و بە تايبەت وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ کرمانجی بەسەرهاتێکی دوورو درێژە کە ئێرە جێگای باسکردنی نییە، تەنها دەتوانم ئاماژەو بەوە بکەم کە دڵسۆزی و لە خۆبردوویی ئەو مامۆستا بەڕێزانە و ئەخلاقە شۆڕشگێڕانەکەیان وانەی هەتا هەتایی منن و قەد لە بیرم ناچێت، بە تايبەت تەحەمول و لە خۆبردوویی مامۆستا زۆزان لەگەڵ وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ زاراوەی کرمانجی.

بە کورتی چەند ساڵی دیکە تێپەڕ بوو تا ئەوە کە ساڵی ٢٠٠٧ ڕێمکەوتە باشووری کوردستان و دەستمکرد بە وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکان بۆ کوردی سۆرانی، لەوانە "تراژیدیای کورد". ئێستاش بە خۆشییەوە کتێبەکە پاش تێپەڕکردنی ئەم بەسەرهاتە پڕ تەنگوچەڵەمەیە و پاش تێپەڕبوونی نزیکەی ١٠ ساڵ نەفەوتاو و توانی بکەوێتە ناو کتێبخانەی کوردی سۆرانی و کوردی کرمانجی*.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە لە ڕۆژانی کۆتايی وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا کەوتمە بیری ئەوەی باسێك لە بارودۆخ و چارەنووسی کوردەکانی دەرەوەی زێدی باوباپیران واتا کوردەکانی سۆڤیەت، لوبنان، ئەفغانستان و پاکستان، ئۆردۆن، ئیسراییل و تەنانەت ئەفریقیاش لە کتێبەکەدا هەبێ، هەربۆیە کەوتمە هەوڵ و سەرەنجام دوو بەشی زۆر بەنرخەم دەربارەی کوردەکانی سۆڤیەت و لوبنان (کە تا ئێستا لە هیچ سەرچاوەیەکی کوردیدا نەمبینیوە) لە دوو کتێبی ئینگلیزیدا دەرهێنا و بە سەر ئەم کتێبەدا زیادم کرد کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەم بە سەرچاوەی تەواوی هەردوویان کردووە. زانیارییەکانی کوردەکانی ئەفغانستان و پاکستان، ئۆردۆن، ئیسراییل و "ئەفریقیا"شم لە گەلێ سەرچاوەی جۆراوجۆر، لەوانە کۆمەڵێك سایتی ئینتەرنێتی متمانەپێکراو کۆکردووەتەوە، هیوادارم بە سوود بێت.

**لەگەڵ ڕێزمدا**

**وريا ڕەحمانی**

Arbaba380@gmail.com

---

* ئەم کتێبە لە ژێر ناوی "تراژیدیا کوردان، راپۆرتەك ژ بۆ نەتەوەیین یەکبوویی" بە ئەلفوبێی عەرەبی لە لایەن وەزارەتی رۆشنبیری و بە ئەلفوبێی لاتینی لە لایەن دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی "ئاڤێستا" لە ئیستەمبوول بڵاو بووەتەوە.

# پێشەکی

## کێشەی کورد

لە دوایین ڕۆژەکانی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٩١، لە کۆڕەوێکی مەزندا کە ڕاستەوخۆ لە لایەن تەلەفزیۆنەکانی ڕۆژئاواوە بڵاوبووەوە، نزیکەی یەك میلیۆن و نیو کورد بەرەو ئێران و سنووری تورکیا ئاوارەبوون. ئەم کۆڕەوە کە ئەنجامی ترس و تۆقاندنی سەربازە تایبەتەکانی سەدام حوسێن بوو، کۆتایی بەو ڕاپەڕینە خۆڕزە هێنا کە کۆنترۆڵی کاتیی کوردستانی عێراقی دابوو بە کوردەکان.

لە دوای شەڕی کەنداو، شیعەکان کە ڕێك پتر لە نیوەی حەشیمەتی عێراق پێکدەهێنن و زۆرتر لە باشووری وڵات دەژین، ڕاپەڕین و کۆنترۆڵی شارە سەرەکییەکانی باشووری عێراقیان گرتەدەست. سەدام حوسێنیش کوتوپڕ و بە شێوازێکی دڕندانە کاردانەوەی نیشانداو لە ئەنجامدا مەترسی زاڵبوونی شیعەکان بە سەر عێراق یان گەیشتنیان بە دەسەڵات (بەگوێرەی ڕێژەی حەشیمەتی خۆیان) لەناوچوو. کوتومت بەم هۆیە بوو کە سەدام حوسێن بە یارمەتی ئەو گوشارەی کە عەرەبستانی سعوودی خستییە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەسەر دەسەڵات مایەوەو هەرچەند کە گاردی نەتەوەیی، واتا باسکی بەهێزی ڕژێمی عێراق هێشتا چالاك بوو، شەڕی زەمینی کۆتایی پێهات. بۆ عەرەبستانی سعوودی، بەهێزنەبوونی شیعەکان ـ کە خاڵی هاوبەشی زۆرتریان لەگەڵ ئێراندا هەیە تا حکوومەتی پاشایەتی وەهابی و زۆریش بە سنوورە مەترسی هەڵگرەکانی عەرەبستان نزیکن ـ گرینگ بوو. بەهەرحاڵ لە دوای ئەوە، لەسەر دەسەڵات مانەوەی کەمینەی سوننە کارانتی کرا. ئەم کەمینە گرنگە (کە لە سەدا ٢٢ی حەشیمەتی وڵات پێکدەهێنێ) لەو کاتەوە کە بریتانیا دەوڵەتی عێراقی پاش شەڕی یەکەمی جیهان دروستکرد، هەتا ئێستا لەسەر دەسەڵات بووە.

لە ٦ی ئادار، ڕاپەڕینێکی خۆڕز لە شارۆچکەی کوردنشین و گرینگی ڕانیە ڕوویدا کە تەنها چەند کیلۆمەتر لە سنووری ئێران دوورە. ئەمە لە حاڵێکدا بوو کە لە حوزەیرانی ١٩٩٠ بەو لاوە، ڕانیە هەروەك زۆرێك لە گوندەکانی کوردستان لە بن مەترسیی لەناوچووندا



بوو و دانیشتووەکانی بۆ ناوچە کۆنترۆڵکراوەکان گوێزرابوونەوە. لە هەمان ڕۆژدا کوردەکان بنکەی پۆلیس و سەربازخانەکانیان گرت و نوێنەرە مەحەلییەکانی حیزبی بەعسیان دەستبەسەر کردو بەگشتیی بارودۆخەکەیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان. ڕاپەڕین خێرا و بەتەواوی سەرکەوتوو بوو، کوشتە و بریندارێ زۆری نەبوو و وەك بڵێسەی ئاگر بڵاوبووەوە. لە ماوەی ٨ ڕۆژدا، لە ٦ی ئادار هەتا ١٤ی ئادار، شارە سەرەکییەکان، واتا هەولێر و سلێمانی یەك لە دوای یەك لە ژێر گوشاری قورسی خەڵکدا ئازاد کران. بزووتنەوە سیاسییەکانی کوردستان سەریان سوڕمابوو و جگە لە تەولبوون بەم شەپۆلی گڕوتینە نەتەوەییانە- کە نە پێشبینیان کردبوو و نە ئامادەکارییان بۆ کردبوو ـ هیچیتریان لە دەست نەدەهات. پاش هەندێك شەڕ، دهۆك-یش ئازاد کرا.

لە ١٤ی ئاداردا، پێشمەرگەکانی "بەرەی یەکگرتووی کوردستان" بڕیاریاندا کەرکوك بگرن. کەرکوك دووەمین شاری گرینگی وڵات بوو کە بۆ ماوەیەکی درێژ کوردەکان و دەوڵەتی عێراق لە سەری ناکۆك بوون. پاش ٤ ڕۆژ شەڕ، بەشێکی مەزن لە بنکە سەربازییەکان کەوتە دەستی ڕاپەڕیوان. دەوڵەتی عێراق بڕیاریدا هێزی هەوایی خۆی بەکاربهێنێ و لە ٢٢ی ئادار فڕۆکەیەکی جۆری su22ی عێراق بە دەستی هێزە هاوپەیمانەکان خرایە خوارەوە. ئەمە لەحاڵێکدا بوو، کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشتر ئاگاداری دابوو کە ئەوان بەکارهێنانی هێلیکۆپتێر لە لایەن دەوڵەتی عێراق بۆ دامرکاندنی ڕاپەڕین، پرۆتستۆ ناکەن، ئەو ڕاپەڕینەی کە سەرانسەری کوردستانی عێراقی گرتبووەوە.

دژە هێرشی زەمینیی هێزە تایبەتەکانی دەوڵەتی بەغداد لە ٢٧ی ئادار دەستی پێکردو لەبەر ئەوەی کە پێشمەرگەکان تەنها چەکی سووکیان لەدەستدا بوو، شارەکان بە خێرایی دیسان لە لایەن ڕێژیمی عێراقەوە گیرانەوەو دانیشتووەکانیان بە تایبەت لە دهۆك دڕندانە سەرکوت کران.

خەڵك لە زەبر و زەنگ و سەرکوتە بەرفراوانەکانی دەوڵەت تۆقیبوون و لە ترسی دووبارە بەکارهێنانەوەی چەکی کیمیایی لە لایەن ڕێژیمی عێراق (کە لە ساڵی ١٩٩٨دا بەکاری هێنابوو) بە کۆمەڵ بەرەو سنوورەکان هەڵاتن. بە پێی ڕاپۆرتی سەرچاوە جۆراوجۆرەکان، ١/٥ هەتا ٢ ملیۆن کەس هەوڵیاندا لە دەستی سەربازەکانی عێراق هەڵبێن. نزیکەی دوو لە سێی ئەمانە سنووری ئێرانیان تێپەڕاند و نزیکەی ٦٠٠ هەزار کەسی دیکە لە نزیکی سنووری تورکیا کۆبوونەوە. بەرزبوونەوەی پلەی سەرمای ناوچە لەو دوا ڕۆژانەی کۆتایی زستان،

بارودۆخەکەی زۆر خراپتر کردبوو. کوردەکان خەماویترین کاتەکانی مێژوویان- پاش سەرکوتو دوورخستنەوە بەرفراوانەکانی حکوومەتی تورکیا لە دەیەی ١٩٢٠و ١٩٣٠- تێپەڕ دەکرد.

بەهەرحاڵ لەوکاتەدا، سەرقاڵبوونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بریتانیای مەزن و فەڕەنسا بە شەڕی کەنداو، کوردەکانی بۆ ماوەیەکی درێژ خستبووە نێو گەرماوگەرمی رووداوە ناونەتەوەییەکان.

لە ٢ی نیسان لە ئەنجوومەنی ئاسایشی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، فەڕەنسا داوای دەستێوەردانی مرۆڤدۆستانەی لە کێشەکەدا کرد. بریتانیای مەزن بەخێرایی رەزامەندی خۆی لەگەڵ ئەم هەڵوێستەی فەڕەنسا دەربڕی. لە لایەکیترەوە لە ٤ی نیسان، سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دژایەتی خۆی لەگەڵ هەر چەشنە دەستێوەردانێکی سەربازی دەربڕی کە ئەگەری ئەوەی لێبکەوێتەوە ژیانی پڕبایەخی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بخاتە بن مەترسی.

لە ٥ی نیسان، ئەنجوومەنی ئاسایشی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەرکوتی هاووڵاتیانی مەدەنی شەرمەزار کرد و داوای لە دەوڵەتی بەغداد کرد ئاسانکاری پێویست بۆ رێکخراوە مرۆڤدۆستەکان بکات. لە هەمان رۆژدا لە ژێر گوشاری فەڕەنسا، بریتانیاو بە تایبەت تورکیا (کە نەیدەویست زۆرتر لەو نیو ملیۆن کوردە ئاوارەی کە لە وڵاتەکەیدا نیشتەجێبوون، ئاوارەی دیکە قبووڵ بکات) سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکان، رەزامەندی خۆی بۆ بەڕێوەبردنی ئۆپەراسیۆنێك بۆ گەیاندنی یارمەتی مرۆڤدۆستانە بە ئاوارەکان راگەیاند. یەکەم باری کەلوپەل لە ٧ی نیسان بە چەتر بۆ ئاوارەکان بەردرایەوە. لە ٨ی نیسان، ١٢ وڵات پێشنیاری دەوڵەتی بریتانیایان بۆ پێکهێنانی ناوچەیەکی ئارام بۆ کوردەکان لە ژێرچەتری پاراستنی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پەسەند کرد، بەڵام پێشنیارەکە لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە رەتکرایەوە. لە ١٠ی نیسان، واشنتۆن لەمەڕ بەڕێوەبردنی هەر چەشنە ئۆپەراسیۆنێکی هەوایی لە باکووری عێراق دەوڵەتی بەغدادی هۆشیار کردەوە. لە ١٦ی نیسان، سەرەنجام سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رەزامەندی خۆی لەگەڵ دەستێوەردانی مرۆڤدۆستانەی زەمینی لە خاکی عێراق دەربڕی.

لە ٢٠ی نیسان، یەکەم یەکینەی هێزەکانی ئەمریکا — کە یەکینەیەکی بچووکی هێزەکانی فەرەنسا و بەریتانیایان لەگەڵدا بوو- گەیشتنە شاری زاخۆ لە سەر سنووری ترکیا و هەرێمی دژە فڕینیان دروست کرد. ئەو کاتە هەڵمەتی هاوخەمی لە گەڵ نەتەوەی کورد پەرەی



سەند، بە تایبەت لە ئەوروپا و ئامریکای باکور، و تەنانەت لە تورکیاش هەڵمەتێکی مرۆڤدۆستانە و یارمەتی کۆکردنەوە بۆ کوردە ئاوارەکان بەڕێوەچوو.

خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە لە ماوەی ئەو ئاوارەییە دوور و درێژەی کوردەکاندا، هیچکام لە دەوڵەتانی عەرەب کاردانەوەیان نیشان نەدا و هیچیان دەرنەبڕی. بەهەرحاڵ لە ساڵی ١٩٢٠بەملاوە، بۆ یەکم جار مەسەلەی کورد بوو بە رۆژەڤی رێکخراوە فەرمییە نێونەتەوەییەکان و لە سەر داوای فەرانسا، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، بڕیارنامەی ٦٨٨ی پەسەند کرد کە تێیدا رێگەدرا بە دەستیوەردانی مرۆڤدۆستانە لەم کێشەیەدا.

لە ٢٤ی نیسان، پاش چەند رۆژ وتووێژ لە بەغداد، هێز و لایەنە کوردەکانی" بەرەی یەکگرتووی کوردستان" — کە دوو لە سەرەکیترین کەسایەتییەکانی جەلال تالەبانی، سەرۆکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و مەسعود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون- دەربارەی کوردستانی عێراق گەیشتنە رێکەوتنێکی سەرەکی لەگەڵ دەوڵەتی بەغداد. ئەم وەرچەرخانە گەورەیە بەرهەمی بوونی هێزە هاوپەیمانەکان لە هەرێمی ئەمن لە باکووری عێراق و سەر سنووری تورکیا بوو. ئەم رێکەوتنە سەرەکییە دەربارەی مافی ئۆتۆنۆمی لە سەر بنەمای رێکەوتننامەی (١١ی ئاداری)١٩٧٠لەگەڵ سەدام حوسەین پێکهات کە یەکێ لە کەندوکۆسپەکانی سەر ریگای جێبەجێبوونی، رەوشی شاری پڕ لە نەوتی کەرکوك بوو. ئەم کەندو کۆسپە بووە هۆی دەستپێکردنەوەی شەڕ و نسکۆی بزووتنەوەی کورد لە ١٩٧٥ کە بارزانی رێبەری بوو.

راوەستانی وتووویژەکان لە هاوینی ١٩٩١، مەترسییەکی گەورە بوو لە سەر رەوتی وتووێژەکان. هێزە هاوپەیمانەکان خۆیان لە بابەتەکە دەدزییەوە، بەمەش بزووتنەوەی کورد نەیتوانی بگات بە ئامانجی سەرەکی خۆی کە بریتی بوو لە ئۆتۆنۆمییەك کە کوردەکان تەنازولی زۆریان تێدا کردبوو و بێ گارانتی نێونەتەوەیی هیچ کەڵکێکی نەبوو.

کوردەکان تایبەتمەندییەکی دوو لایەنەیان هەیە: ئەوان لە درێژایی ٦٥ ساڵی رابردوودا یەکێك لەو کەمینانە بوونە کە هەرە زۆر سەرکوتکراون و یەکێك لە پڕ حەشیمەتترین کەمینەکانی جیهانن (٢٠ تا ٢٥ ملیۆن) کە بە شێوازێکی نایەکدەست لە نێوان ئێران، تورکیا، عێراق و سوریا بڵاوبوونەتەوە[١]. لە سەردەمی ئیمپراتۆری عوسمانی و ئێران و کۆتایی

١- ئیمە لێرە باسی کۆمەڵگای بچووکی کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران ناکەین کە سەرزەوی خۆیان نییە و لانیکەم لە نێوان ٣یان ٤ وڵاتدا دابەشکراون.

شەڕی یەکەمی جیهانی، کوردەکان لە نێوان ٣و تەنانەت ٤ وڵاتدا دابەشبوون. بریتانیای مەزن پاش بەدەستهێنانی ئینتیدابی عێراق لە دوای هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی، دوو ویلایەتی (پارێزگا) عەرەبنشینی بەغداد و بەسرەی لکاند بە موسڵەوە، لەبەرئەوەی دەیزانی سەرچاوەی نەوتی تێدایە، بەڵام رەوشی شاری موسڵ تا ساڵی ١٩٢٥ یەکلایی نەکرابووەوە. زۆربەی حەشیمەتی موسڵ ئەو کاتە کورد بوون[٢].

پەیماننامەی "سیڤەر" کە پێشبینی دامەزرانی حکوومەتێکی کوردی لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیای ئێستای کردبوو پاش بە دەسەڵات گەیشتنی مستەفا کەماڵ ـ کە بە شێوازێکی بەرچاو لە لایەن بەشێك لە فەرمانده سەربازییەکانی ئیمپراتۆری عوسمانییەوە پشتیوانی لێدەکرا ـ هەڵوەشێندرایەوە. ئەم شەڕی سەربەخۆییە نەتەوەییەی تورکەکان کە زۆرتر لە دژی یۆنان و هەروەها سەرپەرشتی فەڕەنسا بە سەر سیسیلیا و حکوومەتی ئەرمەنستان (١٩١٨ـ١٩٢٠) بوو، بە شێوازێکی بەرفراوان لە ژێر ناوی یەکرێزی ئیسلامیدا لە لایەن کوردانەوە پشتیوانی لێدەکرا. لە لایەکی دیکەوە بەشێك لە بژاردە تورکەکان ناسیۆنالیزمی مۆدێڕنیان بە شێوازە ئەوروپاییەکەی قبووڵ کردبوو. پاش واژۆکردنی پەیماننامەی لۆزان (١٩٣٠) کە دەسەڵاتی تەواوی ئاتاتورکی زەمانەت کرد، کەمال ئاتاتورك ٣٥ ساڵ پێش جەمال عەبدولناسر، تاسەی بەڕێوەبردنی سیاسەتێکی دەکرد کە ئاوێتەیەك بوو لە دەمارگرژی ناسیۆنالیستی و نۆژەنگەرایی (وەك هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت، دامەزراندنی سیستەمی حقووقی عورفی، بە لاتینیکردنی ئەلف و بێ‌و...).

بەهەرحاڵ لە ساڵی ١٩٢٤ زمانی کوردی قەدەغەکرا، کەوابوو لەو کاتەوە ئیدی لە تورکیا هیچ کەس نەیدەتوانی نەبێت بە تورك و کوردەکان بە زۆر ناسنامەی راستەقینەی خۆیان لە دەستدا. کورد تەنها یەکێك لە کەمینە ئایینییە بێ وڵاتەکان لە قەڵەم دەدران کە مافەکانیان لە پەیماننامەی "سیڤەر"دا بە فەرمی ناسرا بوو. بەم حاڵەش ئەم پەیماننامەیە تەنها چەند هەزار ئەرمەنی لەخۆدەگرت کە پاش دوورخستنەوەو کۆمەڵکوژییەکانی ١٩١٥ــ١٩١٦ی حەشیمەتی بە تەواوی ئەرمەنی ئەنادۆڵی، هێشتا لە تورکیا مابوونەوە. یۆنانییەکانیش پاش قەڵاچۆ بوون لە پنتوس (١٩١٥-١٩١٦) و ئاڵوگۆڕی بەرفراوانی حەشیمەت (گۆڕینەوەی ١٢٥ هەزار یۆنانی لەگەڵ ٦٥٠ هەزار تورکدا) کە لە دوای هەرەسهێنانی یۆنان ئەنجامدرا، ببوون بەکەمینە و سەرەنجام حەشیمەتێکی کەم لە یەهوودییە ئیسپانییەکان کە لە دوای ئەوەی لە

---

٢- لە ساڵی ١٩٢٣، ٥٨٪ی حەشیمەتی موسڵ کورد، ٢٣٪عەرەب و ١٩٪ سەر بە نەتەوەکانی دیکە بوون.



ئیسپانیا دەرکران، پێشوازی و هەڵسوکەوتی باشیان لەگەڵدا کرا. بەهەرحاڵ سەرەڕای ئەم راستییە کە کوردەکان لە ساڵی ١٩١٨ تا ١٩٢٣ وەك هاوپەیمانی وەفاداری هاوئایینە تورکەکانیان کاریان کردبوو، پەیماننامەی لۆزان هیچ کەمینەیەکی دیکەی بە فەرمی نەناسی و ئەم مافەی نەدا بە کوردەکان.

ئەڵبەتە بە پێچەوانەی ئەرمەنییەکان و عەرەبەکانی سوریا، هەندێك لە بژاردە کوردەکانی ئەو سەردەمە رووی خۆشیان بە هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی کە دەیتوانی کەش و هەوایەکی ئازادتر بێنێتە ئاراوە، نیشان نەدا. بەم حاڵەش، کەمالیستەکان بە خێرایی ئەو بۆشاییەی دەسەڵاتیان پڕکردەوە کە لە دوای سوڵتان بەجێمابوو و بەم جۆرە، ئامانجەکانی یۆنان، فەڕەنسا و ئەرمەنستانیان پووچەڵکردەوە کە دەیانەویست لەو هەلومەرجە کەڵکی خراپ وەربگرن.

لیژنەیەك لە نوێنەرانی کورد بە مەبەستی خستنەڕووی داخوازییەکانی کوردەکان لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریسدا بەشدارییان کرد، بەڵام بەهەرحاڵ نەبوونی هیچ چەشنە رۆشنکردنەوەیەك لە لایەن رۆشنبیران و هەروەها بەرەوپاشچوونی کۆمەڵگای کورد رێگری لە پەرەسەندنی ئایدیۆلۆژی ناسیۆنالیستی هاوردە لە ئەوروپا کردو سەرەڕای بوونی چەند گرووپی نوێخوازی دەستڕۆیشتوو لەو کاتەدا، هەتا دەیەی ١٩٤٠ کە رێکخراوە کوردییە سیاسییەکان بەرەبەرە دامەزران، ئەوەندە رێکخراوی سیاسی لە ئارادا نەبوو. تەنانەت پاش ئەوەش رێکخراوە سیاسییە کوردییەکان لە ژێر کاریگەریی ناکۆکی عەشیرەتیدا بوون کە گوزارشتی لە دابەشبوونی کۆمەڵگای کورد دەکردو ململانێی تاکەکەسی زۆر لە نێوان رێبەرەکانیدا هەبوو، کە زۆرجار سەر بە بنەماڵە ئایینییەکان یان سەرۆك عەشیرەتەکان بوون.

کێشمەکێشی نێوان مارکسیستەکان و غەیرە مارکسیستەکان لە دەیەی ١٩٦٠و ١٩٧٠و بەر لەوە لە شەڕی دەسەڵات سەرچاوەی گرتبوو کە ناوەڕۆکی عەشیرەتیی- بەڵام بە شێوازێکی نوێ- هەبوو. راپەڕینگەلێکی مەزن لە سەدەی ١٩ بە رێبەرایەتی سەرۆکە نەریتییە ئایینی یان غەیرە ئایینییەکان لە دڵی ئیمپراتۆری عوسمانی سەریهەڵدا کە زۆرتر دژی سیاسەتی ناوەندپارێزی رۆژ لە دوای رۆژی دەرباری عوسمانی بوون. راپەڕینەکانی دەیەی ١٩٢٠و ١٩٣٠ کە لە تورکیا، عێراق و لە پێوەرێکی بچووکتردا لە ئێران روویاندا، ئاوێتەیەك بوون لە کۆنەپارێزی مەحەلی (لە تورکیا)، راپەڕینە ناوچەییەکان (لە هەر سێ وڵات) و وڵاتپارێزی مەحەلی کە لەگەڵ داخوازییە نەتەوەییەکاندا گرێدرا بوون. لەو کاتەدا هیچ پرۆگرام، رێکخراو یان کادرێکی سیاسی لە ئارادا نەبوو و هەروەها هیچ هاوکارییەکی بەرفراوان و زاڵبوونێك بەسەر ململانێیە بنەماڵەیی، عەشیرەتی یان ناوچەییەکاندا بەدی نەدەکرا. لە عێراق کە

حەشیمەتی کوردەکان بە پێی ڕێژەی حەشیمەتی وڵات زۆرتر بوو[٣]، ڕەوشەکە باشتر بوو، لەبەرئەوەی بۆ سوننەکانی سەر دەسەڵات نەدەلوا وەکو فارسەکان و تورکەکان بەسەر گۆڕەپانی سیاسەتدا زاڵ بن. لانیکەم تا نیوەی دووەمی دەیەی ١٩٧٠ بارودۆخەکە وا بوو.

لەتلەتبوونی جوغرافیایی ناوچە کوردنشینەکان هاوکات لەگەڵ دەستڕانەگەیشتنی کوردەکان بە دەریای ئازاد، وای کردووە کە ڕێکخراوە سیاسییە کوردییەکان بەردەوام بە شوێن هاوپەیمانی بیانیدا بن، بە تایبەت لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ بەملاوە. یەکێتی سۆڤیەتی جاران، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل بە مەبەستی لاوازکردنی ڕکابەرە سیاسییەکانی خۆیان، بە شێوازی ناڕاستەوخۆ کوردیان وەك کارت بەکارهێناوە. تەنانەت لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠، ئێران پشتیوانی لە کوردەکانی عێراق دەکرد، بەڵام هیچکام لەم دەوڵەتانە بە هۆی ترس لە دەنگدانەوەی ناوخۆیی یان بڵاوبوونەوەی کێشەکە، ئەوەندە یارمەتی کوردەکانیان نەدا تا بتوانن سەرکەوتنێکی سیاسیی ڕاستەقینە بەدەست بهێنن. زێدەباری ئەمە لە دەیەی ١٩٦٠ەوە بارودۆخەکە ئاڵۆزتر بوو، لەبەرئەوەی هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە ئەم دەوڵەتانە کوردەکانی دانیشتووی وڵاتی خۆیانیان سەرکوت دەکرد یارمەتییان بە بزووتنەوەی کوردەکانی وڵاتانی دراوسێی نەیاری خۆیان دەداو لە هەمانکاتیشدا ناکۆکییەکانی نێوان ڕێکخراوە سیاسییە کوردییە جۆراوجۆرەکانیان گەرموگۆڕتر دەکرد. بۆ نموونە پەیوەندی نێوان ڕێکخراوە کوردە سیاسییەکانی ئێران و عێراق لە دەیەی ١٩٦٠و پێش ئەوە وەها بوو.

لە ماوەی شەڕی ئێران و عێراقدا (١٩٨٠ـ١٩٨٨) هەرکام لەم دوو حکوومەتە یارمەتی سەربازییان بە بزووتنەوەی کوردی نەیاری ڕکابەرەکەی خۆیان دەدا. کوردەکانی ئێران لە لایەن عێراقەوە پشتیوانی دەکران و کوردەکانی عێراقیش لە لایەن ئێرانەوە (و هەندێك جار لە لایەن سوریاوە کە ڕکابەری حیزبی بەعسی عێراق بوو). بەهەرحاڵ بۆ دەوڵەتەکان ئاسانترە کە لەم جۆرە کایە تێکچڕژاوانەدا بیبەنەوەو ئەمە بۆ بزووتنەوەی کورد مەترسیدارە، چونکە لەوانەیە لەناکاو لەم جۆرە یارمەتییانە بێبەش بێت.

بە زاڵبوونی تورك و فارس و عەرەبەکان، کوردەکان لەگەڵ سیاسەتگەلێك ڕووبەڕووبوونەتەوە کە لە حکوومەتێك بۆ حکوومەتێکی دیکە جیاوازە. تورکیا ڕووی هێناوەتە لەناوبردنی زۆر سیستماتیکی کولتووری کورد، لە حاڵێکدا کە ئێران لەم ڕەوتەدا سیاسەتێکی

٣- کورد نزیکەی ٢٥٪ی حەشیمەتی عێراق، ٢٠ ٪ی حەشیمەتی تورکیا و ١٥٪ی حەشیمەتی ئێران پێکدەهێنن.





تا ڕادەیەك کراوەتری گرتووەتە بەرو کوردەکان هەرچەندە کە ناتوانن لە قوتابخانەکاندا بە زمانی دایکی خۆیان بخوێنن، بەڵام لانیکەم دەوڵەت هەندێك پرۆگرامی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی بە زمانی کوردی بڵاو دەکاتەوە. لە لایەکیترەوە دەوڵەتی عێراقیش زمانی کوردی وەك دووەمین زمانی فەرمی وڵات قبووڵ کردووەو بنەواشەی خودموختاری ئەوانی بە مەرجێك کە لەژێر کۆنترۆڵی تەواوی حیزبی بەعسدا بێت، بەفەرمی ناسیوە. دوورخستنەوە بەکۆمەڵەکان و نیشتەجێکردنە زۆرەملێیەکانی کوردەکان لە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی توندی دەوڵەت کە لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٢٠و ١٩٣٠و نیوەی دەیەی ١٩٨٠ لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە جێبەجێ دەکرا، ئێستاش بەپێی حوکمێك کە لە ساڵی ١٩٩١ دەرکراوە، دیسان بەڕێوە دەچێت. ئەم میتۆدانە پاش ساڵی ١٩٧٥و بە شێوازێکی سیستماتیکتر لە کۆتایی دەیەی ١٩٨٠ لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە کەڵکی لێوەردەگیرا. هێشتا هەموو ئاکام و لێکەوتەکانی کۆڕەوە بە کۆمەڵەکانی ئادارو نیسانی ١٩٩١ (کە جگە لەوانەی لە ئۆردوگاکانی سەر سنووری تورکیا نیشتەجێبوون، نزیکەی یەك ملیۆن کەسی ئاوارەی ئێران کرد) بۆ ئێمە دیار نییە.

هیچکام لە دەوڵەتەکانی تورکیا، ئێران و عێراق لە ناوچە کوردنشینەکاندا سەرمایەگوزاری پیشەسازییان نەکردووە. هەژاری ژێرخایەنی ناوچە کوردنشینەکان لەبەرچاوە. سیستەمی پەروەردە و تەندروستی زۆر ناکارامەیەو لە هەر سێ وڵات کۆچی بەرفراوانی کوردەکان بۆ شارە گەورەکانی دەرەوەی کوردستان بەدی دەکرێت[٤]. لە ساڵی ١٩٢٤ هەتا ئەم چەند ساڵەی دوایی، سیاسەتی فەرمی دەوڵەتی تورکیا لەسەر بنەمای حاشاکردنی تەواو لە هەبوونی کەمینەی کورد بوو. کۆمەڵناسی تورك، ئیسماعیل بێشکچی بە تاوانی نووسینی شتانێك لەمەڕ هەبوونی کوردەکان و لایەنگری لەوان، پتر لە یەك دەیە لە ژیانی خۆی لە زیندانەکانی تورکیا تێپەرکردووە. لەگەڵ ئەمەشدا، کورد کەمینەیەکی ئیتنیکین کە بە زمانێك دەپەیڤن کە لەگەڵ بنەماڵەی زمانە تورکییەکان بە تەواوی نامۆیە. پێشتر کورد بە" تورکی شاخی" ناسرابوون بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا، لانیکەم لە چاپەمەنییدا وەك کورد ناویان لێ دەبردرێت. تەنانەت لە کاتی شەڕی کەنداو، سەرۆك کۆماری تورکیا (ئۆزال) سەبارەت بە لابردنی قەدەغەبوونی قسەکردن بە زمانی کوردی کە لە ساڵی ١٩٨٣ لە کۆماری تورکیا بەڕێوە دەچوو، لێدوانی دا[٥].

٤- هەروەها نیو ملیۆن کرێکاری کورد لە ئەورووپای ڕۆژئاوا، لەوانە ٤٠٠ هەزار لە ئەڵمانیا و٦٠ هەزار لە فەڕەنسا هەیە.

٥- یاسای ساڵی ١٩٨٣ دەیگوت زمانی زگماکی هاووڵاتیانی تورکیا، تورکییە.

ئەمە لەحاڵێکدایە کە کوردەکانی تورکیا خاوەن هیچ مافێکی دیکە نین، نە مافی خوێندن بە زمانی زگماکی لە قوتابخانەکان و نە مافی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب و بڵاڤۆك بە زمانی کوردی. لە ساڵی ١٩٩٠یشەوە جگە لەوەی کە هێزێکی سەربازی یەکجار زۆر بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ چالاکیی گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان (p. k. k) دراوە بە بەڕێوەبەرانی پارێزگا کوردنشینەکان[6]، هەر بەم بیانووەش کۆمەڵێ خەڵك لە مافی خۆیان بێبەشکراون. دەوڵەتی تورکیا هەوڵ دەدات سیاسەتی بە تورککردنی کوردەکان جێبەجێ بکات، بەڵام تا ئێستا سەرکەوتوو نەبووە. ئەم سیاسەتە هەندێك جار بەپشتبەستن بە سەرۆکە نەریتییەکانو هەندێك جار بە بەپشتبەستن بە مرۆڤە شارنشینەکان بەڕێوە دەچێت. ئەم سیاسەتە لە لایەکەوە بووەتە هۆی دواکەوتوویی ناوچە کوردنشینەکان-کە تەنانەت قوتابخانەکانیشی هێشتا لە پێوانە جیهانییەکان زۆر دوورن و بە زۆر زمانی تورکی تێیدا فێر دەکرێت- و لە لایەکیترەوە بووەتە هۆی پێکهاتنی شەپۆلی هۆشیاری و ئاگایی نەتەوەیی لە نێو کوردەکان لە دەیەی ١٩٦٠و بە تایبەت دەیەی ١٩٧٠ بەم لاوە. لەگەڵ ئەمەشدا وادیارە لە شارە گەورەکانی ئەنادۆڵی رۆژئاواو ناوەڕاست و لە ناو ئەو کوردانەی کە پتر لە یەك سەدەیە شارنشین بوونە و منداڵەکانیان لە قوتابخانەدا بە زمانی تورکی دەخوێنن، ئەم سیاسەتی تاواندنەوە سەرکەوتوو بووە. لەم ناوچانەدا کوردبوون بە حاڵەتێکی فۆلکلۆریك تەنەزولی کردووە. هەندێك لە کوردەکانیش هەرچەند کە ژمارەیان زۆر نییە، بوونەتە نوێنەری پارلمانو تەنانەت وەزیر.

بەناوبانگترین و سەرکەوتووترین چیرۆکنووسی تورکیا، یاشار کەماڵ-ە کە کوردە، بەڵام بەرهەمەکانی تەنها بە زمانی تورکی نووسیوە و بۆ رەگ و بنەچەی خۆی ناگەڕێتەوە[7].

---

٦- ئیلازیغ، بینگول، تونچلی، وان، دیاربەکر، ماردین، سیرت، هەکاری، باتمان و شەرناخ.

٧- یاشار کەماڵ هەرچەند کە بە هۆی قەدەغەبوونی زمانی کوردی لە تورکیا، بەرهەمەکانی خۆی بە زمانی تورکی نووسیوە، بەڵام بە نیسبەت کێشەی کورد لە تورکیا کەمتەرخەم نەبووە. بۆ نموونە یاشار کەماڵ بە هۆی نووسینی وتارێك لە رۆژنامەی *ئیشپیگلی* ئەڵمانیا لە ژێرناوی "ئاسمانی تورکیا و هەورە رەشەکان" لە لایەن دادگایەکی تورکیاوە حوکمی ١٥ساڵ زیندانی هەڵواسراوی لەسەر دراوە. یاشار کەماڵ لەو وتارەدا داکۆکی لە مافی کوردەکان کردبوو و هاوکات وڵاتانی رۆژئاوای بە شەریکی سووچی تورکیا لە قەڵەم دابوو، لەبەرئەوە کە چەك بە دەوڵەتی تورکیا دەفرۆشن تا کوردان سەرکوت بکات. (وەرگێڕ)



نموونەی پێچەوانەی یاشار کەماڵ، دەرهێنەرێکی کورد یەلماز گونایە[8]. هەرچەند کە فیلمەکانی "گونای" بە زمانی تورکی دروستکراون، بەڵام "گونای" زۆر پێ لەسەر ناسنامەی ئێتنیکی خۆی دادەگرت و ببوو بە یەکێك لە خەباتکارانی چالاکیی مافی کورد[9].

هەتا ئەم دواییانە، زۆرترین ترسی دەسەڵاتدارانی تورك لە زمانی کوردی لەو مەبەستە سیاسیانە بوو، کە دەیتوانی لە بەکارهێنانی زمانی کوردی بکەوێتەوەو درەنگ یان زوو یەکرێزیی ناسیۆنالیزمی توندئاژۆی تورك تێکبدات کە مستەفا کەماڵ پێناسەی کردبوو. ئەڵبەتە پێچەوانەی ئەمەش وەڕاست دەگەڕێت، لەبەرئەوەی ژمارەیەك لە ئازادیخوازانی تورك پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە مەسەلەی کورد لە تورکیا لە حاشاکردن لە مافی کولتووری ئەوان سەرچاوە دەگرێ کە لە ساڵی ١٩٢٤ەوە سیاسەتی فەرمی حکوومەتی تورکیا بووە. بەهەرحاڵ، لە ناوچە کوردنشینەکاندا کە ئێستا حاڵەتی نائاسایی لەوێ جێگیر بووەو یاسا سەرکوتکەرە تایبەتەکان حکوومەت دەکا، زەحمەتە کە هیچ چەشنە چاکسازییەکی بنەڕەتی ئەنجام بدرێت.

لە ساڵی ١٩٨٤ەوە لە تورکیا گرینگی دراوە بە بەرەنگاریکردنەوەو گوشارخستنە سەر pkk و هێرشی هەمیشەی سوپای تورکیا بۆ سەر بنکەکانی ئەوان لە نێو خاکی عێراقدا. بەهەرحاڵ هەڵوێستی دەوڵەتی تورکیا لانیکەم هەتا ئەو جێگایەی کە پەیوەندی بە هەبوونی فەرمیی کورد لە تورکیادا هەیە، نەرمتر بووە.

لە شوباتی ١٩٨٨ دەوڵەتی تورکیا پرۆتستۆ کرا، کاتێك کە راپۆرتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئاماژەی بە کەمینەی کورد لە وڵاتی تورکیا کردو بە هۆی پێشێلکردنی مافی مرۆڤی ئەم کەمینەیە رەخنەی لە تورکیا گرت. راپۆرتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بارودۆخەکە وەها وەسف دەکات: "لەگەڵ ئەوەشدا کە ملیۆنها کوردی تورکیا بە تەواوی بەرەو ژیانی کۆمەڵایەتی سیاسی و ئابووری نەتەوەیی راکێشراون، سیاسەتی تاواندنەوەی دەوڵەتی تورکیا بووتە هۆی قەدەغەبوونی بڵاوبوونەوەی هەر چەشنە کتێب، رۆژنامە و بڵاڤۆکی دیکە بە زمانی کوردی. هەموو چەشنە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ کولتوور و مێژووی کورد قەدەغەکراوە و چالاکان و تەنانەت خوێنەرانی دەستگیر دەکرێن. کەند و

---

٨- یەلماز گونای بە هۆی بەرهەمهێنانی فیلمی" یول" (رێگا) خەڵاتی مەزنی فستیڤاڵی "کان"ی ساڵی ١٩٨٢ی پێبەخشرا. هەموو فیلمەکانی گونای لە تورکیا قەدەغە.

٩- یەلماز گونای بە تاوانی دروستکردنی چەن فیلمێك حوکمی ٣٠ساڵ زیندان و ٥ ساڵ دوورخستنەوەی لەسەردرا. پاشان لە فەڕەنسا بوو بە پەنابەر و ساڵی ١٩٨٤هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد. (وەرگێڕ)

کۆسپە کولتووریەکان و دواکەوتوویی ئابووریی باشووری رۆژهەڵات کە کوردەکان لەوێ زۆرینەن، بۆتە هۆی پێکهاتنی شەپۆلێك نارەزایەتی گشتیی لە نێو کوردەکان و تەنانەت ئەو تورکانەی کە لە رەگوریشەدا کوردن".

لەم ساڵانەی دواییدا، چاپەمەنی تورکیا رەخنەگرتن لە بیرورا توندئاژۆکانی کەمالیستەکانیان دەستپێکردووە. لە نیسانی ۱۹۹۱ ئوزال بە رۆژنامەی "تورکمان"، چاپی تورکیای وت لەوانەیە بکرێت چارەسەرێك بۆ کێشەی کورد لە تورکیا لەسەر بنەمای مۆدێلی "باسك" بدۆزێتەوە. بەهەرحاڵ هەرچەند کە مەبەستی ئۆزال ئەوە بوو کە ئەو خودموختارییەی کە دەوڵەتی ئیسپانیا داویەتی بە "باسك"ەکان و گرووپەکانی دیکە، دەوڵەتی تورکیاش بیدا بە کوردەکان، بەڵام تەنانەت بۆ هەڵوەشاندنەوەی قەدەغەبوونی قسەکردن بە زمانی کوردی لە کۆماری تورکیا رێگایەکی دوورو درێژ لە پێشە.

لە عێراق ناکۆکی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق لە سێ دەیەی رابردوودا بە یەك شێواز دووپاتبووەتەوە واتا هەر کاتێك کە حکوومەتی بەغداد لاواز دەبوو دەستی دەکرد بە وتووێژ لەگەڵ بزووتنەوەی کورد کە خوازیاری خودموختاری کوردستان لە چوارچێوەی عێراقدا بوو. ئەم وتووێژانە دەرفەتێکی گونجاویان بۆ دەوڵەتی عێراق دەرەخساند تا خۆی بۆ هێرشکردنە سەر کوردەکان بەهێز بکات. باشترین نموونەی ئەم تەوەرە، رێککەوتننامەی ۱۱ی ئاداری ۱۹۷۰ بوو کە خودموختاری کوردستانی بە فەرمی قبووڵ دەکرد، بەڵام پاش ئەوە رەوتی وتووێژەکان بە هۆی ناکۆکی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق لەسەر دیاریکردنی سنووری ناوچە دەوڵەمەندە خاوەن نەوتەکان و مەسەلەی دابەشکردنی داهاتەکان، رادەوەستا.

لە ئێران رێگا بۆ تاواندنەوەی کولتووریی کوردەکان و ئازەرییەکان لەگەڵ فارسەکان کراوەیە. هەم کوردەکانو هەم ئازەرییەکان قەت مافی خوێندن بە زمانی زگماکییان لە قوتابخانەکاندا نەبووە. ئەمرۆ بارودۆخەکە هیوابەخش نییە. لە ساڵی ۱۹۲۵ تا ۱۹۳۰، سیاسەتی بێبەزەییانەی رەزاخان لەسەر بنەمای نیشتەجێکردنی زۆرەملێی ئەو عەشیرەتانە بوو کە هەمیشە لە کۆنترۆڵی حکوومەتی ناوەندی هەڵدەهاتن. لەو کاتەدا راپەرینێك بە رێبەرایەتی سمکۆ بەردەوام لە ئارادا بوو، کە بە کوژرانی سمکۆ لە سەروبەندی وتووێژەکاندا کۆتایی پێهات.

لە دوای دامەرزانی کۆماری مەهاباد لە پاش شەری دووهەمی جیهان، رووداوەکان خێراتر قەومان. ئەو بارودۆخەی کە بووە هۆی دامەزرانی ئەم کۆمارە کورت تەمەنە (کە



پاش یەك ساڵ بە دەستی سوپای ئێران تێکشکا) لە دوو هۆکار سەرچاوەی دەگرت: یەکەم نەبوونی کۆنترۆڵی هەمیشەیی دەوڵەتی ئێران بە سەر باکووری وڵات و دووەم بڕیاری یەکێتی سۆڤیەت بۆ پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆی لە ئێران لە رێگای دامەزراندنی کۆماری ئازەربایجان و کوردستان. بەهەرحاڵ کۆماری مەهاباد سەرەرای ناسەقامگیریی بارودۆخەکە، پاشان خۆی بە تەواوی بە تایبەتمەندییەکانی خودموختاری تەیار کردو لە تەنیشت هێزی سەربازی، سەربەخۆیی هەمە لایەنەی خۆی لە دەوڵەتی تاران پەرەپێدا، بەڵام پاش زاڵبوونی دووبارەی بریتانیا بەسەر ئێراندا، شا توانی کۆنترۆڵی دووبارەی ناوچەکە بگرێتەوە دەستی خۆی. هەموو رێبەرانی کۆمار لە سێدارەدران. مستەفا بارزانیش کە سەرۆکی هێزە چەکدارەکان بوو، پاش رووخانی کۆمار توانی رێگای یەکێتی سۆڤیەت بگرێتەبەر. بارزانی لەوێ بوو بە پەنابەر و هەتا کاتی رووخانی سیستەمی پاشایەتی هاشمی لە عێراق (لە ساڵی ۱۹۵۸) لەوێ مایەوە.

لە ساڵی ۱۹٤٦، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (PDKI) قەدەغەکراو چالاکانی حیزب تووشی ئەشکەنجەو زیندان بوون. حیزبی دیموکراتی کوردستان ئەو کاتە دۆستی حیزبی شیوعی ئێران (حیزبی توودە) بوو و پشتیوانی لە دەوڵەتی نەتەوەییو دژی ئیمپریالیستی موسەدق ـ کە لە ساڵی ۱۹۵۳ بە پیلانی CIAی ئەمریکا رووخا ـ دەکرد. حیزبی دیموکرات جارێکی دیکە بە توندی سەرکوتکرا. لە دەیەی ۱۹٦۰ کۆمەڵێك سەرهەڵدانی جووتکاری لە ناوچە کوردنشینەکاندا روویدا کە تێکشکان. پاشان پێوەندی نێوان حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق ئاڵۆز بوو.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە رێبەرایەتی عەبدولرەحمان قاسملۆ لە خۆپیشاندانی خەڵك دژی رێژیمی پاشایەتی (کە بووە هۆی رووخانی ئەو رێژیمە) لە شارەکان، بە تایبەت مەهاباد، بەشداری کرد. لە ساڵی ۱۹۷۹ نیمچە خودموختارییەك لە کوردستانی ئێران پێکهات بەڵام رێژیمی ئایەتوڵڵا خومەینی لەناوی برد. لە ماوەی شەری ئێران و عێراق، پاسدارەکان (پارێزگارانی شۆرش) بە مەبەستی گرتنەوەی کوردستان، دەستیان کرد بە چەند زنجیرە ئۆپەراسیۆنی جەنگی. هێزە کوردەکان-یش چەند ساڵ دواتر لە وڵاتی عێراق، لەوبەری سنووری ئێران مۆڵگەیاندا. بە کورتی وتووێژە فەرمییەکانی عەبدولرەحمان قاسملۆ و نوێنەرانی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی بە کوژرانی عەبدولرەحمان قاسملۆ کۆتاییان پێهات، هەروەها کە ئیسماعیل ئاغای سمکۆ ۳۰ ساڵ پێش لەوە کوژرابوو.

له سوریا کوردەکان لەسەر خاکێکی یەکپارچە ناژین و هیچ مافێکی کولتوورییان نییە. بارودۆخی کوردەکان بە تایبەت لە دەیەی ١٩٦٠ کە حەشیمەتێکی زۆری کورد بە مەبەستی ئاسانکاری بۆ نیشتەجێبوونی عەرەبەکان گوێزرانەوە، دژوار بوو، بەڵام پاش بە دەسەڵات گەیشتنی حافیز ئەسەد و عەلەوییەکان- کە تەنها ١٥ لە سەدی حەشیمەتی گشتیی وڵاتی سوریا پێکدەهێنن- بارودۆخەکە گۆڕا، هەرچەند کە مافێکی کولتووری بەرچاو نەدرا بە کوردەکان. بەهەرحاڵ بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە خودی عەلەوییەکان، کەمینەن، پێویستیان بە پشتیوانی کەمینەکانی دیکە هەیە و لەبەرئەوەی کە هەندێك لە کوردەکان هاوکاری دەوڵەت دەکەن، رەوشی ژمارەیەك لە کوردەکان لە چاو سەردەمی پێش بە دەسەڵات گەیشتنی حافیز ئەسەد باشتر بووە. ئەڵبەتە ئەم بارودۆخە ناڕوونە دەتوانێت بە رووخانی رێژیمی ئێستای سوریا، بە خێرایی خراپتر بێت.

دەتوانین مێژووی هاوچەرخی کورد بە چەند قۆناخ دابەش بکەین:

## قۆناخی یەکەم: ١٩٢٠ ـ ١٩٤٥

بەدرێژایی ئەم قۆناخە واتا کاتێك کە کوردەکان لە نێوان ٣و تەنانەت ٤ وڵاتدا دابەش بوون، حکوومەتە سەربەخۆکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست واتا ئێران، تورکیاو عێراق بێ هیچ کەندو کۆسپێك، سیاسەتی تاواندنەوەی کوردیان گرتەبەرو بەشێکی زۆری حەشیمەتی کوردیان لە ناوچە گەمارۆدراوەکاندا نیشتەجێ کرد. لەو شوێنانەش کە سەرچاوەیەکیان هەبوو (بۆ نموونە سەرچاوەی نەوتی کەرکوك) کورد هیچ سوودێکیان لێوەرنەگرت.

لەم قۆناخەدا، راپەڕینە مەزنەکانی کوردەکان لە تورکیا (١٩٢٥، ١٩٣٠، ١٩٣٦-١٩٣٧) لەو پەڕی بێبەزەیەتیدا سەرکوت کران. لە دوای ئەوە شەپۆلی دوورخستنەوەی بەرفراوانی کوردەکان دەستی پێکردو تەنانەت هاتنی بیانییەکان بۆ ناوچە کوردنشینەکان هەتا ساڵی ١٩٦٥ قەدەغەکرا. لە هەمانکاتدا بە فەرمی حاشا لە بوونی کورد لە تورکیا کرا، حاشاکردن لەم راستییە لە سەدەی ٢٠ بێوێنە بوو و لە پێناو حاشاکردن لە کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لە ساڵی ١٩١٥دابوو. لە عێراقیش کە بارودۆخی ویلایەتی موسڵ هەتا ساڵی ١٩٢٥ دیار نەبوو، راپەڕینگەلێکی یەك لە دوای یەك لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٠ــ١٩٤٣ بە رێبەرایەتی شێخ مەحموودو پاشان مەلا مستەفای بارزانی روویدا[١٠].

١٠- جگە لە راپەڕینی ١٩٣٠ لە تورکیا و راپەڕینی سمکۆ لە ئێران، هەموو راپەڕینەکانی کوردەکان لە ساڵەکانی ١٩٢٥-١٩٣٠ لەلایەن رێبەرە ئایینییەکانەوە رێبەرایەتی دەکران.



## قۆناخی دووەم: ١٩٤٥ـ ١٩٥٨

پێکهاتنی کۆماری مەهاباد (١٩٤٥) سەرەڕای کورتبوونی تەمەنەکەی ـ کە نزیکەی ساڵێکی خایاند ـ قۆناخێکی گرینگ بوو. لەم سەردەمەدا، هەرچەند کە رێبەرە نەریتییەکان‌و کەسایەتییە مەزنەکان هێشتا دەوری سەرەکییان دەگێڕا، بەڵام ئەم قۆناخە، قۆناخی سەرهەڵدانی حیزبەکان، پێکهاتنی رێکخراوە حکومییەکان و یەکەم ئەزموونی بەڕێوەبردنی سیستەمێکی سیاسی بە میتۆدگەلی نۆژەن بوو. لەم سەردەمەدا، سەرکوت و زەبر و زەنگێکی توند لە تورکیا، ئێران و عێراق زاڵ بوو.

## قۆناخی سێیەم: ١٩٥٨ـ١٩٧٥

ئەم قۆناخە، ئەنجامی کودتای ژەنەراڵ قاسم بوو، کە کۆتایی بە دەسەڵاتی بنەماڵەی هاشمی لە عێراق هێنا، بەڵام ناسینی عێراق وەك نیشتیمانی دوو نەتەوەی کورد و عەرەب لە لایەن قاسمەوە، شتێکی بە تەواوی نوێ بوو. لەم قۆناخەدا واتا کاتێ کە پاش چەند ساڵ زەبروزەنگی تەواو، مەسەلەی کورد لە عێراق دیسان کەوتەوە روو، جیهان گۆڕانکاری زۆری بە خۆیەوە بینیبوو: سەردەمی کۆلۆنیالیزم و نیمچە کۆلۆنیالیزم، بەرەبەرە تەواو ببوو، وڵاتانی ئاسیایی سەربەخۆ ببوون، لە باکووری ئەفریقیاش تەنها ئەلجەزایر نەگەیشتبوو بە سەربەخۆیی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شەڕی رزگاری ئەم وڵاتە خاوەن پشتیوانی ناونەتەوەیی بوو، وڵاتی "غینا"ش سەربەخۆیی خۆی بە دەستهێنابوو. بەشی هەرە زۆری ئەفریقیا لە سەردەمی نێوان راگەیاندنی کۆماری عێراق (١٩٥٨) و دەستپێکردنی شەڕی سەربازی لە لایەن ژەنەراڵ بارزانی (١٩٦١) بۆ بەدەستهێنانی خودموختاری کوردستان لە چوارچێوەی وڵاتی عێراق، گەیشتە سەربەخۆیی.

بەهەرحاڵ تەنها ئەو نەتەوانە کە کۆلۆنیای ئەورووپاییەکان بوون توانیان بگەن بە مافی خودموختاری خۆیان[١١]. کوردەکان نەکەوتنە نێوان ئەم پۆلێنبەندییە، ئەوان بوون بە هاووڵاتییانی دەوڵەتگەلێکی سەرەڕۆو مەترسیدار کە هیچ رێزێکیان لە کەمینەکان نەدەگرت.

١١- جگە لە ئەریتریا (کۆلۆنیای پێشووتری ئیتالیا) کە ساڵی ١٩٦٥ وەك وڵاتیکی خودموختار لکاندرا بە ئیتیوپیاوە. ١٠ساڵ دواتر ئیمپراتۆری ئیتیوپی، ئەرتریای وەك چواردەیەمین پارێزگای ئیمپراتۆرییەکەی راگەیاند، کەوابوو کێشمەکێش لە نێوانیاندا دەستی پێکرد کە لەم ساڵانەی دواییدا بە رووخانی حکوومەتی "مەنچستۆ" و ئیمزاکرانی رێککەوتننامەی نوێی رێژیم کە لە ئەنجامیدا ریفراندۆمی خودموختاری لە ئیریتیرە پێش ساڵی ١٩٩٣ بەرێوە چوو، کۆتایی پێهات.

لەم قۆناخەدا بزووتنەوەی کورد لە عێراق دیسان بوژایەوە. لەم قۆناخەدا کە لەگەڵ شەڕی سارد هاوکات بوو و یەکێتی سۆڤیەت، "دوکترینی ترومەن" [12]ی نەتەنها لە یۆنانستان (لە درێژایی شەڕی نێوخۆی یۆنان و تورکیا لە مەڕ بانگەشەکانی سۆڤیەت سەبارەت بە قارس و ئارداهانا) بەڵکو لە ئێرانیش (لە ڕێگای دامەرزاندنی کۆمارەکانی مەهاباد و ئازەربایجان) بلۆك کرد. لەم کاتەدا کوردەکانی عێراق و ئێران بە شێوازێکی بەرچاو لایەنگری سۆڤیەت بوون و لە ڕاستیدا یەکێتی سۆڤیەت دۆست و لایەنگری زۆری لە ناو کوردەکاندا هەبوو.

لە ساڵەکانی ١٩٦١ تا ١٩٧٥ کوردەکانی عێراق هاوپەیمانیگەلێکی سیاسیی تاڵیان تەجروبە کرد. یەکێتی سۆڤیەت کە هاوپەیمانیی لەگەڵ حکوومەتی عێراقی بە باشتر دەزانی، پەیماننامەی دۆستایەتیو هاوکاری لەگەڵ ڕێژیمی سەدام حوسێن لە ساڵی ١٩٧٢ ئیمزا کردو دەستی لە بزووتنەوەی بارزانی هەڵگرت. لە دوای ئەوە پاش بڕیاری کیسینجر (وەزیری دەرەوەی ئەمریکا)و نیکسۆن(سەرۆك کۆماری ئەمریکا) یارمەتییە نهێنییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا، جێگای یارمەتییەکانی سۆڤیەتیان گرتەوە لەبەرئەوەی کە هاوپەیمانی عێراق و سۆڤیەت، ویلایەتە یەکگرتووەکانی نیگەران کردبوو. دەوڵەتی ئیسرائیلیش زۆرتر پێی خۆش بوو لە ڕێگای یارمەتی نهێنی بە کوردەکان، دەوڵەتی عەرەبی عێراق ـ کە ئەندامی بەرەی نەیارانی ئیسرائیل بوو ـ لاوازتر بکات. دەوڵەتی ئێرانیش کە بارزانی بە پێچەوانەی ئەو متمانەی کە بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی هەبوو، لێی دڵنیا نەبوو، لە ساڵی ١٩٧٥ یارمەتیدانی بارزانی پچڕاند. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئێران لە دوای ئەو پوانانەی کە عێراق بە ئێرانیدا، ئیدی پشتیوانیان لە کوردەکانی عێراق نەکرد.

ئەم نیوەی دووەمی دەیەی ١٩٧٠یە قۆناخێکی پڕ لە شکست و ڕاوەستان بۆ کوردەکان بوو.

### قۆناخی چوارەم: ١٩٧٥ـ١٩٩٣

ڕووخانی حکوومەتی شا لە ساڵی ١٩٧٩و شەڕی ئێران و عێراق لە ساڵی ١٩٨٠ وای کرد کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بتوانێ دیسان سەر هەڵبداتەوە. حیزبی دیموکرات توانی

١٢- ترومەن، سەرۆك کوماری ئەمەریکا لە لێدوانێکدا لە کۆنگرێس لە ساڵی ١٩٤٧ خوازیاری ئەوە بوو، کە یارمەتی بەو وڵاتانە بدرێ کە لەگەڵ مەترسی کۆمۆنیزم بەرەوڕوون (بەتایبەت تورکیا و یۆنان). ئەو سیاسەتە کە بۆ پێشگرتن لە کۆمۆنیزم لە لایەن ترومەن و سەرۆك کۆمارانی دواتری ئەمەریکا گیرایە بەر بە "دوکتورینی ترومەن" ناسراوە. (وەرگێڕ)



بۆ سەردەمێکی تا ڕادەیەك کورت، نیمچە خودموختارییەك پێکبهێنێت. ئەو کاتە دەوڵەتەکانی ئێران و عێراق بۆ لاوازکردنی دەوڵەتە ڕکابەرەکانیان، کەڵکیان لە کوردەکانی نەیاری ڕکابەرەکانیان وەردەگرت: بزووتنەوەی کوردەکانی عێراق هەندێك جار لە لایەن ئێرانو هەندێك جار لە لایەن سوریاوە پشتیوانی لێدەکرا.

ئەمە لە حاڵێکدایە کە ژیانەوەی بزووتنەوەی کورد لە تورکیا لە دەیەی ١٩٧٠و مەسەلەی دامەزرانی بنکەکانی pkk لە باکووری عێراق لە ساڵی ١٩٨٣، دەوڵەتی تورکیای بە توندی نیگەران کردووە. Pkk بەهێزترین بزووتنەوەی کوردە و تەنها بزووتنەوەیەکە کە (بەشێوازێکی بەرفراوان) دەستی داوەتە خەباتی چەکداری. ئەمە لە حاڵێکدایە کە بوونی بنکەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە باکووری عێراق، بووتە هۆی هێرشی زۆری سوپای تورکیا بۆ عێراق لە ساڵی ١٩٨٣وە.

کوتوپڕ لە دوای شەڕی ئێران و عێراق، ڕێژیمی سەدام حوسێن هەوڵیدا لە ڕێگای بێبەشکردنی خەباتکارانی کورد لە سەرجەم مافە گشتییەکانیان، دایانپلۆسێنێ. ساڵی ١٩٨٨ بە هۆی هێرشی بەرفراوانی ڕژیمی عێراق بۆ کوردستان و بەکارهێنانی چەکی کیمیاییو بۆمبارانی مەزن، ساڵێکی لەبیرنەکراوە. شەهیدبوونی خەڵکی شارۆچکەی هەڵەبجە لە ڕێگای ئەو وێنانەی کە ئێزگە تەلەفزیۆنییەکانی ڕۆژئاوا نیشانیان دا، بڵاوبووەوە هەرچەند کە دەوڵەتی عێراق حاشای لە بەکارهێنانی گازی کیمیایی کردو دەوڵەتی تورکیاش کە ژمارەیەك ئاوارەی قبووڵ کردبوو، ڕایگەیاند نەیتوانیوە هیچ ئاسەوارێك لە چەکی کیمایی بدۆزێتەوە. دەوڵەتی عێراق هەروەها نەیدەهێشت ڕێکخراوە ناونەتەوەییەکان سەردانی شوێنەکە بکەن.

لە ساڵی ١٩٨٨و سەرەتای ساڵی ١٩٨٩، ڕێژیمی سەدام حوسێن درێژەی بە سیاسەتی دە ساڵەی خۆیدا واتا ڕووخاندن و کاولکردنی گوندە شاخاوییەکانی کوردەکان و نیشتەجێکردنی زۆرەملێی سیستماتیکی ئەوان لە ناوچە گەمارۆدراوەکاندا. هەڵسەنگاندنی زۆر لەمەڕ ژمارەی گوندە کاولکراوەکان ئەنجامدراوە. بەگوێرەی ڕاپۆرتی سەرچاوە فەرمییەکانی ئەمریکا لە نێوان ٥ هەزار گوند، ١٢٠٠یان کاول و چۆڵکراون، بەڵام بەپێی سەرچاوە کوردییەکان ٣٥٠٠ گوند کاولو چۆڵکراون. بەهەرحاڵ ڕووداوەکانی نیسان و ئاداری ١٩٩١ ئاکام و لێکەوتەکانی ئەم سیاسەتە درێژخایەنەیان زۆر گرینگ کرد لەبەرئەوەی مەزنترین ئاوارەیی کوردەکان لە مێژووداو گرینگترین ئاوارەیی جیهانیی (پاش کۆڕەوی خەڵکی ئەفغانستان بەرەو پاکستان لە ساڵی ١٩٨٠ کە زۆر هێورترو لە پێوەرێکی بچووکتردا ڕوویدا) خولقاند.

کەوابوو لە کۆتایی چەند دەیە خەباتی کوردەکان لە پێناو ئامانجەکانیان کە هەم بە شێوەی توندوتیژانەو هەم بە شێوەی ئاشتیخوازانە ئەنجامدراوە، ئەمڕۆ کارنامەکە چۆنە؟

لە دوای کوژرانی قاسملۆ، بارودۆخەکە لە ئێران هەر وەك خۆیەتی. حکوومەتی ئێران باڵی سەربازی بەسەر کوردستاندا کێشاوە.

لە عێراقیش بە پێی راپۆرتی کۆمیسارىای بەرزی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کاروباری پەنابەران، بۆمبارانی سوپای عێراق لە تشرینی دووەمی ١٩٩١ بووەتە هۆی زیادبوونی ٢٠٠ هەزار ئاوارەی کورد بەسەر ٥٠ هەزار ئاوارەی پێشووتردا.

لە تورکیا کە لەم ساڵانەی دواییدا چاپەمەنییەکان باسی کورد دەکەن، یەکەم دەسپێشخەری ئۆزال هەڵوەشاندنەوەی یاسای ساڵی ١٩٨٣ بوو کە قسەکردن بە زمانی کوردی لە کۆماری تورکیا قەدەغە دەکرد. زێدەباری ئەمە لە ماوەی شەڕی کەنداو، سەرۆك کۆماری تورکیا ئاماژەی بە بوونی ١٢ ملیۆن کورد لە تورکیا (واتا ٢٠٪ حەشیمەتی گشتیی تورکیا) کرد. ئەم لێدوانە لەوانەیە بە هۆی هەلومەرجی سیاسی ئەوکاتە بووبێ. لە ٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٩١ سەرۆك وەزیرانی نوێی تورکیا، سلێمان دەمیرل، جەختی لەسەر دەسپێشخەرییەکەی ئۆزال سەبارەت بە قبووڵکردنی راستیی مەسەلەی کورد کرد. لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا هیچ دەسپێشخەرییەکی دیکە بە نیسبەت مافی کولتووری راستەقینەی کوردەکان لە تورکیا نەکراوە.

بەهەرحاڵ پاش ئەم ٣٠ ساڵەی دواییە کە بۆ کوردەکان زۆر گران تەواو بووە (جگە لەو نەهامەتیانە کە لە دەیەی ١٩٢٠و ١٩٣٠ بەسەریاندا هاتووە) ئەمڕۆ ئەنجامەکە تا رادەیەك ناتەواوە. ئایا کورد بەو بارودۆخە ژیۆپۆلەتیکەی کە هەیانە دەتوانن هیوادار بن کە بەزۆری چەك بگەنە ئامانجەکانیان؟ ئەم بابەتە لە دەرەوەی باسی ئێمەیە، بەڵام لە جیهانی ئێستادا کە شەڕی سارد کۆتایی پێهاتووە و لەگەڵ ئەوەشدا هاندانی هەستیارییەکانی هاوپەیمانییەکان کۆتایی پێهاتووە، ئێستا هەلێکی باش رەخساوە بۆ ئەوەی وڵاتە دیموکراتەکان لەگەڵ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پێناو گۆڕینی یاسا نێونەتەوەییەکان هەوڵ بدەن. شکستی رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٦٢ بۆ ئەوەی کە نەیهێشت ئیتیۆپیا لەگەڵ ئیمپراتۆری خودموختاری ئەرتریا (کە خودی نەتەوە یەکگرتووەکان دروستی کردبوو) ببێت بە یەك، بوو بە سەرچاوەی کۆمەڵێك ناکۆکی کە ٣ ساڵ درێژەی کێشا. ئێستا بەدڵنیاییەوە کاتی ئەوە هاتووە کە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەرکی ئەوە وەئەستۆ بگرێت کە رێز لە رێکەوتننامەکانی نێوان حکوومەتەکان و کەمینەکان بگیردرێت. بۆ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان زۆر پێویستە کە لە شوێنێکدا کە سەرەتاییترین ستانداردەکانی مافی کەمینەکان- کە یاسا نێونەتەوەییەکان پەسەندیان کردووە- پێشێل دەکرێ، بە شوێن مافی کەمینەکاندا بچێت.

لەنێوان ئەو کەمینانەی کە بە درێژایی ٦٥ ساڵی رابردوو تووشی سەرکوت و زەبروزەنگ بوونە، بێگومان کورد یەك لەوانەن کە زۆرترین بەردیل و بەهایان داوە.

دەستەواژەی جوگرافیایی "کوردستان" کە قەد بە حکوومەت نەناسراوە لە سەردەمی ئیمپراتۆری عوسمانی بۆ دیاریکردنی سەرزەوییەك کە پارێزگای دیاربەکر لە تورکیای ئەمڕۆی لەخۆدەگرت، بەکاردەهێنرا. هەروەها لە ئێران، پارێزگایەك کە پێی دەڵێن "کوردستان" تەنیا یەکێ لەو ناوچانەیە کە لە باری ئیتنیکییەوە کوردنشینە.

لە رووی زۆربەی حەشیمەتەوە، کوردەکان لە چوار ڕێگایەکدا دەژین کە لە نێوان ئێران، تورکیاو عێراقدا هەڵکەوتووە. ئەگەر چاوێك لە هەلومەرجی جوغرافیایی کوردستان بکەین، دەبینین کە ئەم وڵاتە بەرزە شاخاوییە بەدرێژایی سەدەکان لە هێرشە یەك لە دوای یەکەکاندا وەك پەناگا کەڵکی لێوەرگیراوە. چیاکانی تووروس (لە تورکیای ئەمڕۆ) و زاگرۆس (لە ئێران) بەئاراستەی باکووری رۆژئاوا- باشووری رۆژهەڵات، بەرزاییگەلێکن کە بەسەر میزۆپۆتامیادا زاڵن و هەرچی بەرەو باکوور و باکووری رۆژهەڵات بچینە پێش، بەرزایی زۆرتر دەبێ. لەم شوێنەدا ئەرمەنییەکان بەر لەوەی لە کۆتایی دوو سەدەی رابردوو بە دەستی کوردەکان دەربکرێن، نیشتەجێ بوون.

لە دوای کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لەساڵی ١٩١٥، وشکارۆی ئەرمەنستان بوو بە سەرەکیترین ناوچەی کوردنشین. ئەو نیشتمانە کە کورد تێیدا نیشتەجێیە و لە باشوور لەگەڵ عەرەبەکان و لە رۆژهەڵات لەگەڵ ئازەرییەکان دەراوسێیە بە شێوازێکی روون دیاریکراوەو لە ناوچەکانی دیکە جودا کراوەتەوە، واتا کوردەکان لە ناوچە شاخاوییەکاندا دەژین بەڵام لە ناوچەکانی باکووری رۆژئاوا حەشیمەتی تورك و کورد تێکەڵە. لە باری جوغرافیاییەوە ئاو و هەوای کوردستان زۆر قاڕەییەو بە تایبەت زستانەکانی سەختن.

بەسەرهاتی گەشتیاران پێمان دەڵێت کوردستان لە سەدەی رابردوودا زۆر دارستان بووە. کوردستان خاوەن کانزای مس، ئاسن، بەردە خەڵووز و لیگینیتە، بەڵام سەروەتی سەرەکیی کوردستان نەوتە کە لە موسڵ، کەرکوك و خانەقین (لە عێراق) دا هەیە.

لەبەرئەوەی کە هیچکام لە وڵاتانی پێوەندیدار، کوردەکانی خۆیان سەرژمێری نەکردووە، تەنها ئامارگەلی مەزەندەکراو لە بەردەستدایە کە زۆر لە یەك جیاوازن. حەشیمەتی کورد لە





تورکیا ١٢ ملیۆن، لە عێراق ٤ میلیۆن، لە ئێران پتر لە ٧ میلیۆنو لە سوریا نزیکەی یەك ملیۆن کەس هەڵدەسەنگێندرێت. بەگشتیی حەشیمەتی ٢٥ ملیۆنی کوردەکان لە نێوان ئەم چوار وڵاتەدا بڵاوە. بە پێچەوانەی وێنای گشتی، تەنها بەشێکی بچووك لە حەشیمەتی کورد گەڕیدەرە و زۆرتر جووتیار و لە پێوەرێکی بچووکتردا ئاژەڵدارن. لە شاخەکاندا ئابوورییەکی سەرەتایی هەیە، بەڵام لە دەشتەکانی سوریا و عێراق، بەرهەمێکی باشی خەڵەوخەرمان هەیە. تەماکۆ (توتن) بەرهەمی لە مێژینەی ئێران، عێراق و باشووری رۆژهەڵاتی تورکیایە، بەڵام بەرهەمهێنانی لۆکە لە تورکیا شتێکی نوێیە.

بەگشتیی لە ناوچە شاخاوییەکاندا کە هێشتا میتۆدە کۆنەکانی کشتوکاڵ بەکاردەبردرێت، جووتیاران خاوەن زەوین، بەڵام لە دەشتەکاندا، زەمینداره گەورەکان خاوەن زەوین و وەرزێڕە کرێکارەکان و لە ئاستێکی بەرزتردا جووتیارە کرێکارەکان لەسەر زەویدا کشتوکاڵ دەکەن. جووتیارە کرێکارەکان پاشان تەنها توانیان کاری وەرزانە بکەن و ئەمە سەرەتای کۆچگەلێك بوو کە لە دەیەی ١٩٥٠ بەملاوە دەبینرێت. هەروەها رەوشی بژێوی جووتیارە وردە زەویدارەکان بە هۆی گوشاری حەشیمەت کە دابەشبوونی زەوییەکانی لێکەوتووەتەوە، بەربەرە خراپتر بووە.

کۆچە ئابوورییەکان بۆ شارە پیشەسازییەکان لە درێژایی چەند دەیەی رابردوو (بە تایبەت لە تورکیا) بوونەتە هۆی لە دەستچوونی حەشیمەتی چالاکی ناوچە کوردنشینەکان. نەبوونی ژێرخانی ئابووری کە لە گیروگرفتە سیاسییەکان و هەروەها بەرنامەڕێژییە حکومییەکان سەرچاوەی گرتووە، نەیهێشتووە لە ناوچە کوردنشینەکان- کە جگە لە دەرهێنانی نەوت هیچ پیشەسازییەکی دیکەی نییە- سەرمایەگوزاری بکرێت. بەرهەمی تەماکۆ دەتوانێت زیاد بکرێت، بەڵام پاوانی دەوڵەتیی لە ئێران، تورکیا و عێراق بووەتە کەند و کۆسپ لە سەر پەرەسەندنی ئەم بەرهەمە.

پیشە تایبەتە دەستییەکان لە کوردستان هەر لە مێژەوە لە دەستی کەمینە یەهوودیو مەسیحییەکاندا بووە. شارەکانی دیاربەکر، بتلیس، وان، هەولێر و موسڵ سەرەکیترین ناوەندە بازرگانی و بەرهەمهێنەرەکانی کوردستان بوون کە خودی کوردەکان ئەوەندە تێیاندا بلیمەت نەبوون، بەم حاڵەش دەوروبەری شارەکان هەتا سەرەتای سەدەی ٢٠ لە بەرهەمهێنانی پێداویستییەکانی رۆژانەیان خۆژێن بوون.

بەهەرحاڵ لەناوچوونی خێرای پیشەسازییە دەستییەکان لە کوردستان، بەر لە هەموو شتێك بە هۆی نەمانی کەمینە ئایینییەکان بوو: ئەرمەنییەکان لە درێژایی شەڕی دووەمی

جیهان بە کۆمەڵ کوژران و دوورخرانەوەو بەشی گەورەی کۆمەڵگای مەسیحییەکانیش لە ئەنادۆڵی دەرکران. کۆمەڵگای رۆژهەڵاتنشینی یەهوودییەکانیش لە دوای دامەزرانی دەوڵەتی ئیسرائیل بۆ ئەوێ کۆچیان کرد. لە ئەنجامدا پیشەکانی پەیوەندیدار بە بەرهەمی پەشم کە لە پاوانی ئەرمەنییەکاندا بوو، بە شێوازێکی بەرچاو رووی لە کەمبوون کرد. هەروەها سیستەمی ئاویاری گوندە مەسیحینشینەکان زۆر لە سیستەمی ئاویاری گوندە کوردنشینەکان پێشکەوتووتر بوو.

یەکێك لە هۆیەکانی دیکە کە دەتوانێ پاساو بۆ ئەم روو لەکەمبوونەوەیە بهێنێتەوە، پەیوەندی بەرەبەرەی کوردستان لەگەڵ دنیای دەرەوە بوو. لە دوای پەرەسەندنی پەیوەندییەکان، بەرهەمە پیشەییە ئەوروپاییەکان لەگەڵ بەرهەمە مەحەلییەکاندا ململانێی دەکرد. ئێستا لە دوای داخوازیی بەرهەمە نوێیەکان، پیشەسازییە دەستییەکان روویان لە لەناوچوون کردووە. ئێستا فرۆشیارە گەڕیدەرەکان لە گوندێك دەچن بۆ گوندێکی دیکەو بەرهەمە پیشەسازییە هەرزانەکان دەدەن بە گوندییەکان. کەوابوو ئابووری پیشەسازی کوردستان بووە بە ئابوورییەکی لە حاڵی پێشکەوتن. هاوکات لەگەڵ گرێدراوبوون بە بەرهەمە بیانییەکان، گەشەی ئابووری کوردستان بە هۆی نەبوونی ناوەندەکانی پیشەسازی و سیستەمی لاوازی پەیوەندییەکان، زۆر هێواشە. رێگاوبانەکان بە دەگمەن ئاسفاڵت کراون و سەفەرەکان زۆر کات دەگرن، تەنانەت هەندێك جار سەفەر لە گوندێك بۆ گوندێکی دیکە لە سەفەر لە شارێك بۆ شارێکی دیکە (سەرەڕای زۆر کورتتر بوونی مەوداکەی) ئاسانترە.

زمانی کوردی سەر بە بنەماڵەی زمانە ئێرانییەکانە و ئەم زاراوانە لەخۆدەگرێ: کرمانجی (لە تورکیا)، زازایی (لە تورکیا) و سۆرانی (لە عێراق)[١٣]. هەندێك کوردیش بە گۆرانی قسە دەکەن. کوردە کرمانجەکان بە ئاسانی لە زاراوەی سۆرانی تێناگەن. بەهەرحاڵ جگە

١٣- بە بۆچونی زۆربەی زمانناسان زمانی کوردی لە ٥ زاراوە پێکدێت کە بریتین لە کرمانجی، سۆرانی، هەورامی، کەلهووری و زازایی. زۆربەی کوردان واتا کوردەکانی تورکیا، سوریا، لوبنان، ئەرمەنستان، گورجستان، قەزاقستان، تورکمەنستان، قیرقیزستان و بەشێك لە کوردەکانی ئێران و عێراق بە زاراوەی کرمانجی دەپەیون. بەشێك لە کوردەکانی ئێران و عێراق بە زاراوەی سۆرانی و هەورامی (ناوچەی پاوە و مەریوان) و بەشێك لە کوردەکانی ئێران (٢ پارێزگای کرماشان و ئیلام) و کوردەکانی عێراق (ناوچەی خانەقین، مەندەلی و کوردە فەیلییەکان) بە زاراوەی کەلهووڕی دەپەیون. هەروەها بەشێك لە کوردەکانی تورکیا (بە تایبەت ناوچەی دەرسیم) بە زاراوەی زازایی دەپەیون. (وەرگێڕ)





لە چەند گرووپی تاویاو، کوردەکان بە زمانی خۆیان قسە دەکەن و هەندێکیان هیچ زمانێکی دیکە نازانن. هەبوونی دوو جۆرە ئەلفوبێ (ئەلفوبێی لاتینی لە تورکیا و ئەلفوبێی عەرەبی لە شوێنەکانی دیکە) کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانی کوردی لە یەك جیا کردووەتەوە.

## هۆکاری ئایین لە نێو کوردەکان

زۆربەی کوردەکان سوننە و شافیعی مەزهەبن. ئەم هۆکارە ئەوان لە دراوسێ عەرەبو تورکەکانیان کە بەگشتیی حەنەفی مەزهەبن یان تورکە ئازەرییەکان و فارسەکان کە شیعەن، جودا دەکاتەوە. لە تورکیا هەندێك لە کوردەکان پەیڕەوەی لقێکی غەیرە فەرمیی ئایینی شیعەن کە پێی دەڵێن عەلەوی (پەیڕەوانی حەزرەتی عەلی) و زۆربەیان بە زاراوەی زازایی قسە دەکەن.

لە کرماشان، ئیلام و خانەقین هەندێك لە تایفە کوردەکان شیعەن، لە حاڵێکدا کە لە رۆژئاوای کرماشان و کرکوك، کوردەکان پەیڕەوی ئایینی ئەهلی هەقن. ئایینی ئەم کوردانە زۆر لە ئایینی شیعەی ١٢ ئیمامی جیاوازەو وادیارە لە تاقمی ئیسماعیلییە سەرچاوەی گرتووە.

ئێزدییەکان پەیڕەوی ئایینێکی لادەرن کە بیروباوەڕەکانی تاقمی ئیسماعیلییە تێیدا هەستپێکراوە، بەڵام بە هۆی ئەوەی ئێزدییەکان لە لایەن دراوسێکانیانەوە بە شەیتانپەرست* دەزانرێن، پەیوەندی ئێزدییەکان لەگەڵ مەسیحییەکان باشترە تا موسڵمانەکان. بەشی هەرەزۆری ئێزدییەکان لە باشووری رۆژهەڵاتی موسڵ لە نزیك ئارامگای شێخ عودەی دەژین. لە دوای ئازاری ئێزدییەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم، ئێزدییەکان کۆچیان کرد بۆ قەفقازو پاشان ئەوێ بوو بە ناوەندی سەرەکی حەشیمەتی ئێزدییەکان. لەم دواییانەش هەندێك لە ئێزدییەکانی تورکیا و عێراق لە دەستی ئازاری زۆربەی موسڵمانەکان هەڵهاتوونو لە ئاڵمان نیشتەجێ بوونە.

هەر لە کۆنەوە کۆمەڵگای یەهوودی و مەسیحی لە رەوشێکی خراپدا ژیاون و پاراستنی ئەوان لە لایەن دەوڵەتانی رۆژئاوا (روسیا و بریتانیای مەزن) بوو بە بیانوویەك بۆ ئەوەی - بەتایبەت بە هاندانی دەرباری ئیمپراتۆری عوسمانی- رەشەکوژ بکرێن. هێرشکردنە سەر کۆمەڵگای مەسیحی لە ساڵی ١٩١٥ بە دوورخستنەوەو کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان بە دەستی دەوڵەتی" تورکە گەنجەکان" -کە بە هاوکاری هەندێك لە عەشیرەتە کوردەکان جێبەجێ کرا- گەیشتە ترۆپکی خۆی. هەروەها ئازاری کۆمەڵگا مەسیحییەکانی دیکە (یەهوودییەکان،

* ئێزدییەکان دەڵێن: ئێمە شەیتان ناپەرستین، بەڵکو ئێمە دژایەتی ئەو ناکەین تاکو خراپەمان لەگەڵمان نەکەن.

ئاشوورییەکان و نەستوورییەکان) بووە هۆی ئەوە کە بۆ عێراق و سوریا کۆچ بکەن کە پاشان کەوتنە ژێر چەتری پاراستنی بریتانیاو فەرەنسا. ئاشوورییەکان لە ساڵی ١٩٣٣ بەئامانجی گەیشتن بە خودموختاری دژی دەوڵەت راپەڕینیان کرد، بەڵام بە شێوازێکی بێبەزییانە سەرکوت کرانو سەرۆك عەشیرەتە ئاشوورییەکان دوور خرانەوە.

لە جیهانی شیعە و سوننەدا، "سەیید"ەکان بەهۆی ئەوەی کە بە نەوەی پێغەمبەر لە قەڵەم دەدرێن، خاوەن پێگەیەکی نایابن، بەڵام لە نێو کوردەکاندا ئەوەندە برەویان نییە. سەییدەکان گرووپێکی داخراون، بەڵام چینێکی تایبەت پێکناهێنن و لەوانەیە دەوڵەمەند یان هەژار بن. لە رابردوودا هەندێك جار قورب و قەدری تاکەکان هەر لە کاتی لە دایکبوونیانەوە بەرز دەبووەوە. بۆ نموونە شێخەکانی تەریقەتی قادری کە زۆربەیان "سەیید"ن، بە هۆی باوباپیرانیان لە نێو موریدەکانیاندا خاوەن پێگەو قەدر و قوربێکی بەرز بوون. "سەیید"بوون، هەروەها دەتوانێت بە شێوازێکی بەرچاو قەدر و قوربی سەرۆك عەشیرەتەکان لە بەرامبەر رکابەرەکانیان زۆرتر بکات هەرچەند کە ئەم تایبەتمەندییە بە هۆی سەرهەڵدانی هەستی نەتەوەپەرستی لە سەدەی بیستەم رووی لە نەمان کردووە.

لە سەردەمی ئیمپراتۆری عوسمانی، موفتییەکان زنجیرەیەك پلەی ئایینیان پێکدەهێنا کە بۆ رێزگرتن لە شەریعەت (یاسای ئیسلام) پروپاگەندایان دەکرد. موفتییەکان دەیانتوانی فتواگەلێك (حوکمی ئایینی) دەربکەن کە لە رووی یاساییەوە متمانەپێکراو بوو. بەهەرحاڵ موفتییەکان بە هۆی گرێدراوبوون بە دەوڵەت یان خەلافەت یان ئەمیرە مەحەلییەکان، دەورێکی چالاکیان لە بزووتنەوە سیاسییەکانی کورددا نەبینی و هەڵوەشانەوەی خەلافەت لە ساڵی ١٩٢٤ بووە هۆی ئەوە کە خزمەتە گشتییەکانیان بێکەڵك بن و برەوییان کۆتایی پێبێت.

لە گوندەکان مەلاکان خاوەن خودموختاری ئایینین و بنەواشەکانی هەڵسوکەوتی ئایینیو قورئان فێری منداڵان دەکەن. مەلاکان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ سەرەکیترین پارێزەرانی کولتووری کلاسیك، شیعر، ئیلاهیات و ئەدەبیات بوون، بەڵام بە سەرهەڵدانی قوتابخانە دەوڵەتییەکان، دەسەڵاتیان بەرەبەرە کەم بووەوە.

خوێندنەوەی هۆکاری ئایین لە نێو کوردەکان (هەرچەند کە خێرا بێت) بێ ئاماژەکردن بە تەریقەتە سۆفیانەکان کە دەورێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی گرینگ دەبینن، خوێندنەوەیەکی تەواو نابێت. لە ناو کوردەکان، هەروەك هەموو کۆمەڵگا عەشیرەتییەکان، هەندێك تاکی تایبەت بە هۆی ئەوەی کە خاوەن سەرچاوەگەلێکی رەوایەتین، لە رێگای چارەسەرکردنی



ناکۆکییەکانی نێوان تایفەکان دەبن بە خاوەن دەسەڵات، هەرچەند بە شێوازێکی کاتیش بێ. کەوابوو ئەوەندە جێگای سەرسووڕهێنان نییە، کە لەم دواییانەدا، مەلا مستەفا بارزانی (بەناوبانگترین رێبەری کورد لە عێراق) یان جەلال تاڵەبانی لە بنەماڵەی ئایینی سەریانهەڵداوە، بەشێك لە برەوی ئەوان قەرزاری ئەم راستییەیە. شێخەکان واتا سەرۆکی تەریقەتە سۆفیانەکان، جێگای رێزی گشتیی خەڵکن و خاوەن برەوێکی بەرچاون. شێخەکان لە میانەی ناکۆکییەکانی نێوان گرووپەکان زۆرتر وەك ناوبژیکەر کاردەکەن و تۆڕی موریدەکانیان کە پاساو بۆ هێزی سیاسی ئەوان دەهێننەوە، توانایی ئەوەیان هەیە، کە بەشێکی زۆری خەڵك بکەن بە لایەنگریان.

لە ناو کوردەکان، سەرجەم شێخەکان سەر بە دوو تەریقەتی سۆفیانەن: تەریقەتی قادریو تەریقەتی نەقشبەندی. تەریقەتە سۆفیانەکان لە عەشیرەو حکوومەت سەربەخۆن و وەك گرووپێکی پڕ رەمزوڕاز کار دەکەن، هیچ ناوەندپارێزییەکی توند لە نێوانیاندا نییە و لەوانەیە گەلێ ناوەندی ناوچەیی لە نێوانیاندا هەبێ. هێزی شێخەکان لە هێزی شەفابەخش و بەگشتیی بەرەکەت سەرچاوە دەگرێ کە بە بیروباوەڕی خەڵك، خوداوەند پێی داون. چاوەڕوان دەکرێ ئەو موریدانە کە تێن مامۆستاکەیان ببینن، کۆمەڵێك دیاری لەگەڵ خۆیاندا بێنن. شێخەکان بە هۆی شوێن و پێگەی تایبەتیان دەتوانن لە قەڵەمڕەوی خۆیاندا پێ لەسەر هەندێك داخوازی تایبەت دابگرن، بەڵام ئاغاکان ئەم مافەیان نییە. زێدەباری ئەمە، پێگە و شوێنی کۆمەڵایەتیی شێخەکان، وایان لێدەکات لە رێگای ژن و ژنخوازییەوە، هاوپەیمانیی عەشیرەتی پێکبێننو ئەمەش هێزی سیاسیو ئابووریان پتەوتر دەکات. هەڵبەتە دژواربوونی پەیوەندی نێوان شێخەکان و خەڵکی گوندەکان هەندێك جار بووەتە هۆی راپەڕین. زۆرتر چین و توێژەکانی خواری کۆمەڵگا دەکەونە شوێن سۆفیەکان. رێکخراوی شێخەکان تەنها رێکخراوێکە کە لە سەرچاوە کۆمەڵایەتییەکان بێبەشە و هەندێك جار تۆڕی کوردە ناسیۆنالیستەکان کەڵکیان لێوەردەگرن.

تەریقەتی قادری پاش کۆچی دوایی عەبدولقادر (١٠٧٧ـ١١٦٦) ناوی لێنرا. عەبدولقادر هەرچەند کە فێرکاریی سۆفییانەی بینیبوو بەڵام خۆی مامۆستایەکی سۆفی نەبوو، بەڵکو کەسایەتییەکی پیرۆز بوو، کە سەدە و نیوێك پاش مەرگ، ناوبانگی دەرکردو تەریقەتەکەی لە سەدەی ١٥ لە کۆمەڵگای ئیسلامدا پەرەیسەند. تەریقەتی قادری تەنها تەریقەیەك بوو کە هەتا سەدەی ١٩ لە کوردستان مایەوەو بەهێزبوو.

تەریقەتی نەقشبەندی لە سەدەی ١٣ دامەزراو ناوی لە بەهائەدین نەقشبەندی (١٣١٨ـ١٣٥٩) گیراوە کە چاکسازی تێدا کرد. تەریقەتی نەقشبەندی لە سەرەتای سەدەی ١٩ بە دەستی مەولانا خالید هاتە نێو کوردستان. مەولانا خالید کوردێکی سەر بە عەشیرەتی جاف بوو، کە توانی لە سایەی بەهرەی مەوعیزەدانەوە، تەریقەتی نەقشبەندی بەسەرکەوتوویی دابمەزرێنێ. یەکێك لە هۆکارەکانی دیکەی پەرەسەندنی تەریقەتی نەقشبەندی، بارودۆخی ناوچە کوردنشینەکان بوو لە سەردەمی ئیمپراتۆری عوسمانی لە سەرەتای سەدەی ١٩. زیرەکیی ئیمپریالیزمی ئەوروپا (بریتانیا) و چالاکیی میسیۆنێرە ئایینییەکان، کاردانەوەی موسڵمانەکانی هاندا. هەر بۆیە پەیامە دژە مەسیحی و دژە رۆژئاواییەکانی تەریقەتی نەقشبەندی، کاریگەریی زۆریان کردە سەر هەست و سۆزی خەڵك.

هاتنی مەولانا خالید بۆ کوردستان لە ساڵی ١٨٠٨ واتا بەر لەوەی میرنشینە خودموختارەکانی کورد لەناوبچن، نەبووە هۆی پەرەسەندنی دەستبەجێ یان بەرچاوی تەریقەتەکەی، بەڵکو رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆ لەگەڵ گوشاری ناوەندپارێزی و لەناوچوونی میرەکان لە سەردەمی دواتردا بوو، کە بووە هۆی ئەوە  ئەم تەریقەتە پتر لە جاران لە ناو خەڵکدا قبووڵ بکرێت.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە حیزبەکان کاریگەریی زۆریان لەسەر شەڕی دایمی عەشیرەتەکان نەبوو، زۆرتر شێخەکان لە نێوانیاندا ناوبژییان دەکرد، کەوابوو برەوی شێخەکان زۆرتر بوو، بەڵام پاش ئەوەی کە لە کۆتایی سەدەی ١٩و سەرەتای دەیەی ١٩٢٠ بوون بە سەرۆکی زۆربەی بزووتنەوە راپەڕیوەکان، بەرەبەرە برەویان کەمبووەوە. لە تورکیا سیاسەتی دەوڵەت لەسەر بنەمای دوورخستنەوە یان راگرتنی شێخەکان لە ماڵدا بوو. لە ئاکامدا گەلێك لە شێخەکان بوون بە شارنشین، بەڵام پاشان بە تایبەت وەك ئەندامی حیزبە دیموکراتەکان دەورێکی سیاسی گرینگیان بینی. لە سوریاش برەوی شێخەکان هەتا دەیەی ١٩٥٠ هەر وەك خۆی مایەوەو تەنانەت لە دوای هاتنی شێخە بێ حاڵوماڵەکان لە دەیەی ١٩٢٠ لە تورکیاوە بۆ سوریا، برەویان زۆرتر بوو.

بەهەرحاڵ لە دەستچوونی برەوی شێخەکان لە سێ دەیەی رابردوو، پەیوەندی بە ئاڵوگۆڕە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی سوریاوە هەیە. ناسیۆنالیزمی کورد کە وەك کاردانەوەیەك لە بەرامبەر ناسیۆنالیزمی عەرەبیی "جەماڵ عەبدولناسر" سەریهەڵدا یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی رووخانی دەسەڵاتی شێخەکان بوو، کە تا ئەو کاتە لە سەرانسەری جیهاندا



رەوایەتییان هەبوو. بە گشتیی لاوازبوونی شێخەکان پەیوەندی بە لەناوچوونی ژیانی عەشیرەتییەوە هەیە، کە کاری کردووەتە سەر کۆمەڵگای کورد بەگشتی. کەمبوونەوەی کێشمەکێشە عەشیرەتییەکانیش، دەوری شێخەکانی وەك وتووێژکەر لە نێوان عەشیرەتە ناکۆکەکاندا کەمکردەوە. بۆ نموونە لە عێراق، بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی کورد لە دوو یان سێ دەیەی رابردوو ئەوەندە برەوی هەبووە، کە ناکۆکییەکانی نێوان عەشیرەتەکان چارەسەر بکات کەوابوو ئەو دەورە کە شێخەکان لە مێژەوە دەیانبینی، ئێستا بزووتنەوە سیاسییەکان دەیبینن.

بزووتنەوەی بناژۆخوازی سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی کە لە تورکیا پێی دەڵێن "نورجولوك" (پەیڕەوانی تیشکی ئیلاهی) بزووتنەوەیەکی گرینگە. ئەم بزووتنەوەیە پاش شەڕی دووهەمی جیهانی گرینگی پەیدا کردو هەر ئێستاش تۆخمێکی گرینگی بزووتنەوەی بناژۆخوازی تورکیایە. یەکەم بزووتنەوەگێڕی "نورجولوك" سەعید نورسی بوو. مەلا سەعید لە ساڵی ١٨٧٣ لە پارێزگای بتلیس هاتە دنیاو لە دەیەی ١٩٢٠ لایەنی مستەفا کەمالی گرت تا لایەنی خەلیفەو دژایەتی هێزە رۆژئاواییەکانی نەدەکرد، بەڵام بۆ قۆناخێکی درێژ لە بەندیخانە مایەوەو پاشان بوو بە نەیاری کەمالیستەکان. کۆمەڵە وتارەکانی سەعید نورسی لە دەیەی ١٩٥٠ بڵاوبوونەوە. لە دەقی "ریسالەی نوور"دا نورسی پێویستی گەڕانەوە بۆ ئیسلامی راستەقینە شیدەکاتەوەو بە دەربڕینی نەریتپارێزی توندئاژۆ بە توندی هێرش دەکاتە سەر رۆژئاواو تاقمە بێ بەرپرسیارەتەکان وەك عەلەوییەکان.

## عەشیرە

گرینگترین تایبەتمەندی رێکخراوی کۆمەڵایەتی کوردەکان، فرەچەشن بوونە. پەیوەندییە عەشیرەتییەکان بەسەر هەموو کۆمەڵگادا زاڵن و تەنانەت ئەوانەی کە عەشیرەتی نین، پەیڕەوی لە نۆرمە (بنەما) کانی دەکەن. لە نێو کوردەکان، عەشیرە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بەرێکخستنکراوو یەکینەیەکی ئابوورییە کە لەسەر پەیوەندە خوێنییە راستەقینە یان خەیاڵییەکان دامەزراوە. عەشیرە بە سیستەمگەلێکی بچووکتر لە ئاستی تایفەدا دابەش دەکرێ کە ئەساس و بنەمای سیستەمی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنی. تایفە لە بنەماڵەگەلێکی مەزن پێکدێت کە خاوەن باوباپیرێکی هاوبەشن و شەجەرەنامەگەلێکی جیاوازیان هەیە، کە لەگەڵ شەجەرەنامەی تایفەکانی دیکە- کە بە یەکەوە عەشیرەت پێکدەهێنن- جیاوازە. ئەڵبەتە چەندەها جار روویداوە کە کەسێك کە سەر بە تایفە نەبووە، لەلایەن تایفەوە وەرگیراوەو

نەوەکەی پاش سەردەمێك لەگەڵ نەوەی گشتیی تایفە بووە بە یەك. تایفە تەنانەت دەتوانێت بەپشتبەستن بە بەرژەوەندییە سیاسی و سەربازییەکانی، تایفەکانی دیکە بەرەو لای خۆی رابکێشێت و لە کۆی ئەم بەشە جوداجودانە، شەجەرەنامەیەکی هاوبەش پێکبهێنێت.

لە باری ئابوورییەوە، یەکینەی بنەڕەتی بنەماڵەیە کە زۆرتر ناوکییەو لە باوك و دایك و منداڵە سەلتەکان پێکدێت. بەهەرحاڵ ئەمە تا رادەیەك دیاردەیەکی گشتییە کە ئەو پیاوانەی کە تازە ژن دەهێنن لەگەڵ دایك و باوکیاندا دەژین. هەروەها زەمینداره مەزنەکان پێیان خۆشە بۆ راگرتنو دابەشنەبوونی زەوی و زارەکەیان، رێگە لە پەرت و بڵاوی بنەماڵەکەیان بگرن.

یەکەمین تایبەتمەندیی عەشیرەت ئەوەیە کە زەوییەکی هەبێ تا تێیدا بژی. هۆکاری زەوی یەکێك لە هۆکارەکانی متمانەو ناو و دەنگی عەشیرەتە. ئەڵبەتە هەرچەند کە یاسا حکوومییەکان نەیانهێشتووە عەشیرەتەکان دەسەڵاتیان بەسەر زەوییەکاندا هەبێ، بەڵام هەندێك لە عەشیرەتەکان، ئەم دەسەڵاتەیان هەیە. بە بیروبۆچوونی ڤان بروئینسن-ی مرۆڤناس، لەساڵی ١٩٧٦ پاش ئەوەی کە یەکێك لە ئەندامانی عەشیرەتی (رەشکوتان) زەوییەکی فرۆشتووە بە کەسێکی سەر بە عەشیرەتێکی دیکە، چەندەها پێکدادانی چەکداری لە نێوان دوو عەشیرەتدا روویداوە.

مافی لەوەڕاندنی مەڕو ماڵات هی هەموو عەشیرەتەکانە و هەندێك شوێنی تایبەتیش هەیە کە تەنها هی عەشیرەتێکە. عەشیرەتە گەڕیدەرە رەشماڵەنشینەکان دەبێ بۆ لەوەڕاندنی مەڕوماڵاتیان باج بدەن بەو سەرۆك عەشیرەتەی کە خاوەن ئەو زەوییەیە کە ئەوان لێی تێدەپەڕن. ئەڵبەتە هەندێك جار سەرەڕای ئەم پارەدانەش کێشە و گیروگرفت لە نێوان عەشیرەتەکاندا روودەدات. بەهەرحاڵ سەرۆکی عەشیرەت کە ئەم پارەیە وەردەگرێت، سەرلەنوێ لەنێوان ئەندامانی عەشیرەتدا دابەشی ناکات و ئەمەش سەرەتای جۆرێك داگیرکاریی زەوییە. لەوەڕگەکانی دەوروبەری گوند هی هەموو گوندییەکانە. بۆ حەشیمەتی یەکجێنشین، گوند یەکینەیەکی سەرزەمینی بنەڕەتییە، لە حاڵێکدا کە بۆ دەوڵەت وەك مەڵبەندێکی ئیدارییە. کۆمەڵگای گوند هەندێك جار لە یەك تایفە پێکدێت، بە واتایەکی تر هیچ کەسێك سەر بە تایفەیەکی دیکە لەو گوندەدا ناژی، لەوانەشە پێکهاتەی گوند بەرفراوانتر بێت و لە چەند تایفەی خزم پێکبێ. ئەم مەسەلەیە دەتوانێت ببێ بە سەرچاوەی سەرهەڵدانی گێرەو کێشە.

لە کۆمەڵگای کورددا سنوورەکانی خێڵ بە وردی پێناسە نەکراون. لەوانەیە چەند بنەماڵە هەبن کە بە تەواوی سەر بە یەك باو و باپیر نەبن و هەندێك جاریش ژمارەی ئەو کەسانە یا



گرووپانەی کە باو و باپیری هاوبەشیان هەیە لە گوندێك مەزنتر بێ. ئەگەر وابێت لەوانەیە لە ناکاو گوند بەجێ بهێڵن کە ئەمەش پەیوەندیی  بە گەورەو بچووکی ئەو گوندەوە هەیە کە تێیدا دەژین.

عەشیرەتەکان هەتا رادەیەك بە خێرایی پێکدێن یان لەناودەچن. یەکێك لە تایبەتمەندییە هەمیشەییەکانی عەشیرەتەکان، ناکۆکی نێوان عەشیرەتێك یان هۆزێك لەگەڵ عەشیرەت یان هۆزێکی دیکەیە. ئەگەر وەها بێ، تەنها بەرەنگاربوونەوە یان تۆڵە و تۆڵەسەندنەوەیە- کە یەکێك لە بەها عەشیرەتییەکانە- بەدی دەکرێت. لە رق و کینەخوازی یان تۆڵەسەندنەوەی نێوان گرووپەکان مەبەست تەنها سزادانی کەسی گوناهبار نییە، بەڵکو سزادانی هەموو تاکەکانی گرووپە. کەوابوو رەوتی تۆڵەو تۆڵەسەندنەوە لەوانەیە چەند دەیەو تەنانەت زۆرتریش درێژەی هەبێت. لە رابردوودا ئەو کوردو مەسیحییانەی کە سەر بە هیچ عەشیرەتێك نەبوونو مافی هەڵگرتنی چەکیان نەبوو، پاراستنیان پەیوەست بوو بە سەرۆك عەشیرەتەکان. لە بەرامبەردا چاوەڕانی ئەوەیان لێدەکرا ملکەچ و هاوپەیمانی سەرۆك عەشیرەتەکان بن.

لە بابەتی کوشتنی بە ئەنقەستدا، بڕێك پارە کە پێی دەڵێن خوێنبایی، دەدرێت بە دایكو باوك و هەندێك جار براکانی کوژراوەکە. کەم یان زۆربوونی خوێنبایی بە گوێرەی پێگەی کۆمەڵایەتی کوژراو و تەنانەت بکوژەکەو رادەی دەسەڵاتی هۆزی کوژراوەکەیە. خوێنبایی لە لایەن هەموو تاکەکانی عەشیرەت بە شێوازی هاوبەش دەدرێت، ئەم مەسەلەیە جۆرێك بەرپرسیارەتی گشتییە و بەشدارییەکی سەمبۆلیکە. لە دواییدا کۆمەڵێك رێککەوتن کە بەگشتیی لە ئاکامی ناوبژیو واستەکاریدا پێکدێت، سەرەنجام کۆتایی بە سووڕی تۆڵەو تۆڵەسەندنەکان دێنێت. ئەڵبەتە ئەگەر عەشیرەتە ناکۆکەکان خزمی یەکتربن یان کەسایەتییێکی خاوەن دەسەڵات وەك سەرۆکی عەشیرەتێك لە نێوانیاندا هەبێت، ئاسانتر رێکدەکەون. کەسێك کە لە نێوان عەشیرەتە ناکۆکەکاندا ناوبژی دەکات، دەبێ سەرۆك عەشیرەتێکی بێلایەن و خاوەن دەسەڵات بێ و زۆر بەدەگمەن عەشیرەتە ناکۆکەکان دەهێڵن عەشیرەتە نەیارەکان کەڵك لەم ناکۆکییە وەرگرن. لێرەش هەروەك هەموو کۆمەڵگا عەشیرەتییەکانی دیکە، زۆرتر شێخەکان دەوری ناوبژیکەر دەبینن. زۆربەی سەرۆك عەشیرەتە دەستڕۆیشتووەکان لەبەرئەوە شانازی بە رەگ و ریشەی بیانی خۆیان دەکەن کە ئەمە وایان لێدەکات لە رەوتی لایەنگرییە عەشیرەتییەکان بە دوور بن و بتوانن لە نێوان عەشیرەتە ناکۆکەکاندا ناوبژی و داوەری بکەن.

دەستێوەردانی دەوڵەتەکان بۆ لەناوبردنی سیستەمی تۆڵەسەندنەوەی شەخسی و کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی شێخەکان وەك ناوبژیکەر، هەوڵێکی سەرکەوتوو بووە. دەوڵەتی تورکیا ناوبژیکەریی نەریتیی ناوەتە لاوەو هەندێك جار بۆ سەپاندنی بڕیاری خۆی بەسەر عەشیرەتدا دەست بۆ زۆر دەبات. بەهەرحاڵ بە هۆی ئەوە کە دەوڵەتەکان کارایی پێویستیان بۆ ئاشتکردنەوەی عەشیرەتەکان نییە، سیستەمی تۆڵەسەندنەوەی تاکەکەسی و بەردەوامبوونی ئاڵۆزیو تەنانەت شەڕ و پێکدادان هێشتا بەسەر گوندەکاندا زاڵە.

ژن و ژنخوازی جودایی نێوان عەشیرەتەکان زۆرتر دەکات، کەوابوو مەترسی سەرهەڵدانی ناکۆکی و گێرەوکێشەکانی نێوان گرووپەکان زیاتر دەکات. گەنجەکان زۆرتر پێیان خۆشە لەگەڵ کچ مام (دۆتمام) ی خۆیان ژیانی هاوسەری پێکبێنن. پێکەوەنانی ژیانی هاوسەری لەگەڵ کچ مام بەشێك لە داب و نەریتەو لادان لێی ئاسان نییە. ئەم جۆرە ژن و ژنخوازییە کە بەربوکانەیەکی کەمی لەگەڵدایە دەبێتە هۆی نزیکتربوونەوەی ئەندامانی بنەماڵەو یەکرێزی هۆز پتەوتر دەکات.

عەشیرەت لە کردەوەدا مەزنترین یەکینەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای نەریتیی کوردە. لانیکەم هەتا نیوەی سەدەی ١٩ هیچ چەشنە هەستێکی ناسیۆنالیستی راستەقینە کە بتوانێ بەسەر دوژمنایەتییە عەشیرەتییەکاندا زاڵ بێ، لە کوردستاندا لە ئارادا نەبوو، بەڵکو یەکێتییەکانی دەوڵەت و میلیشیا عەشیرەتییەکان کە زۆرتر بە مەبەستی لاوازکردنی رکابەرەکان پێکدەهاتن، بە شێوازێکی سیستماتیك نەیارێتی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی کوردیان دەکردو هەتا ئەم دواییانە ناسیۆنالیزم قەت نەبوو بە ئایدیۆلۆژییەکی بەهێز بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان. یەکێتییەکانی نێو عەشیرەت تەنانەت لە کاتی کێشمەکێشی عەشیرەت لەگەڵ عەشیرەتێکی دیکەدا تەواو نین و سەرۆك عەشیرەتە کوردەکان هەمیشە بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی خۆیان بە شوێن یەکێتی بیانیدان. کەوابوو بۆ هێزێکی بیانی ئاسانە دەست لە کاروباری عەشیرەت وەربدات و تەنانەت بگات بە چەشنە سەرکەوتنێك، هەرچەند کە بە ناویش بێ.

هاوپەیمانییە ستراتژییە بیانییەکان لە دەرەوەی بازنەی دوژمنایەتییە عەشیرەتییەکانەو زۆرتر کۆمەڵێك مانۆڕ لە قەڵەم دەدرێت کە زۆرتر مەبەستیان لاوازکردنی رکابەرە تا لەناوبردنی. کەوابوو یەکێتییەکان لەوانەیە لەگەڵ شك و گوماندا رووبەڕوو ببنەوە، بەڵام خودی ناکۆکییەکان دەوری سەرەکیی دەبینن. بەهەرحاڵ لەبەر ئەوەی کە دەوڵەتەکان زورتر لە جاران دەستێوەردان دەکەنو توندوتیژییەکانیان خستووەتە بن کۆنترۆڵی خۆیان، دەسەڵاتی رێبەرە



عەشیرەتییەکانیش ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە. ئێستا رێبەرە عەشیرەتییەکان ناچارن بوونی رۆژ لە دوای رۆژ روو لە زیادبوونی هێزە دەوڵەتییەکان قبووڵ بکەن، تەنانەت لێهاتوویی ئەم رێبەرانە بۆ گەشەپێدانی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەت بووە بە هۆکارێکی زۆر سەرەکیی لە سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنە سیاسییەکاندا.

گەورە کوردەکان لە بنەڕەتدا دەبن بە دوو بەش: ئاغا و بەگ. ئاغا کەسایەتییەکی گوندیو عەشیرەتییە کە هەر لە کۆنەوە رێبەری گرووپێك لە پیاوە شەڕکەرەکان بووە. بەگ خاوەن زەوییەکی شارنشینە کە لەوانەیە رەگوڕیشەی عەشیرەتی نەبێ و هەندێك کەس زەوییەکەی بە کرێ دەگرن و کشتوکاڵی تێدا دەکەن. گرینگترین ئەرکی کۆمەڵایەتیی ئاغا، خزمەتکردنی رێبوارانە. ئاغا ئەوەندە داهاتی هەیە، کە دەتوانێت خواردن و شوێن بۆ میوانەکان دابین بکات. ئاغا لە هۆدەی تایبەتدا، میوانەکان دەبینێت و میوانپەروەریی ئەو شوێن دادەنێتە سەر قورب و پێگەی گوندەکەی. هەروەها دەست و دڵبازیی ئاغا یەکێك لە هۆکارەکانی قورب و رێز و برەوی ئەوە.

ئەو شوێنەی کە ئاغا میوانەکانی تێدا دەبینێت پێی دەڵێن "دیوەخان". دیوەخان وەك پەرلمان و ناوەندی چالاکییە هاوبەشەکانە (وەك سەرگەرمی و چارەسەرکردنی کێشەکان)، ئەمە وا لە ئاغا کە خاوەن دیوەخانە دەکات کە کۆنترۆڵی دیوەخان بگرێتە دەستی خۆی. چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت کە خەڵکی گوند، لانیکەم مانگێ جارێك سەردانی دیوەخان بکەن. لە دیوەخان بە راشکاوی لە هەڵسوکەوتی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا، بە تایبەت لە گەنجان رەخنە دەگیردرێت بە بێ ئەوەی مافی وەڵامدانەوەیان هەبێ. جگە لەم رووە لە چاودێریی کۆمەڵایەتی، دیوەخان هەروەها شوێنی بەڕێوەچوونی کۆبوونەوەکان و هەڵپەڕکێ و یارییەکانیشە.

بۆ دابینکردنی خەرجی میوانەکان، ئاغاکان باج لە گوندییەکان دەسێنن. ئەم باجە بریتییە لە 1 لە سەدی بەرهەمی دانەوێڵە یان ٤٠ لە سەدی شتەکانی دیکە. ئەم باجە هەندێك جار کرێ و تەنانەت زەکاتیشی (یارەمەتییەك کە لە یاسای ئیسلامدا هەیەو سەرلەنوێ لە نێوان هەژاراندا دابەش دەکرێت) پێ دەڵێن. ئەمە پیشان دەدات کە باج زۆربەی جاران شتێکی خوازراو جێگای پەسەندی خەڵك نییەو هەندێك جار بە زۆر وەردەگیرێت. هەڵبەتە لە ماوەی دوو دەیەی رابردوودا، ئەم رەوتە تا رادەیەکی زۆر راوەستاوەو ئێستا لە باتی ئاغاکان، رێکخراوە ناسیۆنالیستە کوردەکان ئەم باجە کۆدەکەنەوە.

لە درێژایی دەیەی ١٩٦٠، دیوەخانەکان بەرەو نەمان چوون. هەروەها لەم ٢٠ ساڵی دواییدا، هاتووچووی خەڵك بۆ دیوەخان کەمتربووەتەوەو گرینگی خۆی لە ژیانی رۆژانەدا لە

دەستداوە. جگە لە سوریا کە دەوڵەت وەك کردەوەیەك لە دژی بزووتنەوەی ناسیۆنالیست دیوەخانەکانی داخست، نەمانی دیوەخانەکان زۆرتر بە هۆی ئاڵوگۆڕە خێراکانی کۆمەڵگا بوو. میکانیزەبوونی کشتوکاڵ، ئاستی بەستراوەبوونی ئاغاکانی بە جووتیارە کرێکارەکان کەمکردەوەو جووتیارە کرێکارەکان کە زۆرتر بە شێوازی وەرزی کاریان دەکردو لە دەرەوەی گوند دەژیان، جێگای ئاغاکانیان گرتەوە. هەندێك لە ئاغاکان کە پاشکەوتیان هەبوو، بەرەبەرە بۆ شارەکان کۆچیان کردو لە ئاکامدا دیوەخانەکان لەناوچوون.

سەرجەم کوردەکان سەر بە عەشیرەت یان هۆز نین. زۆرێکیان سەربەخۆ لە سەرۆك عەشیرەتەکان دەژین، کەوابوو لە کردەوەدا خاوەن هیچ زەوییەك نین و لە ڕێگای کرێکاری یان جووتیاری بەکرێ دەژین، بەڵام لەبەرئەوەی کە شێوازە بێ بەزەییەکانی چەوساندنەوەی کوردە غەیرە عەشیرەتییەکان ئێستا نەماوە، جیاوازی نێوان ئەم دوو بابەتە کە لە سەرەتادا زۆر روون بوو، تا رادەیەك ناڕوون بووە. تەنانەت ئەم بارودۆخە لەو کاتەوە کە کوردە غەیرە عەشیرەتییەکان بە شێوازگەلی سنوورداری چەوساندنەوەی ئابووری، لەگەڵ زەوییەکاندا دەفرۆشران، ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە. ئەم کوردە غەیرە عەشیرەتییانە بریتیبوون لەو تاکە عەشیرەتییانە کە یەکجێنشین ببوون یان ئەو غەیرە کوردانەی کە بەرەبەرە لە کۆمەڵگای کورددا تاویابوونەوە.

## کورتەیەك لە مێژووی کورد

لە بارەی رەگەزی کورد، گریمانەی جۆراوجۆر هەیە. بە بیروبۆچوونی هەندێك، کورد نەتەوەیەکی بە رەچەڵەك ئێرانین کە لە سەدەی ٧ی پێش لە زایین لە ناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی ورمێ بەرەو ناوچەی بۆتان کۆچیان کردووەو بە بیروبۆچوونی هەندێکیتر نەتەوەیەکی خۆماڵێن. گزێنفۆن[١٤] لە کتێبی ئانابازیس- دا لە ژێر ناوی "کاردۆخییەکان" ناوی لە کورد بردووە.

مێژووی کورد بە شێوازێکی سەلمێندراوتر بە زاڵبوونی عەرەبەکان دەستپێدەکات. کورد هەرچەندە کە بە خێرایی بوون بە موسڵمان، بەڵام بۆ راپەڕینی جۆراوجۆر دژی عەرەبە داگیرکەرەکان دەستپێشخەر بوون. بەهەرحاڵ سلسلەی کورد لەگەڵ سەلجوقییەکان بوون بە یەك‌و

١٤- ئاماژەیە بە گزێنفۆن، شاگردی سوقرات و سەرداری یۆنانی کە ساڵی ٤٠١ی بەر لە زایین کاتی گەڕانەوە لە ئێران تووشی کوردەکان بووە و لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی *ئانابازیس* یان گەڕانەوەی ١٠ هەزار کەسی باسی ئەو زەبرانەی کردووە کە کورد لە سوپاکەی وەشاندوویانە. (وەرگێڕ)



دەستەواژەی "کورد" بۆ یەکەمجار لە سەدەی ٧ لە کاتێکدا کە سوڵتان سەنجری سەلجوقی پارێزگایەکی بە ناوی "کوردستان" دروستکرد کە پایتەختەکەی "بەهار" بوو، بەکاربرا.

هێرشی مەغۆلەکان لە سەدەی ١٢ سەرەتای قۆناخی گۆشەگیری کوردەکان بوو. کورد لە کێشمەکێشی نێوان مەغۆلەکان، عەرەبەکان و مەسیحییەکان بەشدارییان نەدەکرد. سەرەنجام سلسلەی تورکەکان جێی مەغۆلەکانی گرتەوەو بە زاڵبوون بەسەر کوردەکاندا، ئەوانی تووشی کێشمەکێشی نێوان شیعەکان و سوننەکان کرد. لە ماوەی ئەم سەردەمەدا، کوردەکانی ناوچەی سلیمانی بەرەو دەریاچەی ئورومییە لە ئێران کۆچیان کرد.

لە سەرەتای سەدەی ١٦ لە سەروبەندی ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆری عوسمانی‌و سەفەوی، کوردەکان خۆیان نیشان دا. ئێرانییەکان لە ساڵی ١٥١٤ لە شەڕی "چالدێران"دا بەرانبەر تورکەکان شکستیان خوارد. پەیماننامەی [زەهاو] کە ساڵی ١٦٣٩ لە نێوان ئێران‌و ئیمپراتۆری عوسمانی بەسترا، سنووری نێوان دوو حکوومەتی دیاری کرد، کە هەتا سەدەی ١٩ هەروەك خۆی مایەوە. لەو کاتەوە بەولاوە زۆربەی کوردەکان بوون بە بەشێك لە ئیمپراتۆری عوسمانی. لە دوای ئەوە کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی ئیمپراتۆری عوسمانی کە لە ئیمپراتۆری شای ئێران ئازادتر بوو، بوون بە سنوورنشین و لە ناو کۆمەڵێك میرنشینی نیمچە سەربەخۆدا کە بە دەستی حەکیم ئیدریسی کورد (وەزیری سوڵتان سلیم و والی میرنشینی بتلیس) پێکهاتبوون، سەروسامان دران. پێکهاتنی ئەم میرنشینانە وای لە کوردەکان کرد کە رێ لە پێشهاتنی ئێران بگرن.

رێکخراوی میرنشینە کوردەکان تا رادەیەك وەك رێکخراوی حکوومەتی عوسمانی بوو بەڵام سیستەمی ئیدارییەکی زۆر لاواز بوو. والی میرنشینەکان بەشی هەرەزۆری باجە کۆکراوەکانیان بۆ خۆیان زەوت دەکرد و تەنها بەشێکی بچووکیان دەنارد بۆ سوڵتان لە قوستەنتەنییە. زێدەباری ئەمە سیستەمی دادی میرنشینەکان زۆرتر بە ئەمیرەکان گرێدرابوو تا سوڵتان و ئەمیر تەنها بەشێکی بچووکی هێزی سەربازی خۆی تەسلیمی سوڵتان دەکرد. دەرباری عوسمانی بە هۆی سنووری بوونی میرنشینەکان و هەلومەرجی جوغرافیایی ناوچە، سەربەخۆیی میرنشینەکانی بە ناچار تەحەمول دەکرد. سەرەڕای ئەم بارودۆخە ناسەقامگیرە، میرەکان توانیان بەشێکی زۆری خودموختاری خۆیان هەتا سەرەتای سەدەی ١٩ رابگرن.

## راپەڕینەکانی سەدەی ١٩

سیاسەتی ناوەندپارێزی دەرباری ئیمپراتۆری عوسمانی بە درێژایی نیوەی سەدەی ١٩ بووە هۆی ئەوەی چەند بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێر لە میرنشینەکاندا سەر هەڵبدات. یەکەمین‌و گرینگترین راپەڕین لە ساڵی ١٨٠٦ لە میرنشینی بابان سەریهەڵدا. ئەم میرنشینە لە سەدەی ١١ دامەزراو لە سەدەی ١٧و ١٨ دەورێکی لێبڕاوانەی بینی. میرنشینی بابان هەتا رادەیەك پێشکەوتوو بوو بەڵام پاش مەرگی ئیبراهیم پاشای بابان (سەرۆکی عەشیرەتی بابان‌و دامەزرێنەری شاری سلێمانی) دەوڵەتی عوسمانی بڕیاریدا دەسەڵاتی میرنشینی بابان تێکبشکێنێت. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، دەرباری ئیمپراتۆری عوسمانی بەر لە هەموو شتێك هەوڵیدا بێ رەزامەندی عەشیرەتی بابان، کەسێك بخاتە جێگای ئیبراهیم پاشا. پاش ئەم کردەوەیە دوایین برازای ئیبراهیم پاشا واتا عەبدولڕەحمان پاشا بە هاوکاری هەندێك لە عەشیرەتە کوردەکانی هاوپەیمانی، دەستیکرد بە شەڕ دژی هێزە تورکەکان. عەبدولڕەحمان پاشا سەرەنجام پاش سێ ساڵ خەبات، هەرەسیهێناو لە کۆتایی ١٨٠٨ پەنای برد بۆ ئێران.

لە دەیەی ١٨٣٠ راپەڕینێکی دیکە بە رێبەرایەتی میرمحەمەد، فەرمانڕەوای میرنشینی سۆران روویدا. میر محەمەد لە ساڵی ١٨٢٣ لە شوێنی لە دایکبوونی خۆی واتا رەواندوز بە سەرۆکایەتی سوپایەك کە لە ١٠ هەزار سوارو ٢٠ هەزار پیادە پێکهاتبوو، توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو باشووری کوردستاندا بسەپێنێ، بەڵام نەیتوانی لەگەڵ میری بۆتان ببێ بە هاوپەیمان.

سوڵتانی عوسمانی کە پێشکەوتنەکانی میر محەمەد دڵگرانی کردبوو، سەربازەکانی خۆی لە سیواس، موسڵ و بەغداد بانگ کردو ناردنی بۆ شەڕ دژی میر محەمەد. پێکدادان لە نێوان هێزەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی و هێزەکانی میر محەمەد لە هاوینی ساڵی ١٨٣٤ لە رادەبەدەر توند بوو و سەربازانی عوسمانی بێ ئەوەی بگەنە هیچ سەرکەوتنێکی لێبڕاوانە، پاشەکشەیان کرد. میر محەمەد لەم دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و کوردستانی ئێرانی گرت. بە هەرحاڵ سەرەڕای ئەوە کە میر محەمەد هەوڵیدا لە رێگای بە فەرمی ناسینی دەسەڵاتی ئێران، دەوڵەتی ئێران بەرەو لای خۆی رابکێشێت، بەڵام لە کاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێرشی نوێی دەوڵەتی عوسمانی لە هاوینی ١٨٣٦، تەنیا مایەوە. ٤٠ هەزار سەربازی میر محەمەد کە شاری رەواندزیان دەپاراست، سوپای دەوڵەتی عوسمانییان تێکشکاند. لە ئاکامدا فەرمانـدەی سوپای عوسمانی دەست بە داوێنی هەستی ئایینی خەڵك بوو و مەلایەکی کورد بە ناوی مەلای





"خەتی" فتوایەکی لەمەڕ حەرامبوونی شەڕ لە دژی دەزگای خەلافەت دەرکرد. ئەم فتوایە کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر بەلاڕێداچوونی بەرخۆدانی کورد و میر محەمەد ناچار بوو خۆی تەسلیم بکات. میر محەمەدیان برد بۆ قوستەنتەنییە و لە لایەن سوڵتانەوە وەرگیرا، بەڵام پاش یەك ساڵ بە دەستی سوڵتان کوژرا.

راپەڕینێکیش لە ساڵی ١٨٤٠ بە رێبەرایەتی بەدرخان بەگ، میری بۆتان دەستی پێکرد. بەدرخان بەگ لە سەرەتای فەرمانڕەوایی خۆی کە لە ساڵی ١٨٢١ دەستی پێکردبوو، سوپایەکی رێکوپێك و بە دیسیپلینی دامەزراند و لە دوای شکستی عوسمانی لە"نزیب" توانی بەشێکی هەرەزۆری سەرزەوییە کوردنشینەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی بگرێ.

بەدرخان باوەڕی بە ئازادیی بیروڕا هەبوو و رێزی لە یەهودییەکان و مەسیحییەکان دەگرت. هەروەها وەك حوکمڕانێکی لێهاتوو لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا سەقامگیری دەستەبەر کردو دژی بێ سەروبەندیی سیستەمی ئیداری عوسمانی خەباتی دەکرد. لەگەڵ ئەمەشدا بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ سوپای عوسمانی لە ساڵی ١٨٢٤ بەولاوە، میرنشینەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەوی لاواز کرد. هەروەها بە داخوازی سوڵتان، میسیونێرە بریتانی و ئەمریکاییەکان لەگەڵ مەسیحییەکانی عوسمانی پەیوەندییان گرت و هانی دان لەگەڵ سەربازانی عوسمانی شەڕ نەکەن. لە هەموو شتێك خراپتر ئەوە بوو، کە برازای بەدرخان خیانەتی پێکرد. بەدرخان پاش بەرخۆدانێکی درێژخایەن سەرەنجام خۆی تەسلیم کردو لە ساڵی ١٨٦٨ لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد.

شەڕی کریمە لە ساڵی ١٨٥٣، هەلی بۆ بەزدانشێر رەخساند تا پیلانی خۆی بۆ سەربەخۆیی کوردستان لە ژێر پاشایەتی خۆیدا جێبەجێ بکات. راپەڕینی بەزدانشێر لە ساڵی ١٨٥٥ بە گیرانی بتلیس بە دەستی ٢ هەزار پیاوی شەڕکەر، دەستی پێکرد. لە هەمان هێرشدا، بەزدانشێر، موسڵ و سەربازخانەکەی ـ کە دەیتوانی ٣٠ هەزار سەرباز تەیار بکات ـ گرت. تەنانەت سوپایەکی بچووکی بەزدانشێر توانی پارێزگای سێرت (شوێنی ستراتیژیی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی) بگرێت، سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتن، بەڵام زستانی ١٨٥٥و پاشەگەزبوونەوەی هێزەکانی رووسیا، دەستی دەرباری ئیمپراتۆری عوسمانی بۆ سەرکوتی راپەڕینی کوردەکان کردەوە. هێزەکانی بەزدانشێر سەرەنجام بڵاوبوونەوە. هۆکاری لێبڕاوانەی ئەم بڵاوەلێکردنە، کردەوەکانی دیپلۆماتەکانی بریتانیا لە شەڕی ئیمپراتۆری عوسمانی دژی روسیا بوو. نوێنەرێکی بریتانیایی لە لایەن بەزدانشێرەوە وەرگیراو هەلی بۆ رەخسا تا هەندێك لە سەرۆك عەشیرەتەکان بە پارە بکڕێ تا شەڕ نەکەن. بەهەرحاڵ بەپشتبەستن بە بەڵێنەکانی

دەوڵەتی ئینگلیز، بەزدانشێر زنجیرەیەك وتووێژی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی کردو هەر لەوێ گیراو خرایە بەندیخانە.

راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵا زۆرتر ئایینی بوو تا عەشیرەتی. شێخ عوبەیدوڵڵا کە سەرۆکی تەریقەتی نەقشبەندی بوو لە ساڵی ١٨٧٢ بە هۆی کێشەی ئەو باجە قورسانە کە شای ئێران لە ساڵی ١٨٣٦ لە کوردەکانی سەندبوو، بوو بە نەیاری دەوڵەتی ئێران. نوێنەری عوسمانی نارەزایەتییەکانی شێخ عوبەیدوڵڵای گەیاندە دەوڵەتی ئێران، بەڵام هیچ کاریگەرییەکی نەبوو و خەڵك ناچارکران بە پێچەوانەی رابردوو کە باجیان بە شێخ دەدا، لەو کاتەوە بەدواوە باج بە دەوڵەتی ئێران بدەن. بە هەرحاڵ دوایین داپچڕانەکانی نێوان شێخ عوبەیدوڵڵاو دەوڵەتی عوسمانی پاش شەڕی روسیاو تورکیا لە ساڵەکانی ٧٨ـ١٨٧٧ کە شێخ بەشداری تێدا کرد، روویدا و قاتوقڕی و گەندەڵی سیستەمی ئیداری ئیمپراتۆری عوسمانی، شێخی هان دا راپەڕێت. شێخ پاش ئەوەی هەوڵی دا پشتیوانی شەریفی مەککەو خەدیوی میسر بە دەستبهێنێت، رووی لە روسیاو پاشان بریتانیا کرد بەڵام سەرنەکەوت. لەگەڵ ئەمەشدا دەوڵەتی بریتانیا هێزی سەربازیو چەك و تەقەمەنی دا بە شێخ. دەوڵەتی عوسمانییش بەو هیوایە کە شێخ عوبەیدوڵڵا دژی دەوڵەتی ئێران راپەڕین دەکات نە دژی ئیمپراتۆری عوسمانی، بڕیاری دا دەستێوەردان نەکات. شای ئێران نەیدەتوانی قەناعەت بە سوڵتانی عوسمانی بهێنێ کە بوونی ئەو رادە بەرچاوەی بزووتنەوەی کورد بۆ هەردوو لایان مەترسیدارە.

هێرشی شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ ئێران لە ساڵی ١٨٨٠ دەستیپێکرد. شارە کوردنشینەکانی مەهاباد و میاندوئاو گیران، بەڵام سەربازانی کورد لە باتی گرتنی تەورێز دەستیانکردە تاڵان.

لە دوای ئەوەی کە شێخ عوبەیدوڵڵا لەگەڵ سەربازانی بە دیسیپلین و بەهێزی تورك، فارس و کورد رووبەڕوو بووەوە، ناچار بوو لە ئێران هەڵبێت و پاش ئەو هەوڵە بێئاکامانەی کە بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی روسیا دای، لە ساڵی ١٨٨٢ پاش ئەوەی ماوەیەك لە قوستەنتەنییە لە ژێر چاودێریدا بوو، بۆ مەککە دوورخرایەوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد.

## لە دایکبوونی ناسیۆنالیزمی کورد

چەمکی "ناسنامەی کورد" بەر لە هەموو شتێك لە شیعرەکانی ئەحمەدی خانی- کە کەسایەتی سەرەکیی کولتووری ئەدەبیی کوردە و هێشتا لە نێو خەڵکدا خۆشەویستە- بەدی دەکرێت.



هەتا سەدەی ٢٠ سەرمەشقی یەکڕیزی کوردەکان، ئەندامێتی لەو بزووتنەوانەدا بوو، کە لە لایەن هێزێکی کاریزماتیکەوە هان دەدرا و هەر کاتێ کە ئەم هێزە لە ناودەچوو، بزووتنەوەی کوردیش دەڕووخا. کەوابوو ناسیۆنالیزمی کورد لە سەدەی ١٩ لە هەنگاوی یەکەمدا خۆی لە هەوڵدان بۆ دامەزرانی میرنشینە سەربەخۆکان لە ناو ئیمپراتۆری عوسمانی و ئێران نیشان دا. پاش لەناوچوونی میرنشینەکان، بۆشاییەك پەیدا بوو کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٩ لە لایەن رێبەرە نوێیەکان- واتا شێخەکان کە لەو کاتە بە دواوە بوون بە رێبەری هەموو راپەڕینە گرینگەکان- پڕ کرایەوە. پاش لەناوچوونی پێگەی کۆمەڵایەتیی لاوازی شێخەکان لە ناو گوندییەکان، ئەو بزووتنەوانەی کە ئەوان رێبەرایەتیان دەکرد و ئەو کاتە وڵاتپارێزانەو وادەباوەڕانە بوون، کۆمەڵێك رەنگدانەوەیان هەبوو.

ئاوێتەبوونی ئەم شۆڕشە چارەڕەشانە، چەمکێکی لە ناسنامەی کورد خستەروو، کە بوو بە پێشەکییەك بۆ پەرەسەندنی ناسیۆنالیزمی نۆژەن لە سەدەی ٢٠. تایبەتمەندی ئەم سەرهەڵدانانە ئەوەبوو کە رێبەرانی سەر بە بنەماڵە شێخە مەزنەکان (بۆ نموونە بارزانی و تاڵەبانی) سەرۆکیان بوون کە دەیانتوانی حیساب بۆ یەکێتییە باوباپیرییەکان و هەروەها دوژمنایەتییە لە مێژینەکان بکەن. بەگشتی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد نەیتوانی بەسەر پارچە پارچە بوونی کۆمەڵگادا زاڵ ببێتو حیزبە ناسیۆنالیستەکان لاواز بوون و تووشی لەتبوون و دابەشبوون هاتن.

بیرۆکەی نەتەوەی کورد، دیاردەیەکی تا رادەیەك نوێیەو سەرهەڵدانی ئەم بیرۆکەیە دەگەڕێتەوە بۆ دەستهەڵگرتن لە چەمکی "ئۆمەتی ئیسلامی". بەهەرحاڵ هەر وەك تورکەکان، زۆربەی کوردەکان سوننەنو لە سەردەمی ئیمپراتۆری عوسمانی پەیوەندییان لەگەڵ خەلافەتدا هەبوو. هەر بەم هۆیەوە بوو کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦ـ١٩٠٨) بە شێوازێکی لێزانانە لەم یەکڕیزییە کەڵکی وەرگرت و لە رێگای دامەزراندنی سوپای سوارەی حەمیدییە، کوردەکانی کرد بە هاوپەیمانی دەوڵەتی عوسمانی. لە ساڵی ١٨٩١ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم میلیشیا عەشیرەتییەکانی ناسراو بە "حەمیدییە"ی پێکهێنا. رێبەرانی "حەمیدییە" سەرۆك عەشیرەتەکان بوون و ئامانجیشی زەمانەتکردنی دەسەڵاتی سوڵتان بەسەر پارێزگاکانی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی بوو. ئەمە بوو بە هۆی پتەوتربوونی دەسەڵاتی رێبەرە عەشیرەتییەکانو وای لە هەندێکیان کرد، کە دەسەڵاتی خۆیان قایمتر بکەن.

سیاسەتی سوڵتانی عوسمانی کە لەسەر بنەمای پاراستنی ئاسایشی ناوچە دژی ئەرمەنییەکانان و دەستەبەرکردنی وەفاداری شەخسی بە سوڵتان بوو، سەرکەوتوو بوو."حەمیدییە" دەورێکی گرینگی لە کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لەساڵی ١٨٩٦و ١٨٩٧دا بینی. پاش بە دەسەڵات گەیشتنی تورکە گەنجەکان لە ساڵی ١٩٠٨، رێکخراوی حەمیدییە بە فەرمی هەڵوەشایەوە بەڵام پاش ماوەیەکی کورت، یەکینە (وحدە) ی سەربازە عەشیرەتییەکانی "حەمیدییە" لە ژێر ناوی هێزە میلیشیاکان سەرلەنوێ بە رێکخستن کرانەوەو لە شەڕی باڵکان لە ساڵەکانی ١٩١٢ـ١٩١٣ بەشدارییان کرد.

بیرۆکەی ئەوروپایی ناسیۆنالیزم لە کۆتایی سەدەی ١٨ بە شۆڕشی فەرەنسا لە دایك بوو و لە دەیەی ١٨٨٠ لە نێو چین و توێژی خوێندەواری کۆمەڵگای عوسمانی پەرەیسەند.

یەکەم رۆژنامەی کوردی بە ناوی "کوردستان" لە ساڵی ١٨٩٨ لە لایەن مەدحەت بەدرخان بەگەوە دامەزرا. ئەم رۆژنامەیە بە دوو زمانی تورکی و کوردی بڵاودەبووەوە و رەخنەی لە ئیمپراتۆری عوسمانی دەگرت. رۆژنامەی "کوردستان " سەرەتا لە ئەورووپاو پاشان لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهان لە قاهیرە بڵاو دەبووەوە.

"ئەنجوومەنی تەعالی و تەرەقی کوردستان" وەك یەکەم رێکخراوی کوردی لە ساڵی ١٩٠٨ دامەزراو دامەزرێنەرەکانی بریتی بوون لە ژەنەراڵ شەریف پاشاو کوڕێکی شێخ عوبەیدوڵڵا. بە هەرحاڵ پرۆگرامە هیوابەخشە سەرەتاییەکانی ئەم رێکخراوەیە بۆ پەرەپێدانی پەروەردەو خوێندەواری کوردی بە هۆی ململانێیە ناوخۆییەکانی دامەزرێنەرەکانی، پووچەڵ بوونەوە.

شۆڕشی "تورکە گەنجەکان" لە ساڵی ١٩٠٨ کە سەرەتا داکۆکی لە ئازادیی نەتەوەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی دەکرد، پاش ماوەیەکی کورت دەستیکرد بە سیاسەتی پان تورکیو ناسیۆنالیزمی توندئاژۆ. لە خودی کوردستانیش ناسیۆنالیستە گەنجەکان لە کۆڕوکۆمەڵە کوردەکانی بتلیس، موش، دیاربەکر، ئەرزەرۆم و موسڵ لە دەوری یەك کۆدەبوونەوە، بەڵام کردەوە سەرکوتکەرەکانی "تورکە گەنجەکان" کە لە ساڵی ١٩٠٩ دەستی پێکرد، نەیهێشت بزووتنەوەی کورد پێش بکەوێت. لە دوای ئەوە، رێبەرە سەرەکییەکانی بزووتنەوە خرانە بەندیخانە یان لە سێدارە دران.

ئەم سەردەمە بۆ بزووتنەوەی کورد و هەروەها بزووتنەوەی عەرەبەکان و ئەرمەنییەکان، سەردەمێکی پڕ لە دەستکەوت بوو. بە هۆی گۆڕانی سیاسەتی تورکە



گەنجەکان، ئەنجوومەنی "هیوای کورد" کە تا ئەو کاتە ئەنجوومەنێکی نهێنی بوو، بوو بە ئەنجوومەنێکی ئازاد. بزووتنەوەی "هیوای کورد" لە سەردەمی رێبەرایەتی خەلیل حەسەن موکتی ـ کە پاشان بوو بە لایەنگری سیاسەتی تاواندنەوەی تورکیا ـ بڵاڤۆکێکی بە ناوی "رۆژا کورد" بڵاو کردەوە.

## ئایدیۆلۆژی فەرمیی مۆدێلی کەمالیزم

ئایدیۆلۆژی فەرمیی تورکیا لە سەردەمی مستەفا کەماڵ، دامەزرێنەری تورکیای نوێ تا ئێستا هەر وەك خۆی ماوەتەوە.

مۆدێلی نەریتیی تاواندنەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی لەسەر بنەمای ڕێکخراوی نەتەوەکان واتا "امت" بوو و کۆمەڵگا ئایینییە غەیرە موسڵمانەکان (ئەرمەنی، ئاشووری، یۆنانی و یەهوودییەکان) لە لایەن کڵێساوە بەڕێوەدەچوون. بەهەرحاڵ سیاسەتی پان ئیسلامی عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦ـ ١٩٠٨) بووە هۆی خراپتربوونی ناکۆکییە ئایینییەکان و کێشمەکێشە ناسیۆنالیستییەکان، بە تایبەت یەکەمین کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لە ساڵەکانی ١٨٩٥و ١٨٩٦. زێدەباری ئەمە هەستی ناسیۆنالیستی تورکەکان لە دەیەی ١٨٨٠ سەریهەڵداو سەرەڕای پێکەوە هەڵکردنی سەرەتایی تورکەکان لەگەڵ کەمینەکان- بە تایبەت ئەرمەنییەکان- بە دەسەڵات گەیشتنی "تورکە گەنجەکان" لە ساڵی ١٩٠٨ دەستپێکردنی دەسەڵاتداری ئایدیۆلۆژی ناسیۆنالیستی لە تورکیا نیشان دا. لە سەردەمی پاش شەڕ کەمالیستەکان بەشێکی زۆر لە سیاسەتی دژی ئەرمەنی "تورکە گەنجەکانیان" بە میرات برد.

هەڵوێستی کەمالیستەکان بە نیسبەت کوردەکان سەرەتا بە تەواوی روون نەبوو. کورد پاش دەرکردنی یۆنانییەکان و قەڵاچۆکردنی بەکۆمەڵی ئەرمەنییەکان، تەنها نەتەوەی غەیرە تورك بوون کە لە وڵاتی تورکیا مابوونەوە. ئەو کاتە سیاسەتی نەریتیی حکوومەتی عوسمانی لەسەر بنەمای پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچە کوردییەکاندا بوو تا بە تورککردنی کوردەکان. لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٩ تا ١٩٢٣ وا دیار بوو، کە کەمالیستەکان بە شوێن هەمان سیاسەتدا بوون، بەڵام ئەمە تەنها هاوپەیمانییەکی تاکتیکی بۆ کەمالیستەکان بوو. ئەم سیاسەتە وای لە دەوڵەتی تورکیا کرد تا ٦ پارێزگای زۆرتر کوردنشین کە ئەرمەنییەکان بانگەشەی دەکردن، رابگرن.

لە راستیدا یەکەمین سەرکەوتنی سیاسی مستەفا کەمال لە "کۆنگرەی ئەرزەرۆم" لە تەمموز و ئابی١٩١٩- کە ٥٤ نوێنەر لە ٥ ویلایەتی کوردنشینی ئەرزەرۆم، بتلیس، وان، موش و ئەرزینجان تێیدا بەشدارییان کرد- پەسەندکردنی سیاسەتی توندی پان ئیسلامیی و دژی



ئەرمەنی بوو. تەنانەت کاتێك کە یۆنانییەکان پاشان هێرشیان کردە سەر ئەنادۆڵی، کوردەکان بە شێوازێکی هەمەلایەنە لە شەڕ دژی یۆنان بەشدارییان کرد.

لە یەکی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ یەکەمین سەرکەوتنی سەربازیش بەدەستهات:" مستەفا کەمال بە پەڕلەمانی راگەیاند حکوومەت، حکوومەتی تورکەکانە". کەوابوو کورد وەك تەنها کۆمەڵگایەك کە کیانی تورکیایان وەك دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی نیمچە ئیتنیکیی یەکدەست دەخستە ناو مەترسی، سەرکوتکران (پاشان باسی دەکەین).

هەڵوەشانەوەی خەلافەت لە ساڵی ١٩٢٤و هێرشکردنە سەر ئیسلام (لە کاتێکدا کە هەوڵی دەدا ببێ بە ئیسلامێکی سیاسی) ئەو ئەڵقانەی پچڕاند کە کوردەکانی بە دەوڵەتی ناوەندییەوە گرێ دەدا. ناسیۆنالیزمی کورد کە هەندێك جار لەگەڵ تینوگڕی ئایینییەوە گرێ درابوو، بەتوندی کاردانەوەی نیشان داو مەلاکانیش پشتیوانیان لە بزووتنەوە کوردییەکان (وەك نەیارانی کەمالیزمی عەلمانی) دەکرد. ئەو رۆژئاواچێتییە خێراو توندەی کەمالیزم لەگەڵ پێکهاتەی نەریتیی کۆمەڵگای کورد نەیدەسازی.

پرۆگرامی نەتەوەسازی مستەفا کەمال ئەتاتورك، ئەوی هان دا تا دەست بکا بە سازکردنی مێژوویەکی ئەفسانەیی بۆ تورکیا، واتا پوچگەرایی. بەپێی ئەم پرۆگرامە، تورکەکان لە رەگوڕیشەدا لە ئاسیای ناوەڕاست هاتوونەو دامەزرێنەرانی شارستانییە مەزنەکانی سۆمەر، بابل و هیتی لە ئاسیای ناوەڕاست و میزۆپۆتامیان. کەوابوو لەم خەون و خەیاڵی ناسیۆنالیزمە توندڕەوانەیەدا، کورد بە ئاسانی بوونیان نییە. بە بیروبۆچوونی مێژوونووسانی فەرمیی کەمالیست، کورد لە رەگۆڕیشەدا تۆرانین کە ٥ هەزار ساڵ پێش لە ئاوڕێژگەکانی ئاسیای ناوەڕاست هاتوونە و زمانەکەشیان چەواشەیەك لە تورکی ئاوێتە لەگەڵ عەرەبی و فارسییە. تەنانەت لە کۆتایی ساڵی ١٩٦١، ژەنەراڵ گورسەل کە سەرۆکی یەکێك لە دەستە سیاسییەکانی دەسەڵاتدار بوو، وتی کوردەکان لە رەگوڕیشەدا تورکن[١٥]. سوپای تورکیا کە پارێزەری گڕوتینی پیرۆزی کەمالیستییە لەگەڵ هەر چەشنە بە فەرمی ناسینێکی دیاردەی کورد دژایەتی دەکات. هەتا ئەم دواییانە لە باتی کورد، دەستەواژەی "تورکە شاخاوییەکان" بە گشتیی لە تورکیا بەکاردەبردرا.

١٥- لە بەرامبەر ئەم لێدوانەی ژەنەراڵ گورسەل، کۆمەڵێك خۆپیشاندان لە کوردستانی تورکیا بە تایبەت لە شارەکانی ماردین، دیاربەکر، هەکاری، بیتلیس و وان بەڕێوە چوو. خۆپیشاندەران دروشمیان دەدا "ئێمە تورك نین، ئێمە کوردین و نەمان بۆ گورسەل". سوپای تورکیا خۆپیشاندەرانی دایە بەر دەستڕێژی گوللە کە لە ئەنجامیدا کۆمەڵێك خەڵك لە ماردین و دیاربەکر کوژران و برینداربوون. (وەرگێڕ)

## بەکارهێنانی ئامرازی یاسا دژی کوردەکان

پەیماننامەی لۆزان کە لە ٢٦ی تەمموزی ١٩٢٣ ئیمزا کرا، بووە هۆی لە دایکبوونی تورکیای نۆژەن. ئیمزاکەرانی ئەم پەیماننامەیە واتا بریتانیا، فەرەنسا، ئیتالیا، ژاپۆن، رۆمانیا، عەرەبستان و تورکیا چوارچێوەی یاسایی وڵاتی تورکیایان دارِژت، کە هێشتا هەر وەك خۆی ماوەتەوە. بە تایبەت بەشی سێهەمی پەیماننامەکە (ماددەی ٣٧ تا ٤٤) باسی پاراستنی کەمینەکان دەکات و دەڵێت:

"نابێ هیچ چەشنە کەند و کۆسپێك لە لایەن نەتەوەی تورك لەسەر بەکارهێنانی ئازادی هەموو زمانەکانی دیکە لە رووی قسەکردن یان کەڵکوەرگرتن لە کاروباری ئایینی، بازرگانی، چاپی کتێب و بڵاوکردنەوەی چاپەمەنیدا دروست بکرێت. لەپاڵ زمانی فەرمی دەبێ ئاسانکاری پێویست بۆ نەتەوەکانی وڵاتی تورکیا کە بە زمانی تورکی قسە ناکەن، بکرێ تا لە دادگاکاندا بە شێوازی زارەکیی، کەڵك لە زمانی خۆیان وەربگرن" (ماددەی ٣٩).

بەهەرحاڵ ئەم خاڵانە تەنها کەمینە ئایینییە جولەکە و مەسیحییەکان لەخۆ دەگرن. لەم سەردەمەدا ٧٥ نوێنەری کورد بە نوێنەرایەتی ئەنجوومەنی نەتەوەی باڵای تورکیا لە ئەنقەرە هەڵبژێردران. پاشان لە ساڵی ١٩٢٤ قسەکردن و بڵاوکردنەوە بە زمانی کوردی قەدەغەکراو یاسای بنەڕەتی ئەم ساڵە، ئەفسانەی دەستکردی مستەفا کەمالی پەسند و پیرۆز کرد، کە دەیگوت "تورکیا تەنها هی تورکەکانە".

لە پێشەکی یاسای بنەڕەتی ئێستای تورکیادا کە پاش کودەتا سەربازی ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ لە لایەن ئەنجوومەنی نەتەوەییەوە پەسەندکراوە، هاتووە کە: "شێلگیربوون لەسەر پشتیوانی نەکردن لە بیروراو بیروبۆچوونەکانی دژی بەرژەوەندی نەتەوەیی تورکیاو باوەڕی شێلگیرانە بە پرەنسیپی مانەوەی تورکیا وەك کیانێکی لەتنەکراو لەگەڵ دەوڵەت، سەرزەوی، بەها مێژوویی و ئەخلاقییەکانی تورك، ناسیۆنالیزم، پرەنسیپەکانی چاکەسازی و نۆژەنگەرایی ئاتاتورك".

کەوابوو بیروبۆچوونی دامەزرێنەرانی تورکیای نۆژەن بە واتای قبووڵ نەکردنی مافە کولتوورییەکانی کوردە.

دوو ماددەی یاسای بنەڕەتی تورکیا بە شێوازی ناڕاستەوخۆ قسەکردن بە زمانی کوردی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە چاپکراوەکان بەم زمانە قەدەغە دەکات: ماددەی ٢٦ دەڵێت:

"هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە بیروبۆچوون و بیروراکانی خۆی لە رێگای وتن، نووسین، وێنە و میدیا گشتییەکانی دیکە بە شێوازی تاکی یان گرووپی دەربرێت، بەڵام لە دەربڕینی



بیرورا لە زمانە قەدەغەکراوەکان کەڵك وەرناگیردرێت. بەڵگە دەستنووس یان چاپکراوەکان، وێنەکان، نەوارە موگناتیسی یان ڤیدیۆییەکان و کەرەستەکانی دیکەی دەربڕین ئەگەر دژی یاسابێ بە حوکمی قازی و ئەگەر درەنگ کردن ببێتە هۆی زەرەر، لە لایەن کاربەدەستانی پێوەندیداری یاساییەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت"

ماددەی٢٨ دەڵێت:

"چاپەمەنییەکان ئازادن و سانسۆر ناکرێن. دامەزراندنی چاپخانە پێویستی بە گرتنی مۆڵەت و زەمانەت نییە. گۆڤار و رۆژنامە بە زمانە قەدەغەکراوەکان بڵاو نابێتەوە. دەوڵەت دەبێ رێوشوێنی پێویست بۆ زەمانەتکردنی ئازادیی چاپەمەنی و زانیارییەکان بگرێتەبەر. رێوشوێنەکانی ماددەی ٢٧و ٢٨ی ئەم یاسایە لە چوارچێوەی ئازادیی چاپەمەنیدا، شیاوی بەکارهێنانن".

بۆ کوردەکان مافی دامەزراندنی ئەنجوومەن و کۆمەڵەکان لە کردەوەدا لە لایەن یاسای ژمارە ٧٦٥ کە لە رۆژنامەی فەرمی کۆماری تورکیا لە مانگی ئاداری ١٩٨٦ بڵاوبووەتەوە، قەدەغەکراوە. ماددەی ١٤١و ١٤٢ کۆمەڵێك رێوشوێنی سەرەکی لەخۆدەگرێ و دەڵێ:

"هەر چەشنە هەوڵێکی رەگەزی بە مەبەستی رێگریکردن یان لە ناوبردنی ئەو مافانە کە یاسای بنەڕەتی بە رەسمی ناسیونی، دامەزراندن یان هەوڵدان بۆ دامەزراندنی رێکخراوگەلێك بۆ لاوازکردن یان گرینگی نەدان بە هەستی نەتەوەییو رێبەرایەتیکردن یان سەرپەرەشتیکردنی ئەم رێکخراوانە، سووچە و تاوانباران بە سزای ٨ تا ١٥ ساڵ زیندان، حوکم دەدرێن".

ماددەی ١٤١ -١٤٥ دەڵێت:

"کەسانێك کە دەبن بە ئەندامی رێکخراوگەلێکی وەها لە ٥ تا ١٢ ساڵ زیندان حوکم دەدرێن".

ماددەی ١٤١-١٤٦ دەڵێت:

"ئەم قۆناخە زیندانە لەم کاتانەی خوارەوە بە رادەی یەك لە سێ زیاتر دەبێ: کاتێك کە سووچە ناوبراوەکان لە چوارچێوەی دەسەڵاتی حکوومەت، دامەزراوە شارییەکان، قوتابخانەکانو دامەزراوەکانی خوێندنی باڵا، یەکێتیو رێکخراوە کرێکارییەکانی دیکە و بیناکانی رێکخراوگەلێك کە سەرجەم یان بەشێکی زۆری سەرمایەکەیان هی دەوڵەتە، ئەنجام بدرێت. هەروەها ئەگەر فەرمانبەران و کارمەندانی ئەم کۆمەڵانە و هەموو رێکخراوێك کە لە کۆی دوو کەس یان زۆرتر کە بە شوێن ئامانجێکی هاوبەشدان، پێکبێ، ئەم سووچانە ئەنجام بدەن ".

ماددەی ١٤٣-١٤٢ دەڵێت:

"هەر کەسێك کە بەپشتبەستن بە رەگەز بۆ رێگرتن یان بنبڕکردنی ئەو مافانەی کە یاسای بنەڕەتی قەبوولّی کردوون، هەوڵ بدات یان هەستی نەتەوەیی لاواز بکات و بچووکی نیشان بدات، بە زیندان لە ٥ ساڵ تا ١٠ ساڵ حوکم دەدرێت".

ماددەی ٤ـ١٤٢ دەڵێت:

"هەرکەس بە هۆی ستایشکردنی کردەوە ناوبراوەکان تاوانبار بناسرێت بە زیندان لە ٢ تا ٥ ساڵ حوکم دەرێت".

ماددەی ٥ـ١٤٢ دەڵێت:

"سووچە ناوبراوەکان ئەگەر لە بارودۆخ و رێوشوێنەکانی ماددەی ٦ـ١٤١ روویدات، ماوەی زیندانەکەی هەتا رێژەی ١ لە ٣ی دیکە زیاد دەکرێت".

ماددەی٦ـ١٤٢ دەڵێت:

"ئەگەر هەرکام لە سووچە ناوبراوەکان بە شێوازی هاوبەش ئەنجام بدرێت، سزاکەی ١ لە ٣ی دیکە زیاد دەکرێت".

مافی دامەرزاندنی حیزبە سیاسییە کوردییەکان و گەشەپێدانی کۆمەڵە کوردییەکان لە لایەن یاسای ژمارە ٢٨٢ کە لە بارەی رێوشوێنەکانی یاسایی حیزبە سیاسییەکانە کە لە ٢٤ی نیسانی ١٩٨٣ بلاوبووەتەوە، قەدەغەکراوە. ماددەی١٨١ی ئەم یاسایە دەڵێت:

"حیزبە سیاسییەکان: ١ـ ناتوانن بڵێن لە ولاتی تورکیا لە بواری نەتەوەیی، کولتووری، ئایینی، گرووپی، نژادی و زمانی هەڵاواردن هەیە. ٢ـ ناتوانن بە پێکهێنانی کەمینەگەلێك لە ولاتی تورکیا لە رێگای پاراستن، گەشەپێدان و بلاوکردنەوەی زمان و کولتووری غەیرە تورکی بە شێوازی نووسین و بلاوکردنەوەی بەرنامەو پرۆگرام، پەیڕەوی ناوخۆ، کۆبوونەوەو پرۆپاگەندا، یەکێتی نەتەوەیی لاواز بکەن. ٣ـ ناتوانن لە هیچ پلاکارد، زناك، پۆستر، پرۆگرامی تۆمارکراو یان فیلم و بروشورێك بە زمانی غەیرە تورکی کەڵك وەربگرن یان بلاوی بکەنەوە. هەروەها ناتوانن بە نیسبەت کردەوەگەلێکی وەها کە کەسانی دیکە ئەنجامی دەدەن بێدەنگ بن، بەلام دەتوانن پەیڕەو پرۆگرامی خۆیان وەربگەڕێننەوە سەر زمانە بیانییەکان، ناوێزەی ئەو زمانانەی کە یاسا قەدەغەی کردوون".

ئەم شەرت و مەرجە بەگوێرەی یاسایەکی دیکە واتا یاسای ژمارە ٢٣٩٢ کە سەبارەت بە چاپ و بلاوکردنەوە بە زمانە غەیرە تورکییەکانە کە لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی١٩٨٣دا



پەسەندکراوە، قایمکراوە. خاڵی ٢ی ئەم یاسایە بەتایبەت دەڵێت: "دەربڕین و بلاوکردنەوەی بیروبۆچوونەکان بە هەموو زمانێك جگە لە زمانی رەسمی و سەرەکیی تورکیا قەدەغەیە".

مەبەستی ئەم یاسایە زمانی کوردییە کە لە دوای رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ وەك دووەمین زمانی رەسمی ولاتی عێراق قەبووڵ کرابوو. ئەم یاسایە کاری کردە سەر قەدەغەبوونی چاپ و بلاوکردنەوەی هەموو بەرهەمە چاپکراوەکان بە زمانی کوردی کە لە عێراقەوە دەهاتە نێو تورکیا.

خاڵی ٣ی ئەم یاسایە راستەوخۆ پەیوەندی بە لۆژیکی کەمالیستەوە هەیە و دەڵێت:

"زمانی زگماکی هاوولاتیان تورکیا، تورکییە. قەدەغە: ١ـ بەکارهێنانی هەموو زمانێك جگە لە زمانی تورکی وەك زمانی زگماکی و بەشداریکردن لە هەر چالاکییەك کە مەبەستی پەرەپێدانی ئەم زمانانە بێت".

بە گوێرەی ئەم یاسایە نووسینی هەر چەشنە پلاکارد، ئالا، نیشان، تابلۆ، پۆستەر و وەکو ئەمانە بە زمانی غەیرە تورکی لە کۆبوونەوە گشتییەکان و ئەنجوومەنەکان قەدەغە، جگە لە دیسکت، دەنگی بەرنامە تۆمارکراوەکان، فیلم و کەرەستەکانی دیکەی دەنگ و رەنگ کە بۆ دەربڕین و بلاوکردنەوەیان دەبێ لە بەرزترین کاربەدەستی ولات لە ناوچە مۆڵەت وەربگیردرێت. سەرپێچیکەران لەم یاسایە بە ٦ مانگ تا ٢ ساڵ زیندان یان سزای ١٠٠ هەزار لیرەی تورکیا حوکم دەدرێن. لە پێناوی هەمان ئامانج، بڕیاری دەوڵەتیی ژمارە ٨٣/٦٠٠٦ کە لە ٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٣ بلاوبووەتەوە، ئەو فیلمانەی کە مەبەستیان لاوازکردنی یەکپارچەییو یەکێتی نەتەوەیی لە رێگای پێکهێنانی ناکۆکی زمانیی، نژادیی و ئایینییە قەدەغە کردووە.

ئەم یاسانە هێشتا نەگۆڕاون. بەهەرحاڵ لە دوای لێدوانە رەسمییەکانی رێبەرانی تورکیا سەبارەت بە قەبووڵکردنی "راستیی کورد" گۆڕانی ئەم یاسایانە دەبێ ئێستا بکەوێتە بەر باس و گفتوگۆ.

## چەند نموونەیەك لە سەرکوتی سیاسی و کولتووری کوردەکان

ساڵی ١٩٦٦ ئەمین بوزئەرسەلان کتێبێکی ئەلفوبێی بۆ منداڵانی کورد بلاوکردەوە کە دەستبەجێ دەستی بەسەردا گیراو قەدەغەکرا. لە ساڵی ١٩٧٣ "فرانز ریسیچ"، فەرمانبەری کۆمپانیای "لوفتهانزا" بە تاوانی ئەوەی کە وشەی کوردستان بە هەڵە لە یەکێك لە ریکلامەکانی ئەو کۆمپانیایە بەکارهێنرابوو، زیندانیکرا. هەروەها گرووپێکی رێکخراوی

پزیشکانی سنوورنەناس بە تاوانی هەڵگرتنی کاسێتێك بە زمانی کوردی و کۆمەڵێك بەڵگە بە زمانی فەرەنسی دەربارەی کوردەکان بۆ ماوەی ٥ مانگ خرانە زیندان. تەنانەت مۆسیقای کوردیش کە UNESCO (ڕێکخراوی زانستی و کولتووری نەتەوە یەکگرتووەکان) وەك مۆسیقای نەریتیی تۆماری کردووە، هێشتا لە تورکیا قەدەغە.

بابەتی سەرنجڕاکێشی کۆمەڵناسی تورك، ئیسماعیل بێشکچی، بێهوودەبوونی سیستەمی سەرکوتی دەوڵەتی تورکیا بە ڕوونی نیشان دەدات. ئەم زانستوانە تورکە پتر لە ١٠ ساڵ لە تەمەنی خۆی بە تاوانی نووسینی کۆمەڵێك شت دەربارەی کورد لە زیندان تێپەڕ کردووە. ئیسماعیل بێشکچی ساڵی ١٩٣٩ هاتووەتە دنیا، لە کۆلیژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرا خوێندوویەتی و پاش ئەوەی کە بۆ ئەنجامدانی خزمەتی سەربازی چووە ئەنادۆڵی، بڕیاری دا تێزی دۆکتۆراکەی لەسەر کورد بنووسێت کە لە ساڵی ١٩٦٩ لەژێر ناوی "بنەما کۆمەڵایەتی، ئابوری و ئێتنیکییەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵی" بڵاو بووەوە. بەهەرحاڵ سەرەڕای ئەوەی کە ئەم لێکۆڵینەوەیە هیچ چەشنە گیروگرفتێکی زانستی لێنەکەوتەوە، بێشکچی بە تاوانی پڕوپاگەندای کورد و کۆمۆنیزم لە سەرکاری خۆی لە زانکۆی ئەرزەڕۆم دەرکراو زیندانیکرا.

خولی یەکەمی زیندانی بێشکچی کە لە ساڵی ١٩٧١ هەتا ١٩٧٤ درێژەی هەبوو، لە دوای دەرچوونی فەرمانی لێبووردنی گشتیی سەرۆك وەزیرانی نوێی تورکیا (بولەنت ئەجەویت) کۆتایی پێهات. بیشکچی لە دوای بڵاوکردنەوەی ٣ بەرهەمی دیکە دەربارەی کورد خولی دووەمی زیندانی خۆی لە ساڵی ١٩٧٩ هەتا ١٩٨١ تێپەڕ کرد. بێشکچی دوو مانگ پاش ئازادی بە تاوانی ناردنی نامەیەك بۆ سکرتێری یەکێتی نووسەرانی سویسرا دیسان گیراو زیندانیکرا. بێشکچی لەم نامەیەدا لە ئایدیۆلۆژی فەرمی حکوومەتی تورکیا کە ببووە هۆی سەرهەڵدانی مەسەلەی کورد، ڕەخنەی گرتبوو.

ئازادیی چاپەمەنیش لە تورکیا بە یاسا سنووردار کراوە. ڕۆژنامەی "ئیلری یورت" (وڵاتی پێشکەوتوو) کە لە تورکیا چاپ دەکرا، یەکەمین جار لە پاییزی ساڵی ١٩٥٨ بە تاوانی وەسفکردنی بارودۆخی دژوار و ئاستەمی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات، داخرا. تەنانەت لە کانوونی یەکەمی ١٩٥٩ بەرپرس و پتر لە ١٥ کەس لە نووسەرانی دیکەی ڕۆژنامەکە گیران. لە نیوەی دووەمی دەیەی ١٩٧٠ بەرپرسی ئەم ڕۆژنامەیە بە تاوانی هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەك بە زمانی کوردی بە ١٢ ساڵ زیندان حوکم درا. هەروەها ڕۆژنامەی "ڕۆژا وەڵات" سەر بە حیزبی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیا داخرا. بەرپرسو



ڕۆژنامەنووسی ئەم ڕۆژنامەیە بەناوی محەمەد عەلی بیراند کە لەگەڵ عەبدوڵڵا ئوجەلان (ئاپۆ)، ڕێبەری پارتی کرێکارانی کوردستان، وتووێژی کردبوو بە سوچی پڕۆپاگەندای دژە نەتەوەیی بە گوێرەی ماددەی ١٤٢ی یاسای سزای تورکیا بە ١٥ ساڵ زیندان حوکم دراو سەرەنجام لە ساڵی ١٩٨٩بەر بوو.

دەوڵەتی تورکیا لە ساڵی ١٩٨٢ بەولاوە سەرپێچی لە قەبوولکردنی ناوە کوردییەکان کردووە. بۆ نموونە لە ٦ی گوڵانی ١٩٨٣ دادگای شاری ئاگری دوو ناوی کوردی بە بیانووی ئەوەی کە دژی بەرژەوەندییەکانی کۆماری تورکیایە، قەدەغە کرد.

تەنانەت سیاسەتمەدارانی کوردیش دەکەونە بەر شاڵاوی گرتن. بۆ نموونە شەرەفەدین ئیلچی، وەزیری کاروباری هاووڵاتیان لە کابینەی ئەجەویت و ئەندامی سەربەخۆی پارێزگای ماردین لە پەرلمانی تورکیا، بە زیندان حوکم درا و ساڵی ١٩٨١ هەتا ١٩٨٤لە زینداندابوو. سوچی "ئیلچی" ئەوە بوو کە لە ناو کۆبوونەوەیەکی دۆستانەدا وتبووی "من کوردم". نموونەی هاوشێوەی دیکە، مەهدی زانایە[١٦] کە ساڵی ١٩٧٩ بە شارەداری دیاربەکر هەڵبژێردرا. مەهدی زانا وەك شارەداری پێشووی گرنگترین شاری کوردنشینی تورکیا ساڵی ١٩٨٠ حوکمی ٣٢ ساڵو ٨ مانگ زیندانی لەسەردر، بەلام لە دوای سەفەری لیژنەیەکی یەکێتی ئەورووپا و فیدراسیۆنی ناونەتەوەیی مافی مرۆڤ بۆ تورکیا لە شوباتی ١٩٨٧، حوکمی زیندانی مەهدی زانا لە لایەن دادگای پێداچوونەوە لە ٣٢ ساڵ و ٨ مانگ بۆ ٢٦ ساڵ زیندان کەمکرایەوە. سوچی مەهدی زانا ئەوە بوو کە وەك شارەدار، بە زمانی کوردی قسەی کردبوو. مەهدی زانا سەرەنجام لە نیسانی ١٩٩١ ئازاد کرا.

لە لایەکی ترەوە، کەمال بەدیلی، مافناسو نوێنەری خەڵکی ئورفە لە پەرلمانی تورکیا بە هۆی بڵاوکردنەوەی ڕێزمانی کوردی کەوتەبەر لێپرسینەوە، بەلام بە هۆی ئەوەی ئەندامی پەرلمان بوو، لە مافی پارێزراوبوون کەڵکی وەرگرت و حوکمی لەسەر نەدرا.

١٦- بەسەرهاتی لەیلا زانا، هاوسەری مەهدی زاناش سەرنجڕاکێشە. لەیلا زانا نوێنەری خەڵکی دیاربەکر لە پەرلمانی تورکیا بە تاوانی سوێندخواردن بە زمانی کوردی و داکۆکی لە مافی کوردان لە پەرلمان لە ساڵی ١٩٩٥حوکمی١٥ساڵ زیندانی لەسەردرا و هەتا ساڵی ٢٠٠٤ لە بەندیخانەدا بوو. لەیلا زانا خەڵاتی ئاشتی *ساخارۆڤ*- ی لە لایەن یەکێتی ئەورووپا پێبەخشراوە، وەك ژنی لێهاتووی ساڵی ٢٠٠٠ هەڵبژێردراوە و کاندیدی خەڵاتی ئاشتی نۆبێل بووە. (وەرگێڕ)

## بەڕێوەبردنی پارێزگاکانی ڕۆژهەڵات

لە هەمان ڕۆژەکانی سەرەتای بە دەسەڵات گەیشتنی کەمالیستەکان، سیستەمی ئیداریی تورکیا ئەو سیاسەتەی ئاشکرا کرد، کە بە فەرمی حاشای لێدەکرا، و کردەوەگەلێکی بێوێنە وەك دادگاکانی ئیستیقلال بەسەر خەڵکدا سەپێندران. ئەم دادگا سەرپێییانە کە مافی ئەوەیان هەبوو بێ پەسەندکردنی پەرلمان لە ئەنقەرە، حوکمی لە سێدارەدانی خەڵك دەربکەن، بەتایبەت بە بۆنەی گەندەڵییەوە، رەخنەی زۆریان لێگیراوە. دەوری ئەم دادگایانە لە کردەوەدا ئەوە بوو کە کاریگەریی نەیارانی بەرنامەی نۆژەنگەرایی دەوڵەتی تورکیا پووچەڵ بکەنەوە. کردەوەیەکی دیکەی دەوڵەتی تورکیا، میلیتاریزەکردنی (بە سەربازیکردنی) سیستەمی ئیداریی پارێزگاکانی ڕۆژهەڵات بوو. لە دەیەی ١٩٢٠"ئیدارەی پشکنینی گشتیی" دامەزرا. پشکنەری گشتیی کە ئەندامی سوپا بوو، بەسەر ئیدارەی مەدەنی پارێزگاکانی ڕۆژهەڵاتدا دەسەڵاتی هەبوو. بە بڕیاری مستەفا کەمال، پشکنەری گشتیی لە بەرامبەر ئەنجوومەنی نەتەوەیی تورکیا بەرپرسیاری کردەوەکانی نەبوو. هەروەها گەلێ پارێزگا بە مەبەستی سەربازی دروستکران کە ئەفسەرەکان بەڕێوەیان دەبردن. ئەو کاتە سوپای تورکیا کە پتر لە ٥٠٠ هەزار هێزی لە ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتدا هەبوو، لەوێ یاسای دەردەکرد. لەساڵی ١٩٤٣ ژەنەڕاڵێکی سوپای تورکیا کە سوچی گوللەباران کردنی ٣٣ لاوی کوردی خرابووە پاڵ لە ژێر گوشاری سوپای تورکیا ئازاد کرا.

بە گوێرەی شێوازی بیرکردنەوەی ڕێبەرایەتی تورك، سوپا باشترین ئامرازی تواندنەوەی کوردانە کە وەك کورەی تاواندنەوەی نەتەوەکان کاردەکات، شێوازێك کە ئەو کاتە دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتیش دەیگوت دەبێ لەو وڵاتە بەڕێوەبچێت.

ئەمڕۆ سەرکوتی تەواو لە لایەن کاربەدەستانی بەرزی ئیداری و سیاسیی تورکیاوە بەڕێوە دەچێت. دەسەڵاتی ئەم کاربەدەستانە لە بڕیاری ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٠دا دیاریکراوە کە بە پێی ئەوە فەرماندە مافی ئەوەی هەیەی بێ دەرچوونی بڕیاری پێشووی دادگا، بڵاڤۆکەکان دابخات. فەرماندە هەروەها دەتوانێ چاپخانەکان بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ و لە کاتی دووپاتبوونەوەی سوچ، تەنانەت ٣٠ ڕۆژیش دابخات (بەپێی بڕیارێکی پێشووتر فەرماندە دەیتوانی چاپخانەکان بۆ ماوەیەکی نادیار دابخات) و پۆلیس دەتوانێتماڵەکان بپشکنێت و خەڵك بۆ لێکۆڵینەوە بباتە پۆلیسخانە. سەرەنجام ئەوە کە فەرماندە هێشتاش بە شێوازی یاسایی لە بەرامبەر پەرلماندا بەرپرسیاری کردەوەکانی خۆی نییە. تەنانەت لە دوای لیبڕاڵیزەبوونی ڕێژیمی تورکیا لە





دەیەی ١٩٥٠ سەربازیچێتی بووە بە هۆکار و شێوازێکی زۆر گرینك. لە ساڵی ١٩٦٦ بەملاوە، کۆماندۆ تایبەتەکانی تورکیا دەستیان کردووە بە جێبەجێکردنی چەند ئۆپەراسیۆنێکی پۆلیسیی. کۆماندۆ تایبەتەکان گوندەکان گەمارۆ دەدەن و دەپشکنن و خەڵکی گوندەکان دەخەنە بەر لێپرسینەوە. گەلێ لە بینەرانی ئەم کردەوانە شایەتییان داوە کە سوپاییەکان چەندەها جار دەستیان داوە بە دەستدرێژی، ئەشکەنجەو کوشتنی خەڵکی مەدەنی.

پاش کودەتا سەربازییەکەی ساڵی ١٩٧١، لایەنگرانی سیاسەتی سەرکوت، دیسان هاتنەوە سەر دەسەڵات. لە ساڵی ١٩٧٣ تا ١٩٧٧ دادگا سەربازییەکان کە لە دیاربەکر دامەزرابوون، پتر لە هەزاران کوردیان مەحکووم کرد. ئەمە لەحاڵێکدایە کە پاش دامەزرانی pkk (پارتی کرێکارانی کوردستان) هێرشی هێزەکانی ئاسایشی سوپای تورکیا، ژاندارمەکان و دەزگای ئەمن زیاتر بووە کە تا ئێستاش بەردەوامە.

ئێستا جگە لە مەسەلەی کورد، سوپا بووە بە یەکێك لە گرینگترین تایبەتمەندییەکانی ژیانی سیاسیی تورکەکان. لە دەیەی ١٩٢٠و ١٩٣٠ بەم لاوە بەشی هەرە زۆری بودجەی گشتیی تورکیا بۆ شەڕ لەگەڵ کوردەکان تەرخانکراوە. هەروەها ڕاپەرینەکانی کوردەکان، دەوڵەتی تورکیای پاڵپێوەنا تا کۆمەڵێك هێڵی ئاسنی ستراتژیك (هێڵی ئاسنی ئەنقەرە ـ سیواس و فەوزیە پاشا ـ دیاربەکر) دروست بکات. ئەم هێڵە ئاسنییانە کە لە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی سوپای تورکیادایە، گوازتنەوەی سەربازانی تورکی ئاسانتر کردووە.

لەم چەند ساڵەی دواییدا بۆ پاراستنی سنوورەکان و ڕێگرتن لە دزەکردنی ئەندامانی pkk، پارەیەکی زۆر لە تورکیا خەرجکراوە. ئێستا سنووری سوریا و تورکیا بە چوار هێڵی کارەبایی، تەلی دڕکاوی و دامەزراندنی هەر بنکەیەك لە ٢٠٠ متر دەپارێزرێت و هەرچی بەرەو ڕۆژئاوا بچێتە پێشتر، ناوچە شاخاویترەکانی سەر سنووری تورکیا و عێراق ئەم پاراستنەی ئاستەمتر کردووە. ئێستا ئەوە سەلمێندراوە کە جەولەکانی سوپای تورکیا بێکەڵکە، هەر بۆیە دەوڵەت دەستی کردووە بە دامەزراندنی هێزە میلیشیاکان. ئێستا لە هەر گوندێکدا ٢ یان ٣ کەس لەم هێزانە هەیەو بەگشتیی ژمارەیان دەگاتە چەند هەزار کەس. ئەم هێزانەو بنەماڵەکانیان ئامانجی سەرەکیی گەریلاکانی pkk ـن. دەوڵەت ئەم هێزانە چەکدار دەکات و ئەرکیان ڕێگری کردن لە دزەکردنی گەریلاکانی pkk یە.

لە دەیەی ١٩٢٠ بەملاوە دەوڵەتی تورکیا ٢ سیاسەتی سەرەکیی جێبەجێ کردووە: یەکەم دوورخستنەوەی کوردەکان و دووەم (و بە تایبەت) بەتورککردنی کوردەکان. سیاسەتی

دوورخستنەوە سەرەتا لە ساڵی ١٩٢٧ لە دوای سەرکوتی دڕندانەی ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران دەستی پێکرد. ئەم سیاسەتە کاریکردە سەر ژمارەیەکی زۆری کوردەکان کە بۆ ڕۆژئاوای وڵات دوورخرانەوە. لە ساڵی ١٩٣٤ تا ئێستا دوورخستنەوەی کوردەکان لەلایەن ئیدارەی پشکنینی گشتییەوە جێبەجێ دەکرێت. پشکنینی گشتیی ساڵی ١٩٣٤ بە فەرمی بەپێی یاسا بە مەبەستی سەپاندنی کولتووری تورکی و دوورخستنەوەی کوردەکان دامەزرا.

لە دەیەی ١٩٤٠و ١٩٥٠ بەم لاوە شەپۆلی دوورخستنەوەی کوردەکان پێی ناوەتە قۆناخێکی بەرفراوانتر. بۆ نموونە یاسای ساڵی ١٩٨٠ی تورکیا ڕێگای بۆ دوورخستنەوەی هەموو خزم و کەس و کاری بەندکراوە سیاسییەکان خۆشکرد. لە پێناوی هەمان سیاسەتدا دەوڵەت هەوڵیداوە ناوچە سنوورییە ستراتژیکەکان چۆڵ بکات. هەروەها نزیکەی ٥٠ هەزار کەس لە دانیشتووانی پارێزگای قارس (لە نزیکی سنووری رووسیا) و هەروەها خەڵکی گوندەکانی سەر سنووری تورکیا و سوریا و عێراق ئاوارەو دەربەدەرکراون.

ئەمڕۆ سیاسەتی بەتورککردنی کوردەکان لە ڕێگای هەمان ئەو شێوازە سیستماتیکانەوە بەردەوامە. حکوومەتی تورکیا تەنانەت پێش لە شەڕی pkkش، فەرمانی گۆڕینی ناوە کوردییەکان-ی شار و گوندەکانی دەرکردووە. لەم دواییانەدا وەزارەتی ناوخۆ لە کۆی ٣٤٩٧٥ ناو، ١٢٨٦١ ناوی گۆڕیوە کە لە سەدا ٨٠ی ئەم ناوگۆڕینە لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا کراوە. سەرەتا هۆکاری سەرەکیی دەوڵەت بۆ گۆڕینی ئەم ناوانە، "پارتی کۆماریخوازی گەل" بوو کە لە کوردستاندا خەباتی دەکردو پەرەی بە ئایدیۆلۆژی کەمالیستی دەدا.

سیاسەتی بەتورککردنی کوردەکان بووە بە هۆکارێکی سەرەکیی لە پەروەردەی کوردەکاندا، بە تایبەت لە شارەکاندا، چونکە لە گوندەکاندا ڕێژەی ئەو منداڵانەی کە دەچنە قوتابخانە لە هەموو قۆناخەکانی خوێندندا کەمە. بەهەرحاڵ کارکردن بۆ تاواندنەوەی کوردەکان و بەتورککردنیان، کارێکی ئاستەمە هەرچەند روونە کە شارنشینی لەم رەوتەدا دەورێکی گرینگ دەگێڕێت. لەگەڵ ئەمەشدا زۆربەی کوردە ناسیۆنالیستەکان لە شارەکانەوە هەڵکەوتوون.

## ڕاپەڕینەکانی کوردەکان لە تورکیا

لەم بەشەدا ڕاپەڕینەکانی کورد لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٥ـ١٩٣٨ کە وەك کاردانەوەیەك لە بەرامبەر سیاسەتی کەمالیزمدا روویانداوە، دەخەینە بەرباس و تاوتوێکردن. لەم قۆناخەدا





کۆمەڵێك ئاڵۆزی لە نێوان کوردەکان و حکوومەتی ناوەندیدا هەبوو کە بووە هۆی ناسەقامگیری بارودۆخەکە. سێ ڕاپەڕینی مەزن، ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتیان هەژاند کە ئاکام و لێکەوتەکانیان تا ئێستاش بەردەوامن.

## ڕاپەڕینی شێخ سەعید (شوبات- نیسانی ١٩٢٥)

کەسایەتی سەرەکیی ئەم ڕاپەڕینە، ڕێبەرێکی ئایینی سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی بوو. دەستڕۆیشتوویی ئایینی ئەم کەسایەتییە کە لە تەیارکردنی عەشیرەتەکان و بەشدارییان لە ڕاپەڕیندا دەورێکی گرینگی بینی، یارمەتی بە روونکردنەوەی لایەنە نادیارەکانی ئەم ڕاپەڕینە دەدات کە پێکهاتەیەکی نەتەوەیی ـ ئایینی هەبوو. لایەنە ئایینییەکەی شێخ سەعید وای لەوکرد کە بتوانێ سەرۆکی عەشیرەتە سەرەکییەکان لەگەڵ ڕاپەڕین ڕێکبخات. پڕۆپاگەندەی ئیسلامیی شێخ سەعید کە لە لێدوانەکانیدا دیارە، سەرکەوتنی زۆری لە لایەنگریکردنی ئەو سەربازە تورکانە کە لە سیاسەتی نائایینی دەوڵەتی تورکیا نیگەران بوون، بەدەستهێنا. شێخ سەعید لایەنگری ڕاپەڕینێك بوو لەسەر بنەمای شەریعەت (یاسای قورئان) و ڕاپەڕینەکەی تاکتیکی هێرشی ڕاستەوخۆ بۆ سەر شارە سەرەکییەکانی تورکیای هەڵبژاردبوو.

ئامانجی شێخ سەعید دامەزراندنی سیستەمێکی ئیداری سەرەتایی و دەوڵەتێکی نیمچە سەربەخۆ بوو، بۆ ئەو مەبەستە کە لە لایەن کۆمەڵگای ناونەتەوەییەوە بە فەرمی بناسرێت. سەرکەوتنە سەرەتاییەکانی ڕاپەڕین و بڵاوبوونەوەی ڕاپەڕین، دەوڵەتی کەمالیستیی غافڵگیر کرد. پتر لە ١٠ هەزار سەرباز و ٢٣ فڕۆکە لە دژی ڕاپەڕینی شێخ سەعید تەیارکران.

هەرەسهێنانی کوردەکان لە دیاربەکر سەرەتای هەرەسهێنانی پارتیزانەکانی شێخ سەعید بوو. گەریلاکانی شێخ سەعید ناچار بوون لە شارەکان بڕۆنە دەرەوەو پەنا ببەنە باکووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا. هەندێك لە ڕێبەرانی ڕاپەڕین چوونە ئێران و لەوێ سمکۆ (سەرۆکی عەشیرەتی شکاك) پێشوازی لێکردن. ڕێبەرەکانی دیکەی ڕاپەڕین لە لایەن سوپای تورکیاوە گیران و لەسێدارەدران. خودی شێخ سەعید- یش لە ٢٥ ی ئەیلولی١٩٢٥ لەگەڵ ٥٢ کەس لە گەریلاکانی لە سێدارەدران. پاش ئەوە دادگا تایبەتەکان کە تازە دامەزرابوون، حوکمی لە سێدارەدانی سەدان کوردیان دەرکرد. هەروەها چەند ڕێبەری تورکیش بە هاوکاری لەگەڵ جیاییخوازان تاوانبارکران.

سەرەڕای بەیاننامە رەسمییەکانی دەوڵەتی تورکیا هیچ بەڵگەیەك لە ئارادا نییە کە نیشان بدات بریتانیا هیچ دەستێکی لە ڕاپەڕینی شێخ سەعیدا بووبێ، بەپێچەوانەوە دەوڵەتی

فەڕەنسا ئیزنی بە سەربازانی تورکدا لە هێڵی ئاسنی باکووری سوریا کەڵکوەربگرن بە مەبەستی سەرکوتکردنی ئەو کوردانە کە دیاربەکریان گەمارۆ دابوو و هەروەها وەشاندنی زەبری یەکلاییکەرەوە لە سەرهەڵدانی شێخ سەعید.

لەگەڵ ئەمەشدا بزووتنەوەی کورد بەتەواوی تێکنەشکابوو. تەنانەت هەندێك لە سەردەستەکان وەك یادو، خەڵکی پالۆو عەلی یونس، خەڵکی ساسۆن، دەستەگەلێکی سەربازییان ڕێبەری کرد و توانیان بەرەنگاری سەربازانی تورك ببنەوەو تەنانەت ژمارەیەکیان لێ بکوژن و بریندار بکەن.

دەوڵەتی تورکیا بە جێبەجێکردنی هەموو چەشنە دوورخستنەوەیەك کە مردنی دەیان هەزار کەسی لێکەوتەوە، تۆڵەی ئەم شەڕەی لە کوردەکان کردەوە.

## ڕاپەڕینی ئارارات

پاشەکشەی شەڕوانانی کورد بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات، ئاراراتی کردبوو بە ناوچەیەکی نائارام کە لە ساڵی ١٩٢٧ەوە لیواکانی سوپا بە شێوازی سیستماتیك هێرشیان دەکردە سەر. لەو سەردەمدا ئەنجوومەنی نەتەوەیی کورد لە لوبنان دامەزراو ناوی نرا "خۆیبوون" (سەربەخۆیی). کۆنگرەی دامەزرانی "خۆیبوون" لە ساڵی ١٩٢٧ بە بەشداری ڕێکخراوە کوردییە جۆربەجۆرەکان و هەروەها واهان پاپازیان، ڕێبەری حیزبی داشناکی ئەرمەنییەکان، بەسترا. ڕێبەرە سەرەکییەکانی "خۆیبوون" سەر بە بنەماڵە مەزنە فیۆداڵەکانی کورد بوون. حیزبی داشناك دژی لکانی ئەرمەنستان بە رووسیاوە بوو و بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی ڕۆژئاوا (فەڕەنسا و بریتانیای مەزن) خەباتی دەکرد.

هەڵبژاردنی ناوچەی ئارارات بۆ ڕاپەڕین لەو کاتەدا تا ڕادەیەك بە هۆی هاوپەیمانیی کوردو ئەرمەنییەکان بوو، کە بۆ ماوەیەك یارمەتیان لە ئێران وەردەگرت. لە ساڵی ١٩٣٠ ژەنەڕاڵ ئیحسان نوری پاشا (ڕێبەری هێزە کوردەکان) ناوچەکانی نێوان ئارارات و باکووری وان و بتلیسی لە دەستدابوو. لە دوای بەهێزتربوونی ناسیۆنالیستە کوردەکان، دەوڵەتی تورکیا دەستیکرد بە وتووێژ لەگەڵ کوردەکان و لە ئاکامدا دەوڵەت سەربازەکانی لە مانگی گوڵانی١٩٣٠دا کۆکردەوە. ئەڵبەتە تەیارکردنی سەربازان بە هۆی سەرقاڵبوونی ئەو کاتەی تورکیا بە کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانەوە هێواش بوو.





سەرەنجام زۆرتر لە ٦٥ هەزار کەس لە حوزەیرانی ١٩٣٠ هێرشیان کردە سەر کوردەکان بەڵام بەرخۆدانی سەربازانی کوردو بە دیلگیرانی سەدان سەربازی تورك و کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکانی سوپای تورکیا دەوڵەتی تورکیای ناچار کرد لەگەڵ ئێران ڕێك بکەوێت. بە شوێن ئەوەدا شای ئێران ئیدی یارمەتی کوردەکانی نەکردو مۆڵەتی بە سەربازانی تورك دا تا بە ئازادی لە خاکی ئێران تێپەڕبن تا لە پشتەوە هێرش بکەنە سەر کوردەکان. هەڵوەشانەوەی سەربازیی ڕاپەڕین لەو کاتەوە کە ڕێبەری ڕاپەڕینی ئارارات نەیتوانی کوردەکانی ئێران‌و تەنانەت کوردەکانی دەوروبەری دەرسیم بهێنێتە نێو ڕاپەڕین، مسۆگەر بوو. سەرەنجام هێزە کوردەکان بڵاوبوونەوە و هەندێکیان پەنایان بۆ ئێران برد[١٧].

پاش هەرەسهێنانی ڕاپەڕین، کوردەکان بە شێوازێکی دڕندانە سەرکوتکران. یاسایەك لە ٢٩ی جولای ١٩٣٠ ڕاگەیەندرا کە دەیگوت:

"کوشتنی ئەو کەسانەی کە یارمەتی یاخیبووان دەدەن یان هاوکاریان دەکەن بەدەستی شەخس یان گرووپەکانی نوێنەرانی دەوڵەت یان پارێزگاکان، کادیری سەربازی و مەدەنی و کاربەدەستانی خۆجێیی سووچ نییە. کوشتنی ئەو کەسانەی کە لە حوزەیرانی ١٩٣٠ هەتا ١٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٠ یارمەتی یاخیبووانیان داوە یان هاوکارییان کردوون کە بە مەبەستی بەشوێندا چوون یان قەڵاچۆکردنی یاخیبووان لە ناوچەکانی ئەرجیش، زیدان، ئاگریداغ (ئارارات)، ناوچە گەمارۆدراوەکان و پشکنراوەکان و ناوچەی پلومور لە ئەیالەتی ئەرزینجان ئەنجام دراون، سووچ نییە" (ماددەی ١).

بە کورتی سەرکوت بەسەر هەموو ناوچە کوردنشینەکان، تەنانەت ئەو ناوچانەی کە هیچ پەیوەندییەکیان بە ڕاپەڕینەوە نەبوو، سەپێندرا. هەروەها یاسایەك لە مانگی گوڵانی١٩٣٢ پەسەند کرا کە فەرمانی دوورخستنەوەی بەکۆمەڵی کوردەکانی دەرکرد کە چوار ناوچەی لەخۆدەگرت:

١- ئەو ناوچانە کە بۆ زیادکردنی حەشیمەتی ئەوانەی کە خاوەن کولتووری تورکن، ئیدەئالە.

٢- ئەو ناوچانەی کە بۆ نیشتەجێکردنی ئەو حەشیمەتەی کە دەبێ لە کولتووری تورکدا بتاوێنرێنەوە، ئیدەئالە.

١٧- ژەنەڕاڵ "ئیحسان نوری پاشا"ش چووە ئێران و لەلایەن ڕژێمی شاوە بۆ ناوەڕاستی ئێران دوورخرایەوە و ساڵی١٩٧٩ لە تاران ماتۆرسێکلێتێکی لێدرا و کۆچی دوایی کرد. مەزاری ئیحسان نوری پاشا ئێستا لە "بەهەشتی زەهرا"یە لە تاران. (وەرگێڕ)

٣- ئەو ناوچانە كە كۆچبەرانی تورك بە ئازادی دەتوانن بێ یارمەتی كاربەدەستانی تورك تێیاندا نیشتەجێ ببن (واتا بەشی هەرەزۆری ناوچە بەپیتەكانی كوردستان).

٤- ئەو ناوچانە كە بۆ چۆڵكردن ئیدەئالن یان بە هۆی پزیشكی، كولتووری، سیاسی، ستراتژیك و سەقامگیری گشتیی، هاتن و چوون بۆ ئەو ناوچانە قەدەغەیە (ئەم ناوچانە لانیكەم ناوچە دەسپێڕاگەیشتووەكانی كوردستانی دەگرتە ناوخۆ).

لە شوباتی١٩٣٢ ژمارەیەكی بەرچاوی كوردەكان بۆ رۆژئاوای ئەنادۆڵی دوورخرانەوە. ئەم دوورخستنەوە بەكۆمەڵانە هەتا ساڵی ١٩٣٥ درێژەیان هەبوو.

## راپەڕینی دەرسیم

ئەم ناوچە تایبەتە، شاخاوی و دووردەستە هەتا ماوەیەك لە سەرجەم راپەڕینەكانو سەرهەڵدانەكان بە دوور بوو[18] و خەڵكەكەی دژی هەر چەشنە هاوكارییەك لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی بوون و بەشێك نەبوون لە سوپای حەمیدییە. لە دەیەی ١٩٣٠ سیاسەتی كەمالیستەكان بە نیسبەت دەرسیم زۆر ناڕوون بوو و دەوڵەت لە باتی وتووێژ، هەڕەشەی سەربازی لە رێبەرانی دەرسیم كرد. بە گوێرەی یاسای ساڵی ١٩٣٢ دەرسیم یەكێ لەو شوێنانە بوو كە دەبوایە چۆڵ كرابا، بەڵام خەڵك دژی ئەم هەوڵەی دەوڵەت راوەستان و هەرچەند كە ٦٠ هەزار سەرباز لە ئۆپەراسیۆنی دەوڵەتی توركیا دژی دەرسیمییەكان بەشدارییان كرد بەڵام خەڵك بە كەڵكوەرگرتن لە بارودۆخی جوغرافیایی(شاخاوی) ناوچە بە ئاسانی لە بەرامبەر سوپادا بەرەنگاربوونەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ناوچەكە تاڵان و كاولكراو هەروەك شوێنەكانی دیكەی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵی، هاتنی بیانییەكان بۆ ئەوێ هەتا ساڵی ١٩٦٥ قەدەغەكرا. سەركوتكارییەكان ئەوەندە توند بوون كە بزووتنەوەی كورد تێكشكاو هەتا كاتی لیبرالیزەبوونی وڵات لە دەیەی ١٩٥٠ نەبوژایەوە.

شكستی بزووتنەوەی كورد لە دەیەی ١٩٢٠و ١٩٣٠ دوو هۆكاری ناوخۆیی و دەرەكی هەبوو: یەكێك لە گرینگترین هۆكارە نێوخۆییەكان ئەوە بوو، كە ئایدیۆلۆژی كەمالیستی دەوڵەتێكی پێكهێنا بوو، كە خاوەن چوارچێوەیەكی لۆژیكی بۆ پێشكەوتن بوو. ئەم

١٨- ناوچەی دیرسیم لە ساڵی ١٩٢٠ راپەرینی "كۆچگیری"شی بە خۆوە بینی كە لە لایەن عەلیشان بەگەوە رێبەرایەتی دەكرا.(وەرگێڕ)



دەوڵەتە بەسیستمی ئیداریی كۆن و هێزی سەربازی نەریتیی بەهێز دەكرا. هۆكاری دەرەكی ئەوە بوو كە زلهێزەكان وەك فەرەنسا هۆگری دامەزرانی كۆماری توركیا بوون و بریتانیا نەیدەویست دەوڵەتی عێراق كە داخوازییەكانی كوردی خستبووە پشتگوێ، ناسەقامگیر ببێ. هەروەها تا ئەو شوێنەی كە پەیوەندی بە مەسەلەی كوردەوە هەبوو، ئێرانیش وەك توركیا كۆمەڵێك بەرژەوەندی هەبوو. ئەم بەرژەوەندیانە لە كاتی واژۆكردنی پەیماننامەی ١٩٣٢ جێبەجێكران.

ناسیۆنالیزمی كورد رێك وەك ناسیۆنالیزمی تورك و ئەرمەنی هەتا رادەیەك لە سەردەم دواكەوتبوو و نەیتوانی بژاردەی نۆژەن بۆ پێشكەوتنی بزووتنەوەی نەتەوەیی كورد دروست بكات. نەبوونی هەستی نەتەوەیی بەهێز لە ئاستی كۆمەڵگاش نەیهێشت راپەڕین پەرەبسێنێت. لە كۆمەڵگایەكی پارچەپارچە و لەتكراو (وەك كوردستان) یەكڕیزی و یەكێتی خۆجێیی (نە نەتەوەیی) لە ناسیۆنالیزمێكی ئایدیال زۆر گرینگترە.

## بارودۆخی كۆمەڵایەتی ناوچە كوردنشینەكان

### حەشیمەت

هەڵسەنگاندنی ئاماری كوردەكانی توركیا كارێكی ئاسان نییە. سەرژمێری ساڵی ١٩٦٥ كە لانیكەم مەسەلەی زمانی گرتووەتە ناوخۆ، ژمارەی كوردەكانی كەم هەڵسەنگاندووە، بەتایبەت ئەو كوردانە كە لە شارە توركنشینەكاندا دەژیان یان دەترسان ناسنامەی كوردیی خۆیان ئاشكرا بكەن، لە قەڵەم نەداوە. بە پێی كەمترین هەڵسەنگاندنەكان، بۆ نموونە هەڵسەنگاندنەكانی CIA لە ساڵی ١٩٧٩، حەشیمەتی كوردەكان ٤ تا ٦ ملیۆنە، بەڵام چاپەمەنییەكان حەشیمەتی كوردیان لە ساڵی ١٩٨٩ پتر لە ٨ ملیۆن كەس هەڵسەنگاندووە. لە لایەكی ترەوە كەندال نەزان ئاماژە بەوە دەكات كە حەشیمەتی كوردەكان لە توركیا لە ساڵی ١٩٨٧، ١٢ ملیۆن كەس بووە، كە دەبێ بە ٢٤ لە سەدی حەشیمەتی ٥٢ ملیۆنی توركیا. سەرەنجام ڤان بروئینسن، حەشیمەتی كوردەكان لە ساڵی ١٩٧٥، ٧/٥ ملیۆن هەڵدەسەنگێنێت (ڤان بروئینسن، ١٩٧٨، لاپەڕەی ٢٢).

یەكێك لەو هۆكارانەی كە بۆتە هۆی ئەوەی ئەم هەڵسەنگاندنانە لەگەڵ یەك جیاواز بن ئەوەیە كە بەشێكی زۆری حەشیمەتی كوردەكان لە دەرەوەی كوردستان دەژی كە لەوانەیە لە ئاكامی پرۆسەی بەتوركردنی كوردەكان، تاوایبنەوە. ئۆزاڵ (سەرۆك كۆماری توركیا) لە

سالّی ١٩٩١ حەشیمەتی کوردەکانی بە ١٢ ملیۆن ناو بردووە کە دەبێ بە ٢٠ لە سەدی حەشیمەتی گشتیی تورکیا.

ئەمە لە حالّێکدایە کە کۆچی گوندنشینان بەرەو شار کە لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ لە دوای ئالوگۆڕە خێراکانی پیشەسازی و گەشەی حەشیمەت دەستی پێکرد، لە دەیەی ١٩٧٠و ١٩٨٠ خێراتر بوو. لە سالّی ١٩٦٥ لە سەدا ٧٢/٤ی دانیشتووانی کوردستان گوندنشین بوون، بەلاّم لە سالّی ١٩٨٠ ئەم ڕێژەیە گەیشتە ٦١/٥و لە سالّی ١٩٩١ لەوانەیە گەیشتبێتە لە سەدا ٥٥. بەشێك لەم کۆچانە بەرەو شارە سەرەکییەکان وەك دیاربەکر، وان، بتلیس و سێرت کە تا ڕادەیەك پێشکەوتووترن، ئەنجامدراوە، بەلاّم ژێرخانی پیشەسازیی سنوورداری ئەم شارانە وای کردووە کە کوردەکان بەرەو ناوچەکانی ڕۆژئاوای تورکیا کۆچ بکەن، کەوابوو ئیستەنبوڵ بە پتر لە ٨٠٠ هەزار دانیشتووی کورد، ئێستا بووە بە شاری کوردنشینی سەرەکیی تورکیا*.

ئەمڕۆ یەك لە سێی هەمموو ئەو کوردانەی کە لە کوردستان لە دایك دەبن، لە ناوچە بەتەواوی تورکنشینەکاندا دەژین. لە ئاکامدا بۆ یەکەمجار لە دەیەی ١٩٤٠ بەم لاوە ڕێژەی گەشەی حەشیمەتی کورد لە پارێزگا کوردنشینەکانی تونچلی، قارس و ئەرزینجان بووە بە نەرێنی و لە ئورفا بووە بە سفر کە ئەم ڕێژەیە کەمتر لە نێونجی ڕێژەی گەشەی حەشیمەتی گشتیی تورکیایە (ئەم ڕێژەیە لە ناوچە کوردنشینەکانی دیکە، لە سەدا ٢٠/٦٥ـە). ئەم ڕەوتە بەردەوام دەبێ، تەنانەت ئەگەر بەرنامەی دروستکردنی بەنداو لەسەر ئاوەکانی فورات (GAP) جێبەجێ بکرێت. ئەم پرۆژەیە دەتوانێت ئەم ڕەوتە لانیکەم لە دەوروبەری ئورفا ڕابوەستێنێت.

١٨ پارێزگا لە تورکیا کوردنشینن کە بریتین لە ئادیامان، ئاگری، بینگول، بیتلیس، دیاربەکر، ئیلازیغ، ئەرزینجان، ئەرزەرۆم، قازی عەنتاپ، هەکاری، قارس، مەلاتیە، ماردین، موش، سێرت، تونچلی، ئۆرفە و وان. هەروەها هەندێك لە ناوچە کوردنشینەکان بە ناوچە تورکنشینەکاندا لکێنراون و لە هاتای، قەهرەمان ماراش و سیواس نزیکەی یەك لە سێی حەشیمەت کوردن. هەروەها هەندێ کۆمەڵگای کورد لە هایمانا، قولی، جیهانبیلیو ئەنقەرە لە سەردەمی عوسمانی یان کەمالیستەکانەوە لە ئەنادۆڵی ناویندا دەژین. دانیشتووانی پارێزگاکانی ڕۆژهەلاّت بەتەواوی کورد نین و تورك، ئازەریو عەرەب لە سەدا ٢٠ی حەشیمەتی ئەم ناوچانە پێکدەهێنن.

* ئێستا نزیکەی ٣ ملیون کورد لە ئیستەمبوڵ دەژین. (وەرگێڕ)



## ئابووری

هەتا دەیەی ١٩٦٠ ئابووری ناوچە کوردنشینەکان هەتا ڕادەیەك خۆژێن بوو و لەسەر بنەمای ئاژەڵداری و کشتوکاڵی نەریتی بوو و دانوستانی ئابووری (بە تایبەت قاچاخچێتی) لەگەڵ سوریا و عێراق بەڕێوەدەچوو، هەرچەند کە ئەم دانوستانە بە هۆی هێڵی لاوازی پەیوەندییەکان، هێواش بوو. جگە لە سەرمایەگوزاری سەربازیی، دەوڵەتی تورکیا هیچ سەرمایەگوزارییەکی لە ناوچە کوردنشینەکاندا نەکردووە، ئەمە لە حالّێکدایە کە لە ناوچەکانی تر دەوڵەت پشتیوانی لە پرۆژە ئابوورییەکان دەکاو جێبەجێیان دەکات. ژمارەی پزیشکانی ناوچە کوردنشینەکان چوار قات لە ژمارەی پزیشکانی ناوچەکانی دیکە کەمترە. کادری تەندروستی هیچ دڵخۆشییەکان بۆ مانەوە لە ناوچە کوردنشینەکاندا نییەو بە باشتر دەزانن لە شوێنەکانی دیکەی تورکیا نیشتەجێ بن تا ئەوەی لە ناوچە کوردنشینەکاندا بمێننەوە کە هیچ چەشنە ژێرخان، ڕێکخراو یان خۆشبژێوییەکی شارییان تێدا نییە. تۆڕی بانکی پێش نەکەوتووەو قەرز لە لایەن تاکەکانەوە بە ڕێژەی قازانجێکی یەکجار زۆر دەدرێت کە ئەمەش بووەتە هۆی دواکەتوویی سەرمایەگوزاری لەم ناوچانە.

پیشەسازانی تورکیا بە هۆی نەبوونی ئاسایش و لاوازبوونی ژێرخانی ئەم ناوچانە لە ڕۆژهەلاّتی تورکیا سەرمایەگوزاری ناکەن. چینی بازرگانە خۆجێیەکانیش بە باشتر دەزانن سەرمایەی خۆیان لە ڕۆژئاوای تورکیا کە هەل و ئیمکانی یەکجار زۆرتری هەیە، بخەنە گەڕ. ١٨ پارێزگا کوردنشینەکان تەنها لە سەدا ٣ی ڕاندمانی پیشەسازییان بۆ خۆیان تەرخانکردووەو ڕێژەی پیشەسازی لەم ٦ پارێزگایانە سفرە. زێدەباری ئەمە پیشەسازییەکان زۆرتر وردن و ڕاهێنانی کەمیان لەگەڵدایە.

لە ڕاستیدا ئەو پیشەسازییەی کە لە ناوچە کوردنشینەکاندا هەیە لەسەر بنەمای پیشەسازییە کانزاییەکان دامەزراون کە بریتییە لە فۆسفات، کرومیۆم (لە ماردین)، ئاسن (لە دیوریگی) و نەوت کە هەموویان لە ژێر دەستی دەوڵەتدان. تەنها پرۆژەی گەشەپێدانی باشووری ڕۆژهەلاّت (GAPـ دروستکردنی بەنداو لەسەر ڕووباری فورات) لەوانەیە ببێ بە سەرەتایەك بۆ بە پیشەسازیبوونی ئەم ناوچەیە (ڕۆژهەلاّتی تورکیا) و تۆزقاڵە ئاڵوگۆڕێك لە ژیانی جووتیارانی خۆجێیدا پێکبهێنێت. ئەم پرۆژەیە کە یەکەمین قۆناخی لە سالّی ١٩٩٣دا تەواوکراوە، ٢١ بەنداو و ١٧ ئێزگەی بەرهەمهێنانی کارەبا لەسەر ڕووباری دیجلە و فورات دەگرێتە ناوخۆی.

ئێستا لە ئەنجامی کۆچی گوندنشینەکان، حەشیمەت بووە بە شارنشین، بەڵام شارەکان نەبوونە بە پیشەسازی و بزووتنەوە ناڕەزایەتییەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ روو لە زیادبوونە. هەتا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە بەشی کشتوکاڵەوە هەیە، یەکەمین هەڵبژاردنی ئازادی جووتیاران لە ساڵی ١٩٥٠ بەڕێوە چووە، کە بووە هۆی یەکپارچەیی ئابووریی ناوچە کوردنشینەکان و گەشەکردنی چاندنی چەوەندەر، لۆکە و تەماکۆ (تووتن) هەم بۆ بازاڕە خۆجێییەکان و هەم بۆ ناردن بۆ دەرەوە. دەوڵەتی تورکیا جووتیارانی کورد کە تەماکۆ بەرهەمدەهێنن ناچار دەکا بەرهەمی خۆیان بە نرخێکی نەگۆڕ بدەن بە کۆمپانیای نیشتیمانی سیگاری تورکیا، لەحاڵێکدا کە جووتیارانی ناوچەی دەریای ڕەش و دەریای ئیجە ناچار نین وەها بکەن.

لە دوای بەرهەمهێنانی سنوورداری ماشینەکانی کشتوکاڵ، کشتوکاڵ بەرەو میکانیزەبوون چووە بەڵام دابەشکردنی زەوییەکانی کشتوکاڵ یەکجار نادادپەروەرانەیە. ئێستا سێ لە چواری هەموو زەوییەکانی کشتوکاڵ لە دەستی لە سەدا ١٦ی مالکەکانە. ئەم مەسەلەیە هەرچەند کە پاڵ بە مودێرنیزەبوونی زەوی مالکە گەورەکانەوە دەنێ بەڵام خاوەن زەوییە بچووکەکان ناچار دەکا کۆچ بکەن. بە گشتیی وەرگرتنی یاسای مەدەنی سویس لە تورکیا بە قازانجی سەرۆک عەشیرەتەکان تەواو بووەو پاڵی ناوە بە گەشەی زەمینداری مەزنەکان کە لە ئاکامی دەست بەسەرداگرتنی زەوییە هاوبەشەکان یان زەوییە وەقفکراوەکان (کە لە لایەن گرووپە ئایینییەکانەوە ئیدارە دەکرێت) گەشەیان کردووە.

لە دوای هاتنی ئاڵوگۆڕ بەسەر پێکهاتەی کۆمەڵگای عەشیرەتیدا، گەلێ لە ڕێبەرە نەریتییەکان (ئاغا و شێخ) بوونەتە شارنشین. کەوابوو لە ئاکامی ئەم گۆڕانکارییەدا، ئاغا و شێخ دەسەڵاتیان بەسەر خەڵکدا نەماوەو ئەو باجەی کە ئەوان پێشتر هەندێك جار لە خەڵکیان دەسەند، ئێستا دەچێتە گیرفانی ڕێکخراوە ناسیۆنالیستەکانی کوردەوە.

لەم ساڵانەی دواییدا بارودۆخی سەرمایەگوزاری لە ناوچە کوردنشینەکان بە دوو هۆی سەرەکی خراپتر بووە: یەکەم ئەوە کە لە ساڵی ١٩٨٧ بەم لاوە، دەوڵەت بە شوێن سیاسەتی کەرتی تایبەتدا بووە، کەوابوو لە سیاسەتی ئابووری سەردەمی کەمال ئاتاتورك کە لەسەر بنەمای دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووریدا بوو، دوورکەتووەتەوە. دووەم ئەوە کە بە گوێرەی بانگەشەکانی دەوڵەتی تورکیا، کردەوە خراپکارانەکان و چالاکییەکانی PKK مەترسی سەرمایەگوزاری کەرتی تایبەتی دووقات کردووە.



بە گوێرەی توێژینەوەیەك کە هۆدەی پیشەسازی ئیستانبۆڵ ئەنجامی داوە، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٩ هەتا ١٩٨٦، ١٤ پارێزگا لە ١٨ پارێزگا کوردنشینەکانی تورکیا لە رووی دابەشکردنی داهاتی نەپاڵاوی نەتەوەییەوە لە نزمترین پلەی وڵاتدا بوونە. نێوەنجی داهاتی دانیشتووانی ئەم ناوچانە لە ١ لە ١٥ی داهاتی دانیشتووانی شارەکانی ئیستانبۆڵ و ئیزمیر کەمترە. لەم نێوەدا تەنها دوو ناوێزە هەیە: پارێزگای ئیلازیخ بە هۆی ئەوە کە خاوەنی کانزای سەرەکیی کرۆمیۆمەو پارێزگای مەلاتیە بە هۆی ئەوەی کە کشتوکاڵ و بازرگانییەکی زیندووی هەیە. پارێزگای هەکاری کە لە نزیك سنووری ئێرانو عێراق هەڵکەوتووە بە داهاتێکی ساڵانەی کەمتر لە ١٠٠ دۆلار، لە نزمترین پلە دایە.

## پەروەردە و کولتوور

سیستەمی قوتابخانەکانی ناوچەی کوردنشین بە دەست کەمیی یەکجار زۆری کادر و پێداویستییەکان دەناڵێنێ. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٨٠ تەنها لە سەدا ٣٣ی منداڵانی ژووری ٦ساڵ چوونەتە قوتابخانە. هەر لەم ساڵەدا ڕێژەی ژنانی خوێندەوار لە سەدا ١٩ هەڵسەنگێندراوە. دواکەوتوویی ناوچە کوردنشینەکان بە بەراورد لەگەڵ وڵاتی تورکیا بە گشتی کە لە سەدا ٦٠ی حەشیمەتەکەی دەچنە قوتابخانە، زۆرترە.

ئەمڕۆ تەنها ١٠ ناوەندی خوێندنی باڵا لە هەموو ناوچە کوردنشینەکاندا هەیە. هەروەها لەبەرئەوەی کە زمانی کوردی لە ساڵی ١٩٢٤ەوە قەدەغە کراوە، ڕۆشنبیرانی کورد وەك یاشار کەمالی چیرۆکنووس و یەلماز گونایی دەرهێنەر، بەرهەمەکانی خۆیان بە زمانی تورکی دەنووسن و دروست دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا بە پێی هەڵسەنگاندنەکان، دوو لە سێی کوردەکانی دانیشتووی پارێزگاکانی ڕۆژهەڵات، بە زەحمەت تورکی دەزانن. ئەڵبەتە لە دەیەی ١٩٦٠ بەملاوە ڕێگە بە قسەکردن بە زمانی کوردی هەتا ڕادەیەك دراوە، بەڵام بڵاوکردنەوەی بەرهەمە ئەدەبیی و کولتوورییەکان بە پێی فەرمانی ٢٥ی ژانویەی ١٩٦٧ هێشتا قەدەغە.

لە کردەوەدا لەم چەند ساڵانەی دواییدا، بە شێوازی غەیرە فەرمیی چاوپۆشی لە بڵاوبوونەوەی بە هەڵکەوتی بەرهەمە کوردییەکان کراوە، بەڵام سیاسەتی دەوڵەت لەسەر بنەمای بەتورکیکردنی ناوی کوردی شار و گوندەکانە. هەر ئێستا لە باتی زاراوەی جوگرافیایی "کوردستان"، زاراوەی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات و پارێزگاکانی ڕۆژهەڵات بەکاردەبردرێت و هەوڵێکی زۆر بۆ گۆڕینی ناوی شار و گوندە کوردنشینەکان دەدرێت. بۆ نموونە ئێستا بە

دەرسیم دەڵێن تونچلی. یەکێك لە فەرمانە سەرەتاییەکانی کۆمیتەی یەکێتی نەتەوەیی تورکیا کە پاش کودەتا سەربازیی ١٧ی گوڵانی١٩٦٠ دەرچوو، دەربارەی گۆڕینی ناوی شار و گوندە کوردنشینەکان بوو.

تەنانەت مۆسیقای کوردی کە یەکجار جێگای رێزەو شیاوی ئەوەیە کە لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر بکرێت، لە چەند دەیەی دواییدا بە هۆی داخرانی ناوەندەکانی فێرکردنی مۆسیقای نەریتیی، تووشی هەژاری بووە. هەروەها جلوبەرگی کوردی لە قۆناخەکانی ترۆپکی زۆرداری و سەرکوتی دەوڵەت قەدەغە بوو.

شوێنەوارە کەوناراکانی کوردەکان (کە یەکێك لە نیشانەکانی ناسنامەی نەتەوەی کوردە) بە شێوازی سیستماتیك لەناوبراون و کاولکراون. بەتایبەت بینا مێژووییەکانی سەر بە سەردەمی میرنشینەکان بوونەتە ئامانجی سەرەکیی ئەم سیاسەتەو "بورجی بەلەك" (کۆشکی رەنگاوڕەنگ) کە بەدرخانییەکان لە کەناری رووباری دیجلە لە "جزیری بۆتان" دروستیان کردووە، خاپوور کراوە. هەروەها لەم ساڵانەی دواییدا کڵێساکانی ئەرمەنییەکان لە ئەنادۆڵی رۆژهەڵات کاولکراون.

مەلاکان دەورێکی گرینگ لە ژیانی کولتووری و کۆمەڵایەتیی گوندەکاندا دەبینن و سەرەڕای فێرکردنی پرەنسیپە ئایینییەکان، شیعر و ئەدەبیاتی کوردیش فێری منداڵان دەکەن. بژێوی مەلاکان لە لایەن خەڵکەوە دابین دەکرێت. لە ساڵی ١٩٦٣ دەوڵەتی تورکیا مەلاکانی لە چوارچێوەی خزمەتە کۆمەڵایەتییەکاندا هێنایە نێو سیستەم. پاش ئەوە مەلاکان کە لە قوتابخانە دەوڵەتییەکاندا پەروەردەیان دەدا، رەوایەتی خۆجێیی خۆیان لە دەستدا و تەنانەت بەوە تۆمەتبارکران کە پیاوی دەوڵەتن و بە شوێن ئەوەدا ئیتر وەك رابردوو دەوری پاراستنی داب و نەریتی کوردیان نەبینی.

لەگەڵ ئەمەشدا دەوڵەتی تورکیا لەم دواییانەدا هەندێك هەنگاوی لە پێناو بە فەرمی ناسینی مافی کولتووری کوردەکان هەڵگرتووە کە یەکێك لەوانە پێشنیارکردنی هەڵوەشانەوەی یاسای ساڵی١٩٨٣ لە ٢٧ی ژانویەی ١٩٩١ بوو، کە زمانی کوردی قەدەغە کردووە. لە لایەکیترەوە تورگوت ئۆزاڵ، سەرۆك وەزیرانی پێشووی تورکیا بە راشکاوی بە رۆژنامەنووسێکی وتبوو کە ١ لە ٦ی خەڵکی تورکیا کوردن. ئەم لێدوانەی ئۆزاڵ بە پێچەوانەی ئەوەی کە چاوەڕوان دەکرا هیچ کاردانەوەیەکی نەیارانەی لێنەکەوتەوە. تەنانەت ژەنەڕاڵ کەنعان ئەڤرن، سەرەڕای ئەوەی کە یەکێك لە چالاکانی کودەتا سەربازیی ١٩٨٠ بوو، پشتیوانی لەم



هەڵوێستەی ئۆزاڵ کرد. ئەنها حیزبی رێگای راستی توندئاژۆ بە رێبەرایەتی "تورکز" بوو کە بە راشکاوی دژایەتی خۆی لەگەڵ لێدوانەکانی ئۆزاڵ دەربڕی.

بەهەرحاڵ لە ئەنجامی گەشەکردنو بەرەوپێشچوونی حیزبە سیاسییەکان وەك پارتی سۆسیال دیموکراتی گەلٚ (SHP)، بوار بۆ پێشکەوتن و باشتربوونی بارودۆخەکە رەخساوە. لە ٩ی گوڵانی ١٩٩١ عیسمەت ئینۆنۆ، رێبەری SHP داوای کرد ئەنیستیتۆیەکی کوردی لە چوارچێوەی زانکۆکانی تورکیا دابمەزرێت. رەنگە هۆی ئەم داخوازییەی SHP ئەوە بووبێت کە خۆشەویستی حیزب لە نێو خەڵکدا بە توندی کەم بووەو لەم رێگایەوە دەیەویست ئەم بۆشاییە پڕ بکاتەوەو لە هەڵبژاردندا دەنگی خەڵك بە دەست بهێنێت.

بە گشتیی پەروەردە بە زمانی تورکی، کەش و هەوای قسەکردن بە زمانی تورکی و دابڕانی زمانی کوردی لە رەسەنایەتیی خۆی لە تورکیا، کاری کردووەتە سەر تاوانەوەی خێرای کوردەکان. کولتووری کورد لە تورکیا بەخێراییەکی یەکجار زۆر هەژار بووەو ئەگەر کەسێك تەنانەت بتوانێ لەگەڵ گۆرانییە نەریتییە کوردییەکاندا هەڵپەڕێت، لە وشە تورکییەکان کەڵك وەردەگرێت.

ئەو مەترسییە کە ئێستا رووبەڕووی کولتووری کورد لە تورکیا- کە لە هەموو چەشنە تەکامول و پێشکەوتنێك دابڕاوە- بووەتەوە ئەوەیە کە ببێ بە دیاردەیەکی فۆلکلوریك و بەرەبەرە ببێ بە بەشێك لە کولتوورناسییەکی بێ سەروبەر.

## ژیانی سیاسیی کوردەکان

### توانەوەی کوردەکان لە سیستەمی سیاسیی تورکیادا

لیبڕاڵیزەبوونی سیستەمی سیاسی تورکیا پاش شەڕی دووەمی جیهان دەستی پێکرد. گیروگرفتە ئابوورییەکان و قاتوقڕی ساڵەکانی ١٩٤٠ــ١٩٤٥ کە بزووتنەوەی نارەزایەتی گشتیی خەڵکیان لێکەوتەوە، عیسمەت ئینۆنۆی ناچار کرد دەوڵەت بگۆڕێت.

لە ساڵی ١٩٤٦ کۆمەڵێك حیزبی جۆراوجۆر دامەزران، یەکێ لەوانە"حیزبی دیموکرات" بوو کە لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠ سەرکەوت. ئەم حیزبە بە دەستی عەدنان مەندەرەس کە زەمینداریکی گەورەو جەلال بایەر کە سەرۆك وەزیرانی مستەفا کەمال بوو، دامەزرا. حیزبی دیموکرات هیچ بەرنامەیەکی بۆ دابڕان لە کەمالیزم نەبوو. بەهەرحاڵ بە دەسەڵات گەیشتنی حیزبی دیموکرات لە ساڵی ١٩٥٠ بووە هۆی پێکهاتنی دیموکراسی لە تورکیا بۆ سەردەمێك کە بە تایبەت بە قازانجی کوردەکان بوو، هەر بۆیە هەموو کوردەکان دەنگیان

به حیزبی دیموکراتدا. له دوای به دەسەڵات گەیشتنی حیزبی دیموکرات سەرکوتکارییەکانی پۆلیس له بنەڕەتدا کەم بووەوەو به هەندێك لە دوورخراوەکان ئیزن درا بگەڕێنەوە بۆ کوردستان. ئەم گرووپە کە زۆرتر سەرۆك عەشیرەتەکان بوون، توانیان دیسان ببنەوە خاوەنی زەوییەکانیان.

حیزبی دیموکرات کە بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە خزمەتگوزارییەکان (وەك دروستکردنی نەخۆشخانە و ڕێگاوبان) دەستپێشخەر بوو، توانی لەگەڵ ڕێبەرە کوردەکان هاوپەیمانی پێکبهێنێت و لە ئەنجامدا گەلێك لەو ڕێبەرانە بوون بە ئەندامی پەرلمان و تەنانەت وەزیر، بەڵام کەمالیستەکان کە لەژێر کاریگەریی سوپادا بوون و نەیاندەتوانی ئەو ڕەوتە سیاسییە تەحەمول بکەن، کاردانەوەیان نیشان داو گیروگرفتە ئابوورییەکانیان کردە بیانوویەك بۆ ئەوەی دەست بکەن بەسازکردنی کێشە و کێشمەکێش.

لە دوای کودەتا سەربازیی ٢٧ی گوڵانی ١٩٦٠، عەدنان مەندەرەس رایگەیاند کە کوردەکان هەوڵیان داوە به کەڵکوەرگرتن لە پێگەی سیاسییان لە ناو حیزبی دیموکرات، کوردستانێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن. لە حوزەیرانی ١٩٦٠ کاربەدەستانی تورك ٤٨٥ کەس لە گەورە کوردەکانیان دەستگیر کردو بۆ ماوەی چەند مانگ زیندانیان کردن. هەروەها ٥٥ کەس لە بەهێزترین و بەدەسەڵاتترینی ئەم کەسانە کە زۆربەیان ئەندامی حیزبی دیموکراتی عەدنان مونده‌رەس بوون، بۆ ماوەی ٢ ساڵ بۆ ڕۆژئاوای وڵات دوورخرانەوە.

لە مانگی گوڵانی ١٩٦١ لە شارە سەرەکییەکانی کوردستان، بە تایبەت دیاربەکر، بتلیس و وان کۆمەڵێك خۆپیشاندان بۆ دەربڕینی نارەزایەتی لە گەڕانەوەی تورکیا بۆ سیاسەتی سەرکوتکەرانەی کەمالیست، ڕوویدا. خۆپیشاندەران کە هەندێك ئاڵایان بە دەستەوە بوو، داوای بە فەرمی ناسینی ناسنامەی کوردیی خۆیان دەکرد. ئەم خۆپیشاندانانە، سەمبۆلی سەرلەنوێ لە دایکبوونەوەی بزووتنەوەی کورد بوو کە لە سەردەمی پێش لە شەڕی دووەمی جیهانییەوە خنکێنرابوو*.

* هەروەها لە نیسانی ١٩٦٧یش کۆمەڵێك خۆپیشاندانی مەزن لە زۆربەی شارەکانی کوردستانی تورکیا بەڕێوەچوو. ئەم خۆپیشاندانانە لە دوای ئەوە ڕوویدا کە وتارێك لە بلاڤۆکی" ئوتوکەن" دا بڵاو بووەوە. لەم وتارەدا هەڕەشە لە کوردەکان کرابوو و تێیدا هاتبوو:

"با کوردەکان لە تورکیا بچنە دەرەوە، بەڵام بۆ کوێ، بۆ هەر شوێنێك پێیان خۆشە. با بچن بۆ ئێران، پاکستان، هیندوستان یان وڵاتی بارزانی، یان داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن وڵاتێکیان لە ئەفریقیا بۆ



بەهەرحاڵ، یاسای بنەڕەتی نوێ کە لە ساڵی ١٩٦١ لە ژێر کاریگەریی گەڕانەوەی مەدەنییەکان بۆ دەسەڵات پەسەندکرا، قەدەغەبوونی حیزبە ناوچەییەکانی هەڵنەوەشاندەوە، بەڵام کرانەوەی کەشوهەوای سیاسی، ڕێگای بۆ ئەوە خۆش کرد کە کوردەکان بەشێوازگەلێکی ناڕاستەوخۆ خۆیان نیشان بدەن.

لە نیوەی دووەمی شوباتی ١٩٦١، سێ حیزبی نوێ لە دایکبوون: حیزبی داد (Jp)، حیزبی نوێی تورکیا (NTP) و حیزبی کرێکارانی تورکیا (TWP). لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٦١ هیچکام لە حیزبەکان نەیانتوانی زۆرینەی یەکلاییکەرەوەی دەنگەکان بەدەستبهێنن، بەڵام "حیزبی داد" زۆرترین دەنگی بەدەستهێنا. "حیزبی داد"و "حیزبی نوێی تورکیا" توانیان زۆرینەی دەنگەکان لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا بەدەستبهێنن. لە حوزەیرانی ١٩٦٢ یەکێك لە ڕێبەرە کوردەکان بە ناوی دوکتور یوسف ئۆغلو بوو بە وەزیری تەندروستیی کابینەی عیسمەت ئینۆنۆ. ئۆغلو بە هۆی ئەوەی سیاسەتی دروستکردنی نەخۆشخانەو دەرمانخانە گشتییەکانی بە شێوازی چالاك جێبەجێ دەکرد، لە لایەن "بیکاتا"، وەزیری ناوخۆ کە دۆستی "ئینۆنۆ" بوو، بە ناوچەگەرایی تۆمەتبار کرا، ئەمە بووە هۆی ئەوەی "ئۆغلو" دەست لە کار بکێشێتەوە.

قەدەغەکردنی دامەزراندنی حیزبە ناوچەییەکان لە کوردەکان کە لە بنەڕەتدا دژی ئایدیۆلۆژی کەمالیستی بوون، دەتوانێ هۆی ئەوە بێ کە بۆچی گەلێك لەوان تەڤلی ڕێکخراوە چەپەکان بوون، تەنانەت هەندێك جار بەشداریی کوردەکان لە حیزبە چەپەکان لە کەسانی دیکە زۆر زۆرتر دەبوو. ئەم مەسەلەیە لە پارتی کرێکارانی تورکیا (TWP) ڕوویدا. TWP ڕێکخراوێکی مارکسیستی بوو کە دووەمین ڕێبەرەکەی محەمەد عەلی ئەسلان، مافناسێکی کوردی ناوچەی ئارارات بوو. ئەسلان لە ساڵی ١٩٦٦ یەکەمین بلاڤۆکی سۆسیالیستی بە زمانی کوردی بڵاوکردەوە کە پاش چاپی چوارەمین ژمارەی، داخراو خودی ئەسلان-یش گیرا.

بدۆزێتەوە. با کورد لە تورکیا بچنە دەرەوە پێش ئەوەی نەتەوەی تورك تووڕە ببێ. با کوردەکان لە ئەرمەنییەکان بپرسن ئێمە کێین. ئێوە تەنها بۆ ناسیۆنالیزمی کورد کار دەکەن، ئێوە داوا لە ئێمە دەکەن زمانەکەتان بەفەرمی بناسین، ئێوە دەتانەوێت قوتابخانەی خوتان هەبێ و پرۆگرامی خۆتان بڵاو بکەنەوە، ئێوە کۆبوونەوەی نهێنی بەڕێوە دەبەن و وەك قارەمانی نەتەوەیی باسی بارزانی دەکەن، ئێوە لە ڕێگای تورکیاوە چەك بۆ ئەو دەنێرن، ئێوە شیعر بۆ منداڵەکانتان دەخوێننەوەو پەیوەندیتان لەگەڵ ڕێکخراوە کوردییەکانی ئەورووپا هەیە، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە رابن، ئەو دۆزەخەی کە ئێمە بۆتانی دروست دەکەین بەچاوی خۆتان دەبینن. ئەوانەی کە تورك نین با لە تورکیا بچنە دەرەوە".( وەرگێڕ)

ئەو کاتە TWP مەسەلەی کوردی لە رووی تیئۆریکەوە بە پێی بیرورا مارکسیستییەکان چارەسەر کرد واتا یەکێتی چینی کرێکار و دامەرزاندنی دەوڵەتێکی سۆسیالیستی. TWP لە دەیەی ١٩٦٠ کۆمەڵێك لقی لە کوردستاندا کردەوەو سەرەنجام مەسەلەی کورد کۆتایی بە ژیانی حیزب هێناو بە هۆی ناکۆکییە ناوخۆییەکان لەناوچوو. حیزب لە کۆنگرەی خۆی لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٠ بڕیارنامەیەکی دەربارەی بە فەرمی ناسینی "بوونی کورد" دەرکرد. TWP لەو کاتەوە کە لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٦٥، ١٥ کورسی لە کۆی ٤٥٠ کورسی پارلمانی بە دەست هێنا بوو، ئەمە یەکەمجار بوو کە هەڵوێستێکی وای دەگرت. دەوڵەتی نیهاد ئێریم لە بەرامبەر ئەم هەوڵوێستەی TWP کاردانەوەی نیشان داو حیزبی TWP بە هۆی پڕوپاگەندای جیاخوازی کوردی قەدەغە کرا. ئەندامانی سەرکردایەتی حیزب دەستگیرکرانو بە پتر لە ١٢ ساڵ زیندان حوکم دران، بەڵام پاش فەرمانی لێبوردنی تەمموزی ١٩٧٤ (کە لە لایەن ئەو دەوڵەتەی پاش هەڵبژاردنی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ هاتە سەر دەسەڵات، دەرچوو) ئازاد کران.

## سەرهەڵدانی پارتە کوردە ناسیۆنالیستەکان

پاش کودەتا ١٩٧١ ژمارەیەك لە خەباتکارانی کوردی حیزبی کرێکارانی تورکیا (TWP) گرووپێکی سیاسی نهێنییان پێکهێنا کە ناوی نرا حیزبی سۆسیالیستی کوردستان تورکیا (PSKT). PSKT لەبەرئەوەی بە هۆی ئامانجەکانی حیزبێکی نایاسایی بوو، بلاڤۆکێکی کوردی ـ تورکی بە ناوی" ریا ئازادی "وەك بەرەیەکی یاسایی بڵاو دەکردەوە.

لە ساڵی ١٩٧٦ کۆمەڵێك رێکخراوی تازە پێگەیشتوو دامەزران کە بە "ئەنجوومەنەکانی کولتووری ـ شۆڕشگێڕ" ناسراو بوونو پاش ماوەیەکی کورت ژمارەیان لە کوردستانو ئەنادۆڵی گەیشتە ٢٠ رێکخراو. لەساڵی ١٩٧٧ رۆژنامەی تورکی ـ کوردی "رۆژا وەڵات "پاش چەند مانگ بڵاوبوونەوە لە دوای راگەیاندنی حکوومەتی سەربازیی لە تورکیا داخرا. رێکخراوە تازە پێگەیشتووەکانیش قەدەغە کران. کودەتا ساڵی ١٩٨٠ کۆتایی بە ژیانی نهێنی PSKT هێنا. ژمارەیەك لە رێبەرانی حیزب دەستگیرکران، بەڵام سکرتێری حیزب، کەماڵ بورکای توانی لە وڵات بچێتە دەرەوەو لە دەرەوەی وڵات رۆژنامەی "ریا ئازادی" بڵاو بکاتەوە. حیزبی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیا لایەنگری سۆڤیەت و بەرنامەکەی مارکسیستی بوو و ستراتیژییەکەشی سەرلەنوێ کۆکردنەوەی سەرجەم هێزە دژی ئیمپریالیستیەکان لەبەرەیەکی یەکگرتوو لە سەرانسەری وڵاتدا بوو. PSKT زۆرتر حیزبێکی مارکسیستی بوو تا



بزووتنەوەیەکی ناسیۆنالیستیو لایەنگری فیدراسیۆنی دوو حکوومەتی کوردو تورك لە تورکیا بوو. خەباتی چەکداری هیچ جێگایەکی لە بەرنامەی حیزبدا نەبوو و چالاکییەکانی تەنها ئایدیۆلۆژیی بوون. لە سەرەتای دەیەی ١٩٨٠ حیزبی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیا لە چوارچێوەیەکی مارکسیستیدا رێککەوتننامەیەکی لەگەڵ دوو بزووتنەوەی دیکە بە ناوەکانی "ئەنجوومەنی کولتووری شۆڕشگێڕو دیموکرات"و "پارتیزانەکانی رزگاریدەری نەتەوەیی کوردستان" ئیمزا کرد.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا لەساڵی ١٩٦٥ - هاوتەریب لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق- بە دەستی فایەق بوجاك کە مافناسو نوێنەری خەڵکی ئورفا لە پارلمانی تورکیا بوو، دامەزرا. ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٦٩ واتا کاتێك کە گرووپی لایەنگری مەلا مستەفا بارزانی بەسەر حیزبدا زاڵ بوون، تووشی جیابوونەوە بوو. دوکتور شوان حیزبێکی دیکەی بە هەمان ناو دامەزراند کە لە ساڵی ١٩٧٧ بوو و بە "حیزبی کرێکارانی کوردستان"و پاشان لە ساڵی ١٩٨٣ بوو بە "حیزبی پێشڕەوی کرێکارانی کوردستان".

دامەزرانی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان، حیزبی دیموکراتی پتر لە جاران لاواز کردو بە لە دایکبوونی "حیزبی پارتیزانەکانی رزگاریدەری نەتەوەیی کوردستان" (KUK) لە ساڵی ١٩٧٩ بە تەواوی لاواز بوو. ئەوەی کە ئێستا لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا ماوەتەوە، تەنها گرووپێکی وەفادار بە بارزانییە. حیزب وەك جاران موحافەزەکار ماوەتەوە، هەرچەند پاش بەڕێوەچوونی کۆنگرەی تشرینی یەکەمی ١٩٧٧ زۆرتر نزیکی مارکسیستەکان بووەتەوەو بەرنامەکەشی بە راشکاوی سەربەخۆیی کوردستانە (نەك خودموختاری)، هەرچەند لە کردەوەدا ئەم دروشمە نەرمتر بووەتەوە.

"حیزبی پێشڕەوی کرێکارانی کوردستان" لە ساڵی ١٩٨٣ پاش بەڕێوەچوونی کۆنگرەکانی لە رۆژهەڵاتی نزیك، بە رەسمی دامەزرا بەڵام رەگ و بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێشتر. ئەم حیزبە یەکەم کۆنگرەی خۆی لە ساڵی ١٩٧٥ گرتو هەر لە کاتی دامەزرانەوە حیزبێکی نهێنیی بوو. بەرنامەی حیزب دامەزرانی کۆمەڵێك رێکخراوی ژنانو کچان بوو کە وەك واسیتەی یاسایی حیزب کاریان دەکرد، لەبەرئەوەی کە خودی حیزب نایاسایی بوو، بەهەرحاڵ "ئەنجوومەنی کولتووری ـ شۆڕشگێڕو دیموکراتی ژنان" لە تورکیا لە خودی حیزب بەناوبانگتر بوو. لە ساڵی ١٩٨٢ کۆمەڵێك قەیرانی ناوخۆیی لە حیزبدا پێکهات کە بووە هۆی لەتبوونی حیزبو پاش شەپۆلی گیرانەکان لە دوای کودەتا ١٩٨٠، حیزب لاواز بوو، دەستگیرکراوەکان

قەت ئازاد نەكران. "حیزبی پێشڕەوی كرێكارانی كوردستان" لایەنگری ماركسیست ـ لنینیستەكان بوو و زۆرتر مامۆستایانو خوێندكاران پشتیوانیان لێدەكرد.

"حیزبی پارتیزانە رزگاریدەرەكان" لایەنگری سەربەخۆیی كوردستان بوو و تەنها بزووتنەوەی ناماركسیستی بوو. زۆربەی ئەندامانی ئەم حیزبە گەنجانێك بوون كە پێگەی كۆمەلایەتی خۆیان لە دەست دابوو و ژمارەیەكی زۆری دیكەش لە كۆمەڵگادا تاویابوونەوە.

هەروەها ژمارەیەكی زۆر گرووپی بچووكیش هەبوون وەك "رزگاری" كە ماركسیستو سەربەخۆییخواز بوو، " ئالای رزگاری" كە لە حیزبی "رزگاری" جیا ببووەوە، "كاوە" كە ماو-یست بوو و "تیكۆشین". سەرەنجام لە ساڵی ١٩٨٨ "حیزبی ئیسلامی كوردستان" سەری هەڵدا كە لایەنگری حكوومەتی كوردستانی یەكگرتووو ئیسلامی بوو. ئەندامانی حیزب، رۆشنبیران، پەیڕەوانی تەریقەتی سۆفییانەی نەقشبەندی و پشتیوانانی پێشووی حیزبە ئایینییە یاساییەكان بوون. "حیزبی ئیسلامی كوردستان" دژی شۆڕشی ئیسلامی ئێران بوو و وادیار بوو كە دۆستی عەرەبستانی سعوودی بوو، چونكە یارمەتی ماددی لە عەرەبستان وەردەگرت. حیزب بانگەشەی جۆرە ئیسلامێكی دەكرد كە لە كوردستاندا شتێكی نوێ بوو لەبەرئەوەی كە سەر بە حیزبە ماركسیستیەكان بوو. بەهەرحاڵ ئەم حیزبە تا رادەیەك سەرسووڕهێنەر بوو.

ئەمڕۆ ئایدیۆلۆژی ئیسلامی تەنها ئەڵترناتیڤی مۆدێلی ناسیۆنالیستی كەمالیستە كە بەسەر توركیادا زاڵە.

## Pkk

Pkk (پارتی كرێكارانی كوردستان) ئێستا سەركەوتووترین حیزبی كوردستانە و وردەكاری زۆر بۆ لێكدانەوە لەخۆدەگرێ.

دەتوانین خاڵی سەرەتای دامەزرانی pkk بگەڕێنینەوە بۆ كۆبوونەوەیەكی خوێندكاری لە زانكۆی ئەنقەرە. لەو كاتە بەدواوە، عەبدوڵڵا ئۆجەلان كە خوێندكاری بەشی زانستی سیاسی لە زانكۆی ئەنقەرە بوو، خۆی وەك سەرۆكی بزووتنەوە نیشان دا. نازناوی عەبدوڵڵا ئۆجەلان، "ئاپۆ" یە.

ستراتیژی گرووپ دووریكردنی رێژەیی لەو بزووتنەوانە بوو كە تێكەڵی حكوومەت بوون. گرووپ یەكەم چالاكی پرۆپاگەندایی خۆی لە ساڵی ١٩٧٥ دەستپێكرد. عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە زێدی لەدایكبوونی خۆی واتا ئورفە چالاكی دەكرد، بەلام چالاكانی دیكەی گرووپ لە دەرسیم



چالاكیان دەكرد. چالاكییەكانی گرووپ بریتی بوون لە پێكهێنانی كۆمەڵێك كۆبوونەوەی نهێنی لەگەڵ خوێندكاران و گەنجان. پرۆپاگەندای گرووپ هەر لە سەرەتاوە ناسیۆنالیستی و توند بوو.

گرووپ لە ساڵی ١٩٧٥ كۆمەڵێك نامیلكەی وەك "رێگای شۆڕشی كورد" بلاوكردەوە. لەم نامیلكانەدا بە شێوازێكی توندڕەوانە هێرش كرابووە سەر چینی سەرمایەدار و تۆمەتی هاوكاری لەگەڵ دەوڵەتی توركیایان خرابووە پاڵ. ئەو كاتە گرووپ ماركسیست-لنینیست بوو و یەكێتی سۆڤیەت بێ ئەوەی ببێ بە سەرمەشق، رێزی لێدەگیرا. بەرنامەكەی گرووپ سادە و رادیكاڵ بوو، واتا سەربەخۆیی كوردستان وەك پێشمەرجی دامەزرانی كومەڵگای شیوعیی جیهانی لە رێگای لەناوبردنی چینی ناوین و بەدەسەلات گەیشتنی یەكێتی كرێكاران و جووتیاران. بە گشتی لەم قۆناخە سەرەتاییەدا، گرووپ زۆرتر دژی حیزبەكانی دیكەو ئەو كەسانە خەباتی دەكرد كە لە كوردستان لەگەڵ دەوڵەت هاوكارییان دەكردو تا بەشێوەی راستەوخۆ دژی حكوومەتی توركیا.

pkk بە شێوازی فەرمی لە ٢٧ی تشرینی دووەمی ١٩٧٨ لە نزیكی دیاربەكر دامەزرا و عەبدوڵڵا ئوجەلان لە لایەن كۆمیتەی ناوەندی ٧كەسییەوە (كە تەنها یەكێكیان لە كۆبوونەوەی دامەزرانی گرووپ لە ساڵی ١٩٧٤ئامادە بوو) وەك سكرتێری گشتی پارتی كرێكارانی كوردستان هەڵبژێردرا. بۆ راكێشانی سەرنجی خەڵك بەرەو لای دامەزرانی حیزب، پیلانی كوشتنی محەمەد بوجاك دارێژرا كە یەكێ لە گرنگترین كەسایەتییە فیۆدالەكانی ناوچەی سیورك و یەكێ لە نموونە هەرە باشەكانی هاوكارانی دەوڵەت و سەرۆكی هێزە چەكدارەكانی لایەنگری دەوڵەت بوو. بوجاك لەم هەوڵی كوشتنە رزگاری بوو و هێزەكانی دەستیانكرد بە هێرش دژی pkk.

Pkk ئەو كاتە لە بنەڕەتدا پارتێك بوو، كە زۆرتر دژی چینی زەمیندار- كە دژی خەباتی چینایەتی بوون-و پارتە ركابەرەكان چالاكی دەكرد تا دژی حكوومەتی توركیا. Pkk لە كاتی كودەتا سەربازی ساڵی ١٩٨٠ بە شێوازی بنەڕەتی لە ٣ ناوچەدا دامەزرا: ١- غازی عەنتاپ، قارامان ماراش و مەلاتییە٢- ئورفە، دیاربەكر و ماردین ٣- ئیلازیغ، تونجلی و بینگول. لە كاتی بێ سەروبەری زاڵ بەسەر توركیادا لە دەیەی ١٩٧٠، pkk بونیەی ماددی خۆی بە شێوازگەلی جۆراوجۆر بەهێز كرد. وێدەچی عەبدوڵڵا ئۆجەلان كودەتا سەربازی ساڵی ١٩٨٠ی پێشبینی كردبوو، هەربۆیە چووە سوریا و لەو رۆژانەدا لەوێ مایەوە و زۆربەی ئەندامانی رێبەرایەتی pkk پاشان تەڤلی ئەو بوون.

Pkk یەکەم کۆنگرەی خۆی لە سنووری لوبنان و سوریا بەڕێوە برد و لە دوای بەڕێوەچوونی کۆنگرەی دووەم لە ساڵی ١٩٨٢ دەستیکرد بە خەبات دژی دەوڵەتی تورکیا و ئەو کوردانەی کە هاوکاری دەوڵەتیان دەکرد. لە گولانی ١٩٨٣، ٣ سەربازی سوپای تورکیا کەوتنە بۆسەی هێزەکانی pkk و کوژران. سوپای تورکیاش کاردانەوەی نیشان دا و بە ئیزنی دەوڵەتی عێراق، دەستیکرد بە ئۆپەراسیۆنێکی بەرفراوانی گەڕان و پشکنین دژی ئەندامانی pkk لە ناو خاکی عێراق. پاش ماوەیەکی کورت، هاوپەیمانییەك لە نێوان pkk و پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بە ڕێبەرایەتی مەسعود بارزانی پێکهات. ئەم هاوپەیمانییە ڕێگای بۆ ئەوە خۆش کرد کە pkk هێزەکانی خۆی کە لە سوریا و چۆمی بقاع پەروەردەیان بینیبوو، لە باکووری عێراق جێگیر بکات.

Pkk سەرەتا تا ئەو شوێنەی کە بۆی دەکرا وەك کردەوەیەکی هەڵسەنگێندراو بو ڕاکێشانی خەڵك بەرەو لای خۆی، پزیشکەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ ناو خەڵك و مۆدێلی "ڤیتکۆنگ"[19]ی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو.

هێرشەکانی pkk لە ساڵی ١٩٨٤ هەروەها درێژەی هەبوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٦ کەمی کردەوە. Pkk پاشان ئۆپەراسیۆنێکی تایبەتی لە ئابی ١٩٨٥ئەنجامدا کە لە ئاکامیدا ١٢ کەس لە هێزەکانی تورکیا لە ناوچەی هەکاری کوژران. سوپای تورکیاش لە کردەوەیەکی تۆڵەسەندنەوەدا هێرشیکردە سەر بنکەکانی pkk لە باکووری عێراق کە کوژران و برینداربوونی ١٥٠کەسی لێکەوتەوە کە هەندێکیان پێشمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بوون.

یەکینەی هێزە تایبەتەکانی pkk لە گولانی ١٩٨٩ هێرشیانکردە سەر کانگای بەردەخەلووز لە پارێزگای سیرت و داگیریان کرد و بە کەڵکوەرگرتن لە دوژمنایەتی نێوان گوندییەکان و بەڕێوەبەرانی کانگاکە کۆبوونەوەیەکی پڕوپاگەندایییان گرت کە ژمارەیەکی زۆر

---

١٩– گەریلای خێرا و بوێر و چالاك. ڤێتکۆنگ ناوی ڕێکخراوی گەریلایی چەکدارانی چالاکی کۆمۆنیستی ڤێتنامی باشوور بوو کە لە کاتی شەڕی ڤێتنام و دەستدرێژی ئەمەریکا بۆ سەر ئەم وڵاتە دژی هێزەکانی ئەمەریکا و ئەو دەوڵەتەی کە ئەمریکا لە ڤێتنامی باشوور دایمەزراندبوو، شەڕیان دەکرد و ساڵی ١٩٦٠ لەگەڵ چەند ڕێکخراوی سەربەخۆخوازی دیکە لە بەرەی ڕزگاریدەری نەتەوەیی "ڤییەتمین" کۆبوونەوە و سەرەنجام لە ساڵی ١٩٧٥ شکستێکی گرانیان بەسەر ئەمەریکادا سەپاند. (وەرگێڕ)



لە گەنجان تێیدا بەشدارییان کرد. Pkk هەروەها دەستیکرد بە پێکهێنانی هاوپەیمانیگەلێکی نوێ. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٨٨ نزیکی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە ڕێبەرایەتی جەلال تاڵەبانی بووەوە و دەستیکرد بە هاوکاری لەگەڵ گرووپە چەپەکان وەك "دیوسول" (چەپی شۆڕشگێڕ)، حیزبی شیوعی و حیزبی مارکسیست- لنینیستی تورکیا. لە ئەنجامی ئەم هاوپەیمانییەدا، pkk پشتیوانی لۆجستیکی لە شارەکاندا بەدەستهێنا.

لە ساڵی ١٩٩٠ کۆمەڵێك ڕووداو لە ناوچە کوردنشینەکاندا ڕوویدا. کوردەکان، بەمنداڵ و گەورەوە بەردیان لە سەربازانی تورك دەدا. لە ٢٣ی ئاداری ١٩٩٠لە ماردین هەزاران کورد خۆپیشاندانیان کرد و دژی دەوڵەتی تورکیا دروشمیان دا. Pkk توانیبووی پشتیوانی هەمە لایەنەی خەڵك لە ناوچە شارییەکاندا بەدەستبهێنێ و پێگەیەکی نەتەوەیی بەدەستهێنابوو.

ساڵەها شەڕی چەکداری هەزاران قوربانی لێکەوتووەتەوە کە ژمارەیەکی زۆریان خەڵکی مەدەنی بوونە. لە ماوەی ئەم ساڵانەی دواییشدا نەتەنیا ئەم کردەوە توندوتیژانە کەم نەبوونەتەوە، بەڵکو پێکدادانەکان توندتر بووە. لە ساڵی ١٩٨٣وە دەوڵەتی تورکیا گەلێ جار بۆ جێبەجێکردنی ئۆپەراسیۆنی لەناوبردنی pkk هاتووتە ناو خاکی عێراق. لە هاوین و پاییزی ١٩٩١یشدا هێزە چەکدارەکانی تورکیا گەلێ جار هێرشیانکردە سەر pkk. ئەمە لەحاڵێکدایە کە شەپۆلی گرتنی کوردەکانی تورکیاش هەروا درێژەی هەیە.

## پێکهاتنی حکوومەتی عێراق و راپەڕینی شێخ مەحموود

حکوومەتی عێراق دەستکردی بریتانیایە. هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی لە درێژایی شەڕی یەکەمی جیهان رێگای بۆ ئەوە خۆشکرد کە ئیمپراتۆری بریتانیا، کۆنترۆڵی ویلایەتەکانی بەسرەو بەغداد (کە بە باشووری میزۆپۆتامیا ناسراوە) بخاتە ژێر دەستی خۆی. گرینگی ویلایەتی موسڵ کە زۆربەی دانیشتووەکانی کورد بوون، بە هۆی بوونی نەوت لەم پارێزگایەدا بوو. لە دوای ئیمزاکردنی پەیمانی "مۆدرۆس" (سەبارەت بە کۆتاییهێنان بە شەڕ) لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی١٩١٨، ئینگلیز، ویلایەتی موسڵی داگیر کرد. لە راستیدا ئەم داگیرکارییە، بە هۆی بوونی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی کورد بە رێبەرایەتی شێخ مەحموود کە ناوچەی سلێمانی لە ژێر دەستدا بوو، داگیرکارییەکی بچووك بوو. بزووتنەوەی شێخ مەحموود کە لە لایەن سوپای ئینگلیزەوە سەرکوتکرا، نیشانیدا کورد دەسەڵاتی دووبارەی تورکیا یان چوونەناو حکوومەتێکی عەرەبی قەبووڵ ناکات.

بە مەبەستی پێکهێنانی حکوومەتی عێراق، ئینگلیز ئەمیر فەیسەڵ-ی هێنا بۆ عێراق کە لە تەمموزی١٩٢٠ لە دیمەشق دەرکرابوو. لەگەڵ ئەمەشدا، لە کاتی ئیمزاکردنی پەیماننامەی "سیڤەر" لە ١٠ی ئابی ١٩٢٠، ژەنەڕاڵ شەریف پاشا کە ئەفسەرێکی کوردی سوپای عوسمانی و باڵوێزی تورکیا لە ستۆکهۆڵم بوو، توانی داخوازییەکانی کوردەکان بخاتەڕوو. پەیماننامەی "سیڤەر" لە راستیدا دامەزرانی بەرەبەرەی حکوومەتێکی کوردی کە ناوچە کوردنشینەکانی حکوومەتی عوسمانی دەگرتە ناوخۆ، پێشبینی دەکرد. ماددەی ٦٤ی ئەم پەیماننامەیە، تەنانەت دیاریکردنی چارەنووسی موسڵی دابووە دەستی دانیشتووانەکەی. ئەم شەرت و مەرجە دەوڵەتی ئینگلیز (کە پیلانی خۆی بۆ پێکهێنانی عێراق، پێش لە کۆنفرانسی قاهیرە لە ئاداری ١٩٢١ جێبەجێ کردبوو)ی پابەند کرد، کە ریفراندۆمێك لە ویلایەتی موسڵ بەڕێوەببات.

لە گوڵانی ١٩٢١ ریفراندۆم بۆ راپرسی لە خەڵکی موسڵ بەڕێوەچوو. ئەم ریفراندۆمە کە مافی بەشداریکردن تێیدا بە پێی سەروەت و سامان و دارایی خەڵك بوو، یەکجار لاواز بوو و گوشاری ئینگلیز-یش بوو بە بیانوویەکی سادە بۆ ئەوەی کە موسڵ بلکێت بە عێراقەوە. راپرسی دووەم کە لە سەدا ٥٠ دەستێوەردانی تێدا کرابوو، وای کرد کە مەلیك فەیسەڵ ببێ بە پادشای



عێراق. فەیسەڵ لە سەرەتای گەیشتن بە دەسەڵات، پێویستی بەوە بوو کە دان بە دەسەڵاتی پاشایەتیدا بنرێت و لەبەرئەوەی کە خۆی سوننە بوو و زۆربەی خەڵکی عێراق شیعە بوون، پێی ناخۆش بوو. فەیسەڵ هەوڵی خۆی بۆ بەدەستهێنانی کۆنترۆڵی لێبڕاوانەی ویلایەتی موسڵ کە تا ئەو کاتە لە دەستی ئینگلیزدا بوو، دەستپێکرد. ئەو کاتە سنوورەکانی کوردستانی عێراق هێشتا دیار نەکرابوون. بە دەسەڵات گەیشتنی کەمالیستەکان لە تورکیا لە ساڵی١٩٢٢، بووە هۆی ئەوەی مەسەلەی موسڵ دیسان لە لایەن تورکیاوە کە دەیویست دیسان کۆنترۆڵی ئەم ویلایەتە بگرێتەوە دەست، بکەوێتە روو. لە راستیدا لە حوزەیرانی ١٩٢١، کەمالیستەکان هەوڵە ئاژاوەگێڕانەکانی خۆیان دەستپێکرد، کە زۆر سەرکەوتوو بوون. بەهەرحاڵ ئەو یاخیبوونانە کە یەك ساڵ دواتر بە رێبەرایەتی و رێنوێنی ئەفسەری تورك، عەلی شەفیق (ئۆزدمیر) سەریانهەڵدا، سەربازانی ئینگلیزی ناچار کرد لە مانگی ئەیلوول لە سلێمانی بچنە دەرەوە. دەوڵەتی ئینگلیز بۆ پێشگرتن لە تورکەکان، کەڵکی لە شێخ مەحموود وەرگرت. شێخ مەحموود تەنها کەسێك بوو، کە ئەوەندە دەسەڵاتی هەبوو کە کۆتایی بە بێسەروبەرەییەکان بهێنێت. شێخ مەحموود پاش گەڕانەوە بۆ سلێمانی لە تشرینی یەکەمی١٩٢٢، کابینەی وەزیرانی پێکهێناو لە ١٨ی تشرینی دووەم، خۆی ناو نیا "پادشای کوردستان". هەروەها دامودەزگایەکی ئیداریی سەرەتایی دامەزراو رۆژنامەیەك بە ناوی "رۆژی کوردستان" بڵاوکرایەوە.

پەیوەندییەکانی شێخ مەحموودو بریتانیا بە دوو هۆ ئاڵۆز بوو: یەکەم، بارودۆخی ویلایەتی کەرکووك کە بە پێچەوانەی ئامانجی ئینگلیز کە دەیویست بیلکێنێ بە بەغدادەوە، شێخ مەحموود دەیویست سیستەمی ئیداریی ئەوێ بگرێتە دەستی خۆی. دووەم ئەوەی کە بە پێچەوانەی ئەوە کە بریتانیا هیوادار بوو، شێخ مەحموود لەباتی بەڕێوەبردنی هەر چەشنە ئۆپەراسیۆنێك دژی تورکەکان، هەوڵی دەدا بە هاندانی تورکەکانو بریتانیا لە دژی یەکتر، پێگەی خۆی پتەوتر بکات، بەڵام ئینگلیز هێشتا پشتیوانی لە بەیاننامەی هاوبەشی ٢ی ئەیلوولی ١٩٢٢ خۆی و عێراق دەکرد کە تێیدا مافی خودموختاری کورد لە چوارچێوەی سنوورەکانی عێراق بە فەرمی ناسرا بوو، بەڵام هەرەسهێنانی کۆنفرانسی یەکەمی "لۆزان" لە شوباتی ١٩٢٣، وای لە دەوڵەتی ئینگلیز کرد، کە سیاسەتەکانی خۆی بگۆڕێ.

ئینگلیز شێخ مەحموودی تۆمەتبار کرد کە پشتیوانی لە سەرهەڵدانە پارتیزانییەکان دەکات و لەگەڵ راپەڕینی شیعەکان لە باشووری عێراق پەیوەندی هەیە. پاشان فڕۆکەکانی هێزی هەوایی بریتانیا کۆمەڵێك بڵاڤۆکیان لە شاری سلێمانی بڵاوکردەوە تا شێخ مەحموود

خۆی تەسلیم بکات. شێخ مەحموود لە ٤ی ئاداری ١٩٢٣ لە سلێمانی پاشەکشەی کردو لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوڕێیانی، بۆ درێژەپێدانی خەبات پەنای بردە شاخەکان. لە دوای ئەوە، هێزەکانی ئینگلیز بۆ ئەوەی کە پێش لەوە بگرن هێزەکانی شێخ مەحموود تەقلی هێزە تورکەکان بن کە لە ناوچەی رواندز پاشەکشەیان کردبوو، هێرشیانکردە سەر هێزەکانی شێخ مەحموود و لە ئاکامدا رێبەری ناسیۆنالیست، شێخ مەحموود ناچار بوو بچێتە ئێران.

سەرکەوتنی سەربازیی رۆژ لە دوای رۆژی بریتانیا لە رووی سیاسییەوە بە هۆی نەیارێتی رێبەرانی کورد لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ و دەستڕۆیشتوویی شێخ مەحموود (سەرەڕای ئەوەی کە دوورخرابووەوە) لەگەڵ کۆمەڵێك گیروگرفتدا رووبەڕوو بوو. کەوابوو بریتانیا لە حوزەیرانی ١٩٣٠ لە سلێمانی چووە دەرەوە، بەڵام لەبەرئەوەی پێشبینی دەکرد کە شێخ مەحموود بگەڕێتەوە، هەندێك لە ناوچە کوردنشینەکانی لکاند بە ناوچە عەرەبییەکانەوەو بەم شێوەیە خودموختاری کوردەکانی بێ واتا کرد. لە دوای ئەوە کە شێخ مەحموود هەوڵیدا ناوچە کوردنشینەکان دیسان بخاتەوە ژێر دەستی خۆی، هێزی هەوایی بریتانیا لە کانوونی یەکەمی ١٩٢٣وە دەستی کردەوە بە بۆمببارانەکانی خۆی. دوایین راپەڕینی کوردەکان لە ویلایەتی موسڵ پاش هەڵبژاردنی ئاداری ١٩٢٤ لەگەڵ داگیرکردنی دووبارەی سلێمانی لە لایەن بریتانیا لە تەمموزی ١٩٢٤و سەرکوتی راپەڕین بە یارمەتی بۆمببارانە هەواییە نوێیەکانی بریتانیا، رووبەڕوو بووەوە.

پاش ئیمزای پەیماننامەی لۆزان لە تەمموزی ١٩٢٣، "کۆمەڵەی گەلان" لیژنەیەکی ناونەتەوەیی نارد بۆ موسڵ. ئەم لیژنەیە لە کانوونی دووەم هەتا ئاداری ١٩٢٥ لە موسڵ مایەوەو دانی بە زمان و ناسنامەی نەتەوەیی حاشالێنەکراوی کوردەکاندا نا. سەرەنجام لە ١٦ کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ لیژنەی "کۆمەڵەی گەلان" بڕیاری دا موسڵ بلکێنێ بە عێراقەوەو سنووری تورکیا و عێراقیشی دیاریکرد. دەوڵەتی بریتانیا وەك هێزی سەرپەرشتیار لە راپۆرتێکدا بۆ "کۆمەڵەی گەلان" دەربارەی چۆنیەتی سیستمی ئیداریی موسڵ جەختی لەسەر جۆرێك خودموختاری بۆ موسڵ و بە فەرمی ناسینی کوردەکان کردەوە، بەڵام لە کردەوەدا تەنها کەڵکی ئەم پێشنیارە ئەوە بوو کە دەوڵەتی عێراق لەساڵی ١٩٢٦ یاسای زمانە خۆجێیەکانی راگەیاند کە ئیزنی بە کوردەکان دەدا لە پارێزگاکانی سلێمانی و هەولێر لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا بە زمانی کوردی پەروەردە ببینن و بە زمانی کوردی کتێب چاپ بکەن.



بەهەرحاڵ شێخ مەحموود هەرچەند کە لە سنووری ئێران و عێراق پەنای گرتبوو، بەڵام بە تەواوی لە گۆڕەپانی سیاسەتدا نەچووبووە دەرەوە. لە ساڵی ١٩٢٥ دەوڵەتی عێراق هێرشیکردە سەر کۆمەڵێك کورد، کە لە نێو عەشیرەتە ئێرانییە دۆستەکانی خۆیاندا پەنایان گرتبوو. هەروەها ئۆپەراسیۆنێکی هاوشێوەی دیکە لە ساڵی ١٩٢٦ بە هاوکاری سەربازەکانی ئێران دژی کوردەکان بەڕێوەچوو کە شکستێکی زۆر قورسی خوارد. جارێکی دیکە، هێرشەکانی هێزی هەوایی بریتانیا دەستیان پێکرد کە شێخ مەحموودیان ناچار کرد لە پاییزی ١٩٢٦ لەگەڵ هەڵپێسراوی بریتانیایی، کورنوالیس دەست بە وتووێژ بکات، بەڵام نەیانتوانی بگەنە هیچ رێککەوتنێك. ئەو کاتە سەرەڕای ئەو بەڵێنانەی کە دەوڵەتی عێراق سەبارەت بە بەکارهێنانی زمانی کوردی وەك زمانی فەرمی وڵات بە کوردەکان دایبوو، هەموو کوردستانی عێراق سەرپێچی لە قەبوولکردنی سیستەمی ئیداری عەرەبی دەوڵەتی بەغداد دەکرد.

لە ساڵەکانی ١٩٢٦و ١٩٢٧ کۆڕ و کۆمەڵەگەلێکی جۆراوجۆری کوردی دامەزران کە توانیان رۆژ لە دوای رۆژ لە گۆڕەپانی سیاسیدا بەشداری زیاتر بکەن. موسڵ بۆ ماوەیەك بوو بە مەڵبەندی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، بەڵام هێرشەکانی پۆلیس کە بە یارمەتی و پشتیوانی بریتانیا بەڕێوە دەچوون، بوونە هۆی ئەوەی کە کۆڕ و کۆمەڵەکان بە نهێنی چالاکی بکەن.

سەرەڕای بڕیارنامەی "کۆمەڵەی گەلان" سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە رێگای میتۆدەکانی یاسای نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٢٥، کۆنترۆڵی دەوڵەتی بەغداد بەسەر کوردستان، لەو کاتەوە هەتا کاتی راگەیاندنی سەربەخۆیی عێراق لە حوزەیرانی ١٩٣٠، لە راستیدا قایم نەبوو. پەیماننامەی ئینگلیز و عێراق کە کۆتایی بە سەرپەرشتیاری کۆلۆنیالیستی بریتانیا هێنا، هیچ باسێکی لە کورد نەکرد. لە بەرامبەردا، کۆمەڵێك لە گەورەپیاوانی سلێمانی، سکاڵایەکیان بۆ وەبیرهێنانەوەی بڕیارەکانی لیژنەی "کۆمەڵەی گەلان" نارد بۆ ئەم رێکخراوەیە.

ئاڵۆزییەکان بەرزبوونەوە و ٦ی ئەیلولی ١٩٣٠ سەربازانی عێراق هێرشیانکردە سەر خەڵکی سلێمانی کە لە ئاکامدا ژمارەیەکی زور لە خەڵك کوژران. پاشان دەوڵەتی عێراق لەم نائارامیانە بۆ دەستگیرکردنی ناسیۆنالیستە کوردەکان کەڵکی وەرگرت. شێخ مەحموود بڕیاری دا بە ناردنی عەریزەیەکی خەباتکارانە بۆ "کۆمەڵەی گەلان"، گوشار بخاتە سەر ئەم رێکخراوەیە. شێخ مەحموود هەروەها لە پاڵ ئەم هەوڵە دیپلۆماتیکانە، هەوڵی دا شارۆچکەی پێنجوێن بخاتە ژێر دەستی خۆی، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو و هێزەکانی هەرەسیان هێنا.

سەرکوت و گوشارەکان پاش ئەوەی کە "کۆمەڵەی گەلان" داخوازییەکانی کوردەکانی ڕەت کردەوە، دەستی پێکرد. لە نیسانی ١٩٣١ هێزەکانی شێخ مەحموود تووشی شکستێکی قورس بوون. شێخ مەحموود چووە ئێران، پاشان ناچار بوو خۆی تەسلیمی دەوڵەتی عێراق بکات و هەتا کۆچی دوایی لە ژێر چاودێری دەوڵەتی عێراقدا بوو.

## یەکەمین ڕاپەڕینی بارزانی

بنەماڵەی شێخەکانی بارزان لە دەیەی ١٩٣٠ هەتا ئێستا دەورێکی بنەڕەتیان لە بزووتنەوە نەتەوەییەکانی کورددا بینیوە. یەکەمین ڕاپەڕینی بارزانییەکان کە بووە هۆی ئەوەی ناوبانگیان دەربچێت لە سەردەمی عوسمانیدا ڕوویدا کە بە دەستگیرکران و پاشان لە سێدارەدرانی ڕێبەری ئەم ڕاپەڕینە، شێخ عەبدولسەلام کۆتایی پێهات. شێخ ئەحمەد لە ساڵی ١٩٢٧ بە ئامانجی پەرەپێدانی ناوچەی دەسەڵاتی خۆی لە دژی هێزەکانی بریتانیا کە چەند کیلۆمەتر لە بارزان دوور بوون ڕاپەڕی، بەڵام ڕاپەڕینی ڕاستەقینە لە ساڵی ١٩٣١ دەستی پێکرد، واتا کاتێك کە شێخ ئەحمەد چەند پیاوێکی شەڕوانی نارد تا یارمەتی"ڕاپەڕینی ئارارات "بدەن. تورکەکان کە لەم کردەوە یەکگرتوویانە زیز ببوون، دەوڵەتی عێراقیان هاندا دەستێوەردان بکات. دەوڵەتی عێراقیش بە پشتیوانیکردن لە ڕکابەری شێخ ئەحمەد واتا شێخ ڕەشید، بە شێوازی ناڕاستەوخۆ دەستێوەردانی کرد، بەڵام شێخ ڕەشید هەرەسی هێنا. پاش هەرەسهێنانی شێخ ڕەشید، دەوڵەتی بەغدا بە پشتیوانی یەکلاییکەرەوەی هێزی هەوایی بریتانیا، زنجیرەیەك ئۆپەراسیۆنی سەربازیی لە ساڵی ١٩٣١و ١٩٣٢ ئەنجامدا کە بووە هۆی هەرەسهێنانی ڕاپەڕین و شێخ ئەحمەد بۆ سلێمانی دوورخرایەوە. لەگەڵ ئەمەشدا دوو لە براکانی شێخ ئەحمەد، خەباتی چەکدارییان درێژە پێدا کە بووە هۆی نائارامبوونی ناوچە هەتا ساڵی ١٩٣٤.

هاوتەریب لەگەڵ ئەم بزووتنەوانە، حیزبێك کە "هیوا"یان پێ دەگوت لە ساڵی ١٩٤١ سەریهەڵدا. هیوا لە دوو ڕێکخراوی لایەنگری ناسیۆنالیستەکان پێکهاتبوو: یەکەم، "برایەتی" کە لە پاڵ کۆڕ و کۆمەڵە کوردییەکانی قوستەنتەنییە پێکهات و گەورەکان و ڕۆشنبیرانی کوردی لە دەوری یەك کۆدەکردەوە. "برایەتی" لە ژێر دەسەڵاتی شێخ لەتیف، کوڕی شێخ ئەحمەددا بوو. دووەم،"دارکەر" کە کۆمەڵەی پێشکەتنخوازانی کورد و دۆستی حیزبی شیوعی عێراق بوو. تێکەڵبوونی ئەم دوو ڕێکخراوەیە، بەریانە سیاسییەکانی پێشووی (بە تایبەت چەپی مارکسیستی) ڕانەوەستاند. حیزبی نوێ (هیوا) لە بەغداد دامەزراو کۆمەڵێك لقی لە شارە سەرەکییەکانی کوردستان کردەوە.



"هیوا" لە ڕاستیدا پێگەی ڕێکخراوەیی ڕێبەرێکی نوێی سەر بە بنەماڵەی بارزانییەکان بوو، واتا مەلا مستەفا بارزانی. مەلا مستەفا پاش ئەوەی کە لەگەڵ شێخ ئەحمەددا لە سلێمانی کەوتە ژێر چاودێری، تووشی گیروگرفتی ماڵیی بوو. ئەم گیروگرفتانە مەلا مستەفای بۆ هەڵهاتن شێلگیر کرد. بارزانی لە ساڵی ١٩٤٣ توانی لە سلێمانی بچێتە دەرەوەو بگەڕێتەوە بۆ شوێنی لە دایکبوونی خۆی، بارزان. هەوڵەکان بۆ کردنەوەی ڕێگای دیپلۆماتیك لەگەڵ دەوڵەتی بەغداد سەرکەوتوو نەبوون و ڕووداوەکان بە شێوازێکی سەرسووڕهێنەر زیاد بوون.

لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٣ بارزانی کە بە هۆی هێرشەکانی ڕۆژانەی سوپای عێراق، لاواز ببوو، هیوادار بوو دەوڵەتی بریتانیا بە قازانجی ئەو دەستێوەردان بکات. بریتانیاش گوشاری خستە سەر نووری سەعید، کەسایەتی دەسەڵاتداری دەوڵەتی عێراق. نووری سەعید ئاگای لە لاوازبوونی دەوڵەت هەبوو، بۆیە ڕەزامەندی خۆی لەگەڵ وتووێژ دەربڕی. ئەم وتووێژانە کۆمەڵێك بەرهەمی بەرچاویان لێکەوتەوە وەك لێبووردنی گشتیی بۆ ڕاپەڕیوەکان و پاشەکشەی سوپای عێراق.

لە شوباتی ١٩٤٤ بارزانی بە سەرۆکایەتی لێژنەیەك لە نوێنەرانی سەرۆکە کوردەکان چوو بۆ بەغداد، بەڵام بوار بۆ هیچ چەشنە ڕێککەوتنێکی ڕەزایەتبەخش لە نێوان ڕێبەری کوردو دەسەڵاتدارانی عێراقیدا ئامادە نەبوو. بە نزیکبوونەوەی کۆتایی پێهاتنی شەڕ، بریتانیا لە نێوان کوردەکان و دەوڵەت بوو بە ناوبژیکەر تا لەگەڵ یەکدا وتووێژ بکەن و بە چارەسەرییەك بگەن، بەڵام لە هاوینی ١٩٤٥ لە دوای ئەوەی کە دەوڵەتی بەغداد بڕیاریدا ناوەندی پۆلیس دیسان لە سلێمانی بکاتەوە، شەڕ دیسان دەستی پێکردو لە دوای ئەوە کە بریتانیا هیچ دەستێوەردانێکی نەکرد، دۆخەکە ئاڵۆزتر بوو. سەرۆك عەشیرەتەکانی ڕکابەری بارزانی خیانەتیان بە بارزانی کردو بارزانی ناچار بوو لەگەڵ هاوڕێیانی بچێتە ئێران. بارزانی لە ئێران بوو بە فەرماندەی هێزی چەکداری کۆماری کورت تەمەنی مەهاباد. پاش ڕووخانی کۆماری مەهاباد بارزانی چووە سۆڤیەتو ١١ ساڵ لەوێ مایەوە.

سەرنەکەوتنی بارزانی لەو قۆناخەدا لە هەنگاوی یەکەمدا بە هۆی پێکهاتەی عەشیرەتیی کۆمەڵگای کورد بوو. یەکێکی دیکە لە هۆیەکانی، پەیوەندیی بارزانیو "هیوا" بوو، چونکە لەحاڵێکدا کە "هیوا" لە ژێر ڕکێفی باڵی چەپدا بوو و پەیڕەوی لە هێڵی جووڵانەوەی لایەنگری سۆڤیەتو دژی ئیمپریالیستی (واتا دژی بریتانیایی) دەکرد، بارزانی درێژەی بە پێوەندییە باشەکانی خۆی لەگەڵ بریتانیادا دەدا کە کوردەکان زۆر پێویستییان پێی بوو. لە ئاکامدا

"هیوا" تووشی کۆمەڵێك لەتبوونی جۆراوجۆر بوو، هەندێك بوون بە دۆستی حیزبی شیوعی عێراق و هەندێکی دیکە بوون بە موحافەزەکار.

لە سەردەمی کۆماری مەهاباد، مستەفا بارزانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقی (PDK) لە پاڵ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا دامەزراند. پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە ئابی ١٩٤٦ یەکەمین کۆنگرەی خۆی بە نهێنی لە بەغداد بەڕێوەبرد. پێکهاتە (کۆمیتەی ناوەندی و ئەنجوومەنی ڕێبەرایەتی) و بەرنامەی حیزب راستەوخۆ لە ژێر کاریگەریی گەنجان و رۆشنبیرانی پێشکەوتنخوازی بزووتنەودا بوو. بەهەرحاڵ بە هۆی نەبوونی ڕێبەرایەتی (لە ئەنجامی دووربوونی بارزانی) پارتی دیموکرات کەوتە ژێر شەپۆلی سەرکوت و گوشاری پۆلیس و ڕێبەرە سەرەکییەکانی لە کانوونی دووەمی ١٩٤٧دا گیران. ئەو کاتە ئەوەی کە لە پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق مابووەوە، لەژێر کۆنترۆڵی توندی حیزبی شیوعی عێراقدا بوو. پارتی پاشان بوو بە مارکسیست و زۆرتر خەباتی دژە ئیمپریالیستی دەکرد تا نەتەوەیی. ئەو کاتە حیزبی شیوعی عێراق لایەنگری خودموختاری کوردستان بوو و جیاییخوازیی شەرمەزار دەکرد.

## کۆتایی پێهاتنی حکوومەتی پاشایەتی و شەڕی ساڵی ١٩٦١

ژەنەڕاڵ عەبدولکەریم قاسم لە ١٤ تەمموزی١٩٥٨ هاتە سەر دەسەڵات. بە دەسەڵات گەیشتنی قاسم هیوایەکی نوێی لە نێو کوردەکاندا پێکهێنا، چونکە یاسای بنەڕەتی کاتیی ٧ی تەمموزی ١٩٥٨ بۆ یەکەمجار عێراقی بە وڵاتی هاوبەشی عەرەبو کورد دەزانی. لەمە زیاتر یاسای بنەڕەتی مافی نەتەوەیی تایبەتی کوردی لە چوارچێوەی عێراقدا زەمانەت دەکرد. لۆگۆی کۆماری نوێی عێراق، سەمبولێك لە شمشێری عەرەبو خەنجەری کورد بوو، کە لە ناوەڕاستدا گەیشتبوونە یەکدی. بەهەرحاڵ ماددەی ٢ی ئەم یاسایە دەیگوت عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب و کەمینەی کورد لە عارف (کە لەگەڵ سوریا و میسر ببوو بە هاوپەیمان) نارازی بوو. سەرەنجام عەبدولکەریم قاسم کە بە شوێن ئەو پەیڕەو پرۆگرامەدا بووکە لە مۆسکۆ پەسەند کرابوو، بە پشتیوانی کوردو حیزبی شیوعی عێراق بە سەر عارفدا سەرکەوت. پاش رووخانی سیستەمی پاشایەتی، بارزانی گەڕایەوە بۆ عێراق و لە میانەی سەردانی خۆی بۆ قاهیرە، چاوی بە جەماڵ عەبدولناسر کەوت.

بارزانی لە عێراق وەك پاڵەوانێك پێشوازی لێکرا. پاشان گەڕایەوە بۆ بارزان و لەوێ بەدیداری شێخ ئەحمەدی برای شادبوووە. ژنەراڵ بارزانی ئەو کاتە لایەنگری سۆڤیەت بوو و



دۆستی زۆر نزیکی حیزبی شیوعی عێراق بوو، هەر بۆیە راپەڕینی لایەنگرانی عارف لە ئاداری ١٩٥٩ لە موسڵ بە دەستی میلیشیا کوردەکان کە دەوروبەری شاریان گرتبوو، سەرکوتکرا کە بووە هۆی کوژرانی چەند سەد کەس. لەو کاتە بە دواوە، یەکێتیی نێوان قاسم و پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق و حیزبی شیوعی عێراق بەنرخی رووبەڕووبوونەوەی رۆژ لە دوای رۆژی پارتی و حیزبی شیوعی ئیمزا کرا. بارزانی لە گوڵانی ١٩٥٩ لە میانەی راپەڕینی ڕێبەرانی رواندز کە لە چاکسازی زەوییەکان و هاتنی میلیشیاکانی شیوعی تۆقی بوون، تووشی پاشگەزبوونەوەیەکی لەناکاو بوو. راپەڕینەکە بە خێرایی کۆنترۆڵ کرا، بەڵام ٢٠ هەزار کەس ئاوارەی ئێران بوون. لەم سەروبەندەدا بوو، کە بارزانی زانی کە گەشەی حیزبی شیوعیی عێراق دەبێتە هۆی خنکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، هەر بۆیە بارزانی بڕیاری دا ڕێبەرایەتی پارتی دیسان بگرێتە دەست و حیزبی شیوعی بەوە تاوانبار کرد، کە هەوڵی داوە بیکوژێت. بارزانی هەروەها دەستی لە لایەنگری شیوعییەکان هەڵگرت و لایەنگری لە گرووپی نوێی گەنجە رۆشنبیرەکان واتا ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانیی زاوای کرد.

دەرکردنی شیوعییەکان لە پارتی ئاکامی قەدەغەبوونی حیزبی شیوعی لە ژانویەی ١٩٦٠ لە لایەن قاسمەوە بوو. پارتی هەروەك جاران یاسایی مایەوە، بەڵام لە دوای ئەوە کە قاسم داوای لە بارزانی کرد بە بەرنامەی خودموختاریدا بچێتەوە، ناکۆکی نێوان قاسم و ژەنەڕاڵ بارزانی بەرز بووەوە. ئەم داخوازییە لە لایەن کۆنگرەی پارتییەوە رەتکرایەوە. ژەنەڕاڵ بارزانی بە کۆمەڵێك هۆی هەڵسێنگێندراو، ڕێگەی دا نوێنەرانی پارتی لە دەوڵەتی عێراق دەر بکرێن و بە شوێن پشتیوانی مۆسکۆدا گەڕا. بارزانی ٢ مانگی کۆتایی ساڵی ١٩٦١و سەرەتای ساڵی ١٩٦٢ لە مۆسکۆ بوو و توانی دەربارەی بابەتە پەیوەندیدارەکان لەگەڵ خرۆشچۆف باس و گفتوگۆ بکات. بەڵام پچڕانی پێوەندییەکانی بارزانی و قاسم، شتێکی مسۆگەر بوو. رۆژنامە کوردییەکان داخران، ڕێبەرانی پارتی دەستگیرکران و ژەنەڕاڵ بارزانی چووە بارزان. قاسم کە هەڵوێستێکی یەکجار ناسیۆنالیستی گرتبوو (بە تایبەت بە پشتیوانیکردن لە بانگەشەکانی عێراق لەسەر کوێت) شەڕێکی لەگەڵ کوردەکان بەڕێخست کە سەرەڕای چەندین ئاگربەست هەتا ئەم چەند ساڵەی دوایی درێژەی هەبوو.

لە سەرانسەری ئەم ساڵانەدا مێژووی کوردستانی عێراق بە شێوازێکی وەکو خۆی دووپات دەبووەوە واتا لە کاتێك کە دەوڵەتی ناوەندی لاواز دەبوو، کۆمەڵێك ئیمتیاز (پوان) ی نەتەوەیی دەدا بە کورد، بەڵام کوتوپڕ لە دوای ئەوەی کە دەوڵەت بەهێز دەبوو، داخوازی

کوردەکانی دەربارەی خودموختاری (کە بە بیروڕای ئەوان ئەگەری ئەوەی هەبوو هەموو کاتێ ببێ بە سەربەخۆیی) ڕەتدەکردەوەو جارێکی دیکە دەستی دەکرد بە هێرش بۆ سەر کوردستان. ئەو کاتە پێکدادان لە نێوان عەشیرەتی بارزانی و زێباری (کە هەر لە کۆنەوە ناکۆك بوون) دەستی پێکرد. ئەم پێکدادانانە پاشان کەم بووەوە، بەڵام شەپۆلێك نائارامی لە کوردستان پێکهێنا کە دەوڵەتی عێراق وەك بیانوویەك بۆ ناردنی سوپا لە ئەیلوولی ١٩٦١ کەڵکی لێوەرگرت.

نەبوونی "پارتی"و لە ئاکامدا نەبوونی هەرچەشنە هێزێکی میلیشیایی بەڕێکخستنکراو، هۆی هەرەسهێنانی کوردەکان لە ساڵەکانی سەرەتای شەڕدا بوو. لە دوای ئەوە ژەنەڕاڵ بارزانی و چەند سەد کەس لە هاوڕێیانی، بارزانیان بەجێهێلا و چوونە شاخەکانی زاخۆ، دوور لە هێزەکانی عێراق، بەڵام لە دوای هەوڵە سەربازییەکانی "پارتی"، بارودۆخی راپەڕیوان بە شێوازێکی بەرچاو پتەوتر بوو، بەڵام بزووتنەوە تووشی لەتبوون بوو.

بەهەرحاڵ کەسایەتی بارزانی خۆی لەناو خەباتدا نیشان دا. بارزانی سەمبۆلی بەرخۆدانی کورد بوو و پارتی پێی خۆش بووایا یان پێی ناخۆش بووایا ئەوی وەك کەسایەتی سەرەکی بزووتنەوە بە فەرمی دەناسی.

پەیوەندییەکانی بارزانی و یەکێتی سۆڤیەت لەو کاتەوە کە مۆسکۆ هەوڵی دەدا بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بکێشێتە ناو ئێران و تورکیا، روویان لە خراپی کرد. ئێران و تورکیا وڵاتانێك بوون کە دەوڵەتی روسیا دەیەویست ناسەقامیگرییان بکات. ژەنەڕاڵ بارزانی دەیزانی کە بەرفراوانبوونی ناکۆکییەکان دەبێتە هۆی مەرگی بەرەبەرەی ستراتیژیی ئەو و بە لەبەرچاوگرتنی ئەم راستییە کە یەکێتی سۆڤیەت سەرەکییترین پشتیوانی سەربازیی عێراق بوو، هەموو رێگاچارەکانی رەتکردەوە.

ساڵی ١٩٦٢ ساڵی پێشکەوتنی گرینگ بۆ کوردەکان بوو. کورد هەموو ناوچەکانی باکووری کوردستانی عێراقیان لە زاخۆ هەتا سنووری ئێران لە دەستدا بوو. سەرەڕای لێهاتوویی سەربازیی پێشمەرگەکان، یەکێك لە هۆیەکانی ئەم سەرکەوتنەی کوردەکان، سەرقاڵبوونی سەربازانی عێراق لە باشووری وڵات لە قەیرانی کوێتدا بوو. میلیشیا کوردەکان واتا جاشەکانیش کە سەر بە عەشیرەتەکانی نەیاری بارزانی بوون، لە دەرەوەی سنووری خۆیان کاریگەرییەکی زۆریان نەبوو. لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٢ سوپای عێراق تەنها لە دەشتەکان -وەك کەرکوك کە خاوەن نەوت بوو-و بە یارمەتی هێزی هەوایی توانی هەرەس بەبەشێکی بەرچاو لە



کوردەکان بهێنێت. ئەم پاشگەزبوونەوە کە رق و کینەیەکی زۆری لە نێو سوپا و ناسیۆنالیستە عەرەبەکاندا پێکهێنابوو، بۆ قاسم گران تەواو بوو. نەیارانی رژێم لە نیسانی١٩٦٢ لەگەڵ "پارتی"دا پێوەندییان گرت و کۆمەڵێك بەڵێنیان (هەرچەند زارەکیی بوون) سەبارەت بە خودموختاری کوردستان دا بە "پارتی". دەسەڵاتی قاسم کۆتایی هاتو پاش دادگایی کردنێکی کورت، لە ٩ی شوبات لە بەرامبەر کامێرای تەلەفیزیۆنەکان ئیعدام کرا.

## شەڕی یەکەمی بەعس و ناسیۆنالیزمی عەرەبیی ژەنەڕاڵ عارف: ١٩٦٣ـ١٩٦٨

بە دەسەڵات گەیشتنی حیزبی بەعس (کە دارێژەرانی سەرەکیی کودیتا لە دژی قاسم بوون) بە تایبەت دادگاییکردنی خوێناوی شیوعییەکانی بە شوێنەوە بوو. دەوڵەتی نوێ دەستبەجێ لەگەڵ جەلال تاڵەبانی کە لێژنەیەکی کوردی رەوانەی بەغداد کردبوو، دەستیکرد بە وتووێژ. ئەمە لە حاڵێکدا بوو کە بە پێچەوانەی هیواکانی حیزبی بەعس، جەماڵ عەبدولناسر پشتیوانی لە بزووتنەوەی کورد دەکرد. ئەمە دەوڵەتی بەغدادی ناچار کرد کە لە ٩ی ئاداری ١٩٦٩ پاش برێك خۆبواردن، بە شێوازی ناڕاستەوخۆ مافی نەتەوەیی خەڵکی کورد لە چوارچێوەی ناوەندنەپارێزی (لامرکزیە) دا بەفەرمی بناسێ. لە راستیدا ئەم رێککەوتننامەیە شتێك زیاتر لە پێشەکییەك بۆ پچڕانی پەیوەندییەکانی حیزبی بەعسو کورد کە رێك یەك مانگ دواتر (لە نیساندا) روویدا، نەبوو. ئەمە سەرەتای دەستپێکردنی زنجیرەیەك رووداو بوو، کە لە کۆتاییدا بوونە هۆی دەستپێکردنی شەڕ کە لە حوزەیران هەتا تشرینی دووەمی ١٩٦٣ درێژەی کێشا.

لە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لە پاڵ بەرنامەی چاکسازیی ئیداری دەوڵەت کە کوردستانی بەسەر دوو پارێزگای سلێمانی و هەولێر دابەش دەکرد، شەڕ لە دژی ژەنەڕاڵ بارزانی راگەیەندرا. شەڕ بە تاڵانی ناوچە کوردنشینەکان بە دەستی سوپای عێراق دەستی پێکرد. سەدان کەس لە سلێمانی بە کۆمەڵ کوژران کە ئیسقانەکانیان پاشان لە گۆڕە بەکۆمەڵەکاندا دۆزرانەوە.

بە دەسەڵات گەیشتنی حیزبی بەعس، دوو داهێنانی نوێی لەگەڵدا بوو: یەکەم "هێرشی توندی سەربازی بۆ تێکشکاندنی شۆڕش"و دووەم "سیاسەتی تەعریبی ناوچە کوردنشینەکان". ٤٠ هەزار کەس لە ناوچەی ستراتیژیی کەرکوك (بە هۆی نەوتەکەیەوە) دەرکران. کوردەکان کە لە دژی سوپای تەیاری عێراق راپەڕیبوون، بۆ ئەوەی لە مردن رزگاریان بێت، پەنایان بۆ شاخان برد. لە ئاستی نێونەتەوەییشدا، یارمەتیدانی لیوای سەربازیی سوریا بە سوپای عێراق لە دژی کوردەکان، پێگەی دەوڵەتی عێراقی پتەوتر کرد

و کوردەکانی زۆرتر لە جاران گۆشەگیر کرد. ولاّتانی رۆژئاواش کە بە رووخانی قاسم لە دەستی شیوعییەکان رزگار ببوون، سیاسەتی بێدەنگیان لە بەرامبەر دەولّەتی عێراق گرتەپێش و قەت لە دژی عێراق نارەزایەتییان دەرنەبڕی. بەلاّم دەولّەتی سۆڤیەت کە نیگەرانی دادگاییکردنی شیوعییەکان و لە دەستچوونی دەسەلاّتی خۆی بوو، دەستیکرد بە پشتیوانیی دیپلۆماتیك لە کوردەکان، بەلاّم لە دوای کاردانەوەی توندی دەولّەتە عەرەبییەکان، دەستی لە خستنەڕووی مەسەلەی کورد لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان هەلّگرت.

ئامانجی سوپا بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کورد بە شێوازی سەربازیی، سەلمێندرا کە نالویّ و ئەمەش شەڕی کێشایە نێو بنبەست، بەلاّم رووخانی حیزبی بەعس لە تشرینی دووەمی ١٩٦٣ کە بە هۆی ناکۆکییە ناوخۆییەکان روویدا، ئەم بنبەستەی شکاند. پاش ئەوە ژەنەڕالّ عارف کە کەسایەتی دەسەلاّتداری عێراق بوو لە بارەی ئاگربەست لەگەلّ بارزانی باس و گفتوگۆی کردو هەندێك بەلّێنی دەربارەی خودموختاری کوردستان دا بە بارزانی.

شەڕ دیسان لە نیسانی ١٩٦٥ دەستی پێکردەوە، بەلاّم لەم ماوە کورتەدا بارزانی توانی هێزێك پێکبێنێ کە هەتا سالّی ١٩٧٥ لە بەرامبەر هەموو چەشنە هێرشێك خۆی رابگرێ. لە بنەڕەتدا ناوچە گوندی و شاخاوییەکان کە لەگەلّ تورکیاو هەتا رادەیەك ئێران هاوسنوور بوون لە دەستی ژەنەڕالّ بازرانیدا بوون و بارزانی تێیاندا دەسەلاّتی تەواوی هەبوو. لە سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ دوو لە کوڕەکانی ژەنەڕالّ بارزانی، واتا ئیدریس و مەسعوود بارزانی-ش بوون بە بەشێك لە کادری رێبەرایەتی شۆڕش.

لە کۆتایی سالّی١٩٦٤، کۆمەلّێك پێکدادان لە نێوان پێشمەرگەکان و سوپای عێراق کە دەیەویست دیسان بەسەر کوردستاندا زالّ بێ، روویدا، بەلاّم کەشوهەوای زستان نەیهێشت شەڕ توندتر بێ. لە دوای زستان، دەولّەتی عارف بە هەموو هێزی سوپای عێراق (نزیکەی ٥٠ هەزار کەس) هێرشی کردو شەڕ دەستی پێکردەوە. لەو هەلومەرجەدا، پێشمەرگەکان تەنها بە یارمەتی ئێرانییەکان (لانیکەم خواردەمەنی و ژمارەیەك چەکی قورسی ئێران) توانیان بەسەر شەڕدا زالّ بن. ئەم یارمەتییە لە زستانی ١٩٦٥و ١٩٦٦ درێژەی هەبوو. یارمەتییەکانی ئێران سەرەتا لە لایەن کوردە خەمخۆرەکانی ئێرانەوە دەهات، بەلاّم لە هاوینی ١٩٦٥ کە شا سەرەڕای نارەزایەتی دەربڕینی دەولّەتە عەرەبییەکان و دەولّەتی عێراق، بڕیاریدا پشتیوانی لە بارزانی بکات، ئەم یارمەتییانە ئاستێکی دیکەیان پەیدا کرد.





پێکدادانە توندەکانی گولاّن و حوزەیرانی ١٩٦٥ وای لە کوردەکان کرد شاخی هەندەرێن وەك خۆی رابگرن. کۆنترۆلّی ئەم ناوچەیە، دەبووە هۆی دەستڕاگەیشتن بە جادەی هامیلتۆن کە کوردستانی عێراقی بە ئێرانەوە پەیوەند دەداو ئامرازی پەیوەندیی کوردەکان لەگەلّ جیهانی دەرەوە بوو. پێداگرتنی کوردەکان لەسەر مانەوە لە شوێنی خۆیان و تەنانەت توانایی بۆ هێرشکردنە سەر هێزەکانی عێراق، سوپای ناچار کرد لەو ناوچەیە پاشەکشە بکات. گرنگترین مەسەلەیەك کە بووە هۆی سەرکەوتنی بارزانی، مانەوەی پێشمەرگەکان لە بنکەکانی خۆیان بوو.

هەرەسهێنانی هێزەکانی عێراق و هەروەها مەرگی مارشال عارف کە چەند رۆژ پێش لە هێرشەکە روویدا، بووە هۆی ئەوەی لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦، وتووێژەکان دەست پێ بکەنەوە کە رێککەوتننامەی ئاگربەست و بە فەرمی ناسینی مافی نەتەوەیی کوردیان لێکەوتەوە. لەمە زیاتر فەرمانی لێبووردنی گشتیی دەرکراو زمانی کوردی وەك زمانی رەسمی ولاّت قەبوولّکرا. ئەم رێککەوتننامەیە زۆرتر لە ئاشتییەکی سەربازی دەچوو تا چارەسەرکردنی کێشەی کورد.

لەگەلّ ئەمەشدا لە سالّی ١٩٦٦ هەتا ١٩٦٩ خودموختاری کوردستان وای لە بارزانی کرد سیاسەت و تەنانەت دیپلۆماسییەکی تا رادەیەك سەربەخۆ بەڕێوە ببات. بۆ نموونە لە میانەی شەڕی عەرەبەکانو ئیسرائیل (شەڕی ٦ رۆژە) بارزانی لە ناردنی ژمارەیەك پێشمەرگە (هەرچەند بە شێوازی سەمبۆلیك بێ) بۆ شەڕکردن لە پالّ سوپای عێراق سەرپێچیکرد. تەنانەت لە نێوان بارزانی و ئیسرائیل -کە لەوانەیە پشتیوانی لە سوپای بارزانی کردبێ- پەیوەندی دروست بوو. بارزانی هەروەها پەرەی بە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەلّ "شا"ی ئێران دا. لە بەرامبەردا شا داوای لە بارزانی دەکرد یارمەتی بزووتنەوەی کوردی ئێران نەدات.

گەڕانەوەی حیزبی بەعس بۆ سەر دەسەلاّت لە سالّی ١٩٦٨ خالّی سەرەتای شەڕێکی نوێ بوو.

## شەڕی دووەمی بەعس و رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠

حیزبی بەعس کە لە خولی یەکەمی دەسەلاّتداری خۆی کۆمەلّێك بیرەوەری خراپی لە دوای خۆی بەجێهێشتبوو، سەرەتا وادیار بوو کە پڕکردنەوەی درزەکانی نێوان دەولّەت و کوردەکانی هەلّبژاردووە تا قوولّترکردنی. ئەو کاتە دوو کەس لە هاوڕێیانی وەفاداری بارزانی بوون بە وەزیر لە دەولّەتی عێراق. لە سەرەتای ئەم قۆناخەدا پێشمەرگەکانی بارزانی تووشی زەبرگەلّێك بوونو دەستیان لە شەڕ هەلّگرت، بەلاّم لە ئاداری ١٩٦٩ هێرشیانکردە سەر دامەزراوە نەوتییەکانی

کەرکوك، بەڵام ئەو ئەنجامەی کە چاوەڕوانیان دەکرد، وەرنەگرت، چونکە دەوڵەتی بەغداد ٤ سوپای سەربازیی بۆ هێرش نارده کوردستان.

هێرشی هاوینی ١٩٦٩ سەرەڕای ئەوەی کە بەرفراوان بوو، هیچ ئاکامێکی لێبڕاوانەی لێنەکەوتەوە بەڵام دەوڵەتی عێراق کە لەگەڵ مەترسی لەناوچوون بەرەوڕوو ببوو، وتووێژی هەڵبژارد و سەدام حوسێن سەرەڕای دژایەتییە فراوانەکانی سوپا، هەوڵی دا ڕێککەوتننامەیەك لەگەڵ بارزانی ئیمزا بکات، کە سەرەنجام لە ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ئیمزا کرا.

لە میانەی ئەو چەند مانگ شەڕە، سوپای عێراق کۆمەڵێك ئۆپەراسیۆنی جۆراوجۆری دژی خەڵکی مەدەنی جێبەجێکرد. بۆ نموونە لە ١٩ی ئابی١٩٦٩ سەربازانی عێراقی لە دەرکی ئەشکەوتێك کە خەڵکی گوندی "دەکا" (سەر بە شێخان) تێیدا پەنایان گرتبوو، ئاگریان کردەوەو لە ئاکامیدا ٦٧ ژن، پیاو، پیرەژن و پیرەمێرد خنکان. هەروەها لە ئەیلوولی ١٩٦٩، هێزەکانی عێراق بە تانك گوندی "سیریجا" لە ناوچەی زاخۆیان گەمارۆداو پاشان کاولیان کرد. لە خەڵکی گوندی "چالّدین" تەنانەت یەك کەسیش زیندوو دەرنەچوو. بەپێی ڕاپۆرتی ئەنجوومەنی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ لە کوردستان لێکۆڵینەوەی کردووە، لە ئاکامی شەڕدا ٣٠٠ گوندی کوردنشین کاولکراون، ٤٠ هەزار خانوو ڕووخاون و ٣٠٠ هەزار کەس ئاوارەو دەربەدەر بوونە.

لە کورتخایەندا ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ بووە هۆی ئازادبوونی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، لاچوونی هێزە میلیشیاکان و دەرچوونی لێبووردنی گشتیی. ئەم ڕێککەوتننامەیە تەنانەت پێشبینی سەرژمێرییەکی دەکرد بۆ ئەوەی سنوورەکانی کوردستانی خودموختار دیاری بکرێن، بەڵام قەد جێبەجێ نەکرا. ناکۆکی حیزبی بەعس و کوردەکان لەسەر ناوچەی کەرکوك بوو، لەبەرئەوە کە دەوڵەت ئەم ناوچەیەی نەدەخستە نێو هەرێمی کوردستان. لە ساڵی ١٩٧٢ شەڕ دیسان دەستی پێکردەوەو هەوڵدان بۆ کوشتنی بارزانی، سەرەنجام پێوەندییەکانی حیزبی بەعس و کوردەکانی پچڕاند. پەیمانی دۆستایەتی نێوان عێراق و سۆڤیەت لە نیسانی ١٩٧٢ هیچ ڕێگایەکی سەبارەت بە هاوپەیمانییەکان بۆ بارزانی نەهێشتەوە. بارزانی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ شای ئێران کە بۆ ماوەیەك پچڕا بوو، تازە کردەوە. لە لایەکیترەوە، دەوڵەتی ئەمریکا کە لە سیاسەتی سەدام حوسێن لە مەڕ لایەنگری لە سۆڤیەت نیگەران بوو، لە نێوان ئابی ١٩٧٣و ئاداری ١٩٧٥ لە ڕێگای CIA (دەزگای هەواڵگری ئەمریکا) وە ١٦ملیۆن دۆلار یارمەتی بارزانی دا. ژەنەڕاڵ بارزانی بەر لە هەموو شتێك ئەم یارمەتییە تۆزقاڵەی وەك گارانتی ئەخلاقی پشتگیری ئەمریکا لە قەڵەم دەدا.



لە دوای هەوڵێکی دیکە بۆ کوشتنی بارزانی لە تەممووزی ١٩٧٢، پێنج کەس لە وەزیرە کوردەکانی دەوڵەتی عێراق، بەغدادیان بەجێ هێشت و ڕوویانکردەوە کوردستان. لەو کاتە بە دواوە، هیچ پێوەندییەکی ئازاد لە نێوان کوردستان و شوێنەکانی دیکەی عێراقدا لە ئارادا نەبوو. لە حوزەیرانی ١٩٧٣، ژەنەڕاڵ بارزانی لە ڕێگای ڕۆژنامەی "واشنگتۆن پۆست" داوای لە ویلایەتە یەکگرتووەکان کرد یارمەتی بەرخۆدانی کورد بدات. ئەم داواکارییە هیچ ئاکامێکی جگە لە ڕاوەستانی وتووێژی تاقیکاریی کوردەکان‌و دەوڵەتی لێنەکەوتەوە و کۆتایی بە گۆشەگیری کوردەکان نەهێنا کە بە هۆی یەکێتی ڕۆژ لە دوای ڕۆژی حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی عێراق توندتر دەبوو. تەنانەت هەڵوێستی حیزبی شیوعی بە نیسبەت کوردەکان ئەوەندە توند و خراپ بوو کە بووە هۆی پێکدادان لە نێوان ئەم حیزبە و پارتی دیموکراتی کوردستان.

دەستبەجێ لە دوای ئەوە کە شەڕ دیسان دەیەویست دەست پێبکاتەوە، شەڕی عەرەبان‌و ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٧٣ هەلێکی چەند مانگەی بۆ کوردەکان ڕەخساند. ژەنەڕاڵ بارزانی هەرچەند کە پەیامێکی هاوگرتنی بۆ دەوڵەتی عێراق نارد، بەڵام دەیەویست دەست بە شەڕێکی بەرفراوان لە دژی سوپای عێراق بکات، بەڵام بە مۆچیاری کیسینجەر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دەستی لەم بیرۆکەیە هەڵگرت. کیسینجەر لەوە دەترسا کە سەرکەوتنی پێشمەرگەکان درەنگ یان زوو گیروگرفت بۆ هاوپەیمانە ئێرانییەکەی دروست بکات.

سەدام حوسێن بەر لەوەی خۆی بۆ تاقیکردنەوەی دەسەڵات حازر بکات، هەوڵیدا بە ڕەزامەندی یان بێ ڕەزامەندی پارتی دیموکراتی کوردستان جۆرێك خودموختاری بەسەر کوردەکاندا بسەپێنێت تا هەم مانۆڕێك بداو هەم کەسایەتییە بلیمەتەکانی کورد بۆ لای خۆی رابکێشێت. وتووێژەکانی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و دەوڵەتی عێراق، سەرەڕای ئەو هەموو چاوپێکەوتنانە کە ئیدریس بارزانی لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەت ئەنجامیدا، لە پاییزی ١٩٧٣و پاش بەهاری ساڵی ١٩٧٤ بێ ئەنجام مانەوە. ئەمە بێگومان هەر ئەو شتە بوو کە سەدام حوسێن دەیویست. ئەم وتووێژانە لە ١١ی ئاداری ١٩٧٤ بە ڕاگەیاندنی یەکلایەنەی خودموختاری کوردستان لە لایەن دەوڵەتەوە کۆتایی پێهات.

## شەڕی ١٩٧٤ـ ١٩٧٥

شەڕ بە تۆپبارانی دەوڵەتی عێراق لەسەر سنووری ئێران لە شوباتی ١٩٧٤ دەستی پێکرد، بەڵام سوپای عێراق هێرشی ڕاستەقینەی خۆی لە نیسانی ١٩٧٤ دەستپێکرد. ئامانجی سوپای

عێراق، ئازادکردنی بنکەی زاخۆ بوو و پاش شەڕێکی سەخت گەیشتە ئەم ئامانجەی خۆی. لەم شەڕەدا هێزی هەوایی عێراق بە تایبەت فڕۆکەکانی تۆپۆلۆف ٢٢ی سۆڤیەت کە گوندە کوردنشینەکانی بۆمبباران دەکرد، دەورێکی سەرەکییان بینی. هێرشی یەکلاییکەرەوە بۆ سەر مۆڵگەی هێزە کوردەکان لە هاویندا ئەنجامدرا. بە سەدان تانکی T62 هێرشیان کردە سەر رواندز و قەڵادزێ. بە هۆی هێرشی هەوایی و تانکەکانی عێراق، هێزە کوردەکان لە ١٩ی ئاب لە قەڵادزێ و لە ٢٢ی ئاب لە رواندز هەرەسیان هێنا. شەڕ ئەوەندە سەخت بوو، کە هەزاران کورد ئاوارە بوون. ئێران پەنای بە ١١٠هەزار کەس لەم ئاوارانە لەسەر سنوور دا. بەهەرحاڵ دواپین شوێنی ستراتژی واتا شاخەکانی هندرێن و زۆزك کە بەسەر جادەی هامیلتۆندا زاڵبوون، هێشتا لە دەستی کوردەکاندا بوو.

لە مانگی ئەیلوول، ٣٠٠ تانك و ٣٠ هەزار سەربازی پیادەی رێژیمی عێراق کە بەشی هەرەزۆری سوپای عێراقیان پێکدەهێنا، بۆ هێرشی کۆتایی بۆ سەر شوێنی کوردەکان، لە نزیکی شاخی زۆزك مۆڵیان خوارد، بەڵام پاش شەڕێکی یەکجار قورس، سوپای عێراق پێش گرتنی شاخی زۆزك، لە ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ لە چۆمی چۆمان، هەرەسێکی قورسی هێنا. لە هەمانکاتدا دەوڵەت هاوکات لەگەڵ درێژەپێدان بەم هێرشانە، ئینیستوتەکانی ناوچەی خودموختاری کە لە دەستی هاشم عەقراویدا بوون، داخست. بارودۆخەکە لە باکووری رۆژئاوا زۆر خراپتر بوو، چونکە دەوڵەتی عێراق رێگای گەیشتنی پێداویستییەکانی بە کوردەکان گرتبوو و بوونی سوپای تورکیا لەو دیوی سنووریش پەیوەندی کوردەکانی لەگەڵ دونیای دەرەوە پچڕاندبوو. بەهەرحاڵ سەرەڕای ئەوەی کە جادەی بادینان هێشتا کراوە بوو، بارودۆخی تەندروستی و خواردەمەنی لە میانەی پاییز، رۆژ بە رۆژ خراپتر دەبوو. شایانی ئاماژەپێکردنە کە لە کاتی هەڵوەشانەوەی بەرخۆدانی کوردەکان، دوکتۆر ئەلیکساندری ئەڵمانی کە لە ناوچەدا کاری دەکرد بە دەستی دەوڵەتی عێراق گیراو بە هۆی ئەوە کە بە رەگ و رەچەڵەك یەهوودی بوو، پاشان ئیعدام کرا.

وەرچەرخانی بەرچاوی هاوپەیمانییەکان کە بووە هۆی سەرنەکەوتنی بەرخۆدانی کورد، هەر لە چەند مانگ پێشەوە لە سەروبەندی پێکهاتندا بوو. دەوڵەتی ئێران هیوادار بوو لە رێگای یارمەتیدان بە ژەنەڕاڵ بارزانی، گوشار بخاتە سەر عێراق تا بە پەیماننامەی گولانی ساڵی ١٩٣٧ دەربارەی رووباری شەتولعەرەب دابچێتەوە و بە گشتیی بە هۆی ئەوەی کە عێراق تەنها حکوومەتێکی عەرەبی بوو، کە دەیتوانی وەك هێزێکی ناوچەیی لەگەڵ ئێراندا



ململانێ بکات، ئێران دەیویست هێزی عێراق کەمبکاتەوە. لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥ شای ئێران هەستی بەوە کرد کە کاتی ئەوە هاتووە بەرهەمە دیپلۆماتییەکانی یارمەتیدان بە کوردەکان کۆبکاتەوە. رێژیمی عێراق-یش ئامادە بوو، بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕێکی پڕ خەرج و بێ ئەنجام، لەگەڵ ئێران رێك بکەوێت.

یەکەم پەیوەندییەکانی نێوان ئێران و عێراق لە سەرەتای پاییزی ساڵی ١٩٧٤ بە پشتیوانی ئەنوەر سادات، مەلیك حوسەین، پادشای ئۆردۆن و پریزیدێنت بومیدین، سەرۆك کۆماری جەزاییر گیراو سەرەنجام لە کۆبوونەوەی "ئوپێك" لە ساڵی ١٩٧٥ لە جەزایر، روخسارێکی هەستپێکراوی بە خۆوەگرت. لەم کۆبوونەوەیەدا سەدام حوسێن و شای ئێران لەگەڵ یەك رووبەڕوو دانیشتن و سەرەنجام رێککەوتننامەیەکیان ئیمزاکرد، کە تێیدا بڕیار درا سنووری هەردوو وڵات بە توندی کونترۆڵ بکرێت، لە بەرامبەردا سنووری وشکاییو دەریایی نێوان دوو وڵات بە قازانجی ئێران دیسان دیاری بکرێتەوە.

لە هەمان رۆژەکانی سەرەتای ئیمزاکردنی رێککەوتننامەی ئێران و عێراق، دەوڵەتی ئێران تۆپ و چەکە دژە هەواییەکانی خۆی لە کوردستان بردە دەرەوە، لە ئاکامدا بە هۆی گوللەبارانی قورس و بەردەوام و هێرشی بەرفراوانی رێژیمی عێراق هەڵوەشانەوەی بەرخۆدانی کوردەکان مسۆگەر بوو. لەگەڵ ئەمەشدا پێشمەرگەکان ئاگری شەڕیان تیژترکرد و تەنانەت توانیان لە ناوچەی رواندز پاشەکشە بە هێزەکانی دەوڵەت بکەن.

لەسەر داواکاری شا، دەوڵەتی عێراق ئاگربەستێکی یەکلایەنەی راگەیاند تا دەرفەت بۆ شەڕکەران بڕەخسێت چەکی خۆیان دانێن و بچنە ئێران.

## پێشکەوتنی بەرەبەرەی حزبە کوردەکان لە دەیەی ١٩٨٠

هەتا ساڵی ١٩٧٥ گۆڕەپانی سیاسیی کورد بە تەواوی لە دەستی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق و کەسایەتی بارزانیدا بوو. ئەوکاتە کۆمەڵێك کێشمەکێش و ناکۆکی لە نێوان حزبە جۆراوجۆرەکاندا- کە بە تەواوی لەگەڵ یەکدا نایەکسان بوون و لانیکەم هەتا دەستپێکردنی شەڕی ئێران و عێراق هیچ چەشنە بنەمایەکی قایمیان لە کوردستاندا نەبوو- لە ئارادا بوو.

یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (PUK) کە لە هاوینی ١٩٧٧ وەك رێکخراو سەریهەڵدا لە چەند بزووتنەوە پێکهات و جەلال تاڵەبانی بوو بە سەرۆکی. جەلال تاڵەبانی لە دیمەشق،

کۆمیتەی ئامادەکاری "یەکێتی نیشتیمانی" پێکهێنا کە دوو گرووپی دەگرتە ناوخۆ: "کۆمەڵە" و "حیزبی سۆسیالیستی کوردستان". "کۆمەڵە" حیزبێکی مارکسیستی ـ لینینیستی بوو کە جیاواز لە حیزبی شیوعی عێراق، لە حوزەیرانی ١٩٧٠ دامەزرابوو. "کۆمەڵە" کە هەتا ساڵی ١٩٧٥ نهێنی بوو، لە حوزەیرانی ئەم ساڵەوە دەستی کرد بە ڕێکخستنکردنی کۆمەڵێك گرووپی بچووکی بەرخۆدانی. "حیزبی سۆسیالیستی کوردستان" ڕێبەرەکەی عەلی عەسکەری بوو کە بەشێك لە گرووپی ئیبراهیم ئەحمەد ـ جەلال تاڵەبانی بوو و هەتا دواتریش پێوەندی باشی لەگەڵیان هەبوو. جەلال تاڵەبانی لە ئابی ١٩٧٧ هاتەوە بۆ کوردستانو لەگەڵ "کۆمەڵە"و "حیزبی سۆسیالیستی کوردستان"، حیزبێکی نوێی بە ناوی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (PUK) دامەزراند. حیزبی سۆسیالیستی کوردستان پاش ئەوە بوو بە "یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان". "کۆمەڵە" لە ڕێگای هێزە زۆرەکانیەوە پشتیوانی لە یەکێتی نیشتمانی دەکرد، بەڵام جەلال تاڵەبانی زاڵترین کەسایەتی سیاسی حیزب بوو. ئەو کاتە دەوڵەتی عێراق تەنها شار و جادە سەرەکییەکانی کوردستانی لە دەستدا بوو و شوێنەکانی دیکە لە دەستی پێشمەرگەدا بوون.

پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٦ دیسان بە ڕێبەرایەتی ئیدریس و مەسعوود بارزانی سەریهەڵداوە. پارتی، پرۆگرامی نوێی مارکسیستی ـ لنینیستی بوو و بە هۆی سیاسەتی دژی ئیمپریالیستی کۆماری ئیسلامی، پشتیوانی لە ئایەتوڵڵا خومەینی دەکرد. هەروەها "بەرەی دیموکراتی نەتەوەیی عێراق" لە ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٨٠ لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراق جارێکیتر بوون بە دژی ڕێژیمی بەعس و لە کوردستان پەنایان گرت.

لە درێژایی دەیەی ١٩٨٠ کۆمەڵێك حیزبی بچووکیش سەریانهەڵدا. ئەم بزووتنەوانە لە ژێر کاریگەریی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا بوون و لە لایەن سوننەکان کە زۆربەی حەشیمەتی کوردەکان پێکدەهێنن، دامەزران. ڕێبەری حیزبوڵڵای کوردستان، شێخ خالید بارزانی، برازای ژنەراڵ بارزانی بوو، بەڵام گرینگترین بزووتنەوەی ئیسلامی، "سوپای ئیسلامی کوردستان" بوو. حیزبێکی دیکەش بە ناوی "بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان" هەبوو.

یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان لە تشرینی دووەمی ١٩٨٦دا ڕێککەوتننامەیەکی هاوبەشیان لەگەڵ ڕێژیمی ئێران لە تاران واژۆ کرد. تەنانەت یەکێتی و پێوەندی ئەم دوو حیزبە لە دوای تراژیدیای هەڵەبجە لە ئاداری ١٩٨٨ کە تێیدا ٥ هەزار هاووڵاتی مەدەنی بە هۆی هێرشی کیمیایی کوژران، پتەوتر و خێراتر بوو.



بەرەی کوردستان لە ٢ی گوڵانی ١٩٨٨ دامەزرا. ئەم بەرەیە جگە لە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، لە حیزبی سۆسیالیستی کوردستان و حیزبی دیموکراتی گەلی کوردستان، پێکهاتبوو.

ڕێککەوتننامەی ئاگربەستی ئێران و عێراق لە ئابی ١٩٨٨ دوو ئەنجامی بۆ کوردەکان بەدواوە بوو: یەکەم کۆتاییپێهاتنی هاوپەیمانی کوردەکانی عێراق و دەوڵەتی ئێران و دووەم زاڵبوونی تەواوی سوپای عێراق بەسەر کوردستاندا. لە دوای ئەوە، سوپای عێراق لە ٢٥ی ئاب هەتا ١٥ی ئەیلوول، هێرشێکی زۆر توندی دژی پارێزگا کوردنشینەکانی هاوسنووری تورکیا دەستپێکرد. لەم ئۆپەراسیۆنە مەزنەدا، ٦٠ هەزار سەربازی عێراق و ژمارەیەکی زۆر فڕۆکە تەیارکران. ٤٧٨ گوند کاولکران و ٧٨ گوند کەوتنە بەر هێرشی کیمیایی کە بە هۆی ئەوە نزیکەی ١٠٠ هەزار کەس لە حەشیمەتی ١٥٠ هەزار کەسی ناوچە ئاوارە بوون. دوابەدوای ئەوە کەش و هەوای تیرۆر و سەرکوت و تۆقاندنی خەڵك زاڵبوو.

## بارودۆخی کۆمەڵایەتی کوردستان

کوردستانی عێراق وڵاتێکی دەوڵەمەندە و سەرەڕای ئەوە کە هەتا ڕادەیەك تەختکراوە، بەڵام هێشتا دارستانێکی باشی هەیە. ئاوهەوای کوردستان باراناویە و رووبارگەلێکی جۆراوجۆر لەوانە "دیالە"و "زابی گەورە" پێدا تێپەڕ دەبن. ڕێژەی کەڵەکەی حەشیمەتی کوردەکان کە لە سەدا ١٧ی وڵاتی عێراق (واتا ٧٤ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە) دەژین، بە بەراورد لەگەڵ حەشیمەتی شوێنەکانی دیکەی عێراق زۆرترە.

لەگەل ئەوەشدا کە هەڵسەنگاندنێکی وردو ڕاست لە حەشیمەتی کوردەکان لە دەستدا نییە، بەڵام بەراورد دەکرێت کە کورد لە سەدا ٢٥ی حەشیمەتی عێراق پێکدەهێنن. بۆ نموونە بەپێی سەرژمێرییەك کە لە ساڵی ١٩٧٥ کراوە، لە حەشیمەتی ١١ ملیۆن کەسی عێراق، ٢ ملیۆن کورد بوونە. بەهەرحاڵ سەرەڕای ئەوە کە دەوڵەتی عێراق کەمینەی کوردی بە فەرمی ناسیوەو ڕێککەوتننامەی ١٩٧٠ پێشبینی ئەوەی کردبوو، کە کورد سەرژمێری بکرێن، بەڵام هیچ چەشنە سەرژمێرییەکی کوردەکان لە عێراقدا نەکراوە. لەمە زیاتر دەوڵەتی عێراق تەنها خودموختاری نیوەی ئەو ناوچانەی قەبووڵکردووە کە کوردە ناسیۆنالیستەکان بانگەشە دەکەن کە زۆربەی حەشیمەتیان کوردە. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان لە دەرەوەی کوردستان دەژین: ٣٠٠ هەزار کەس لە بەغداو ١٠٠ هەزار کەس لە باشووری عێراق دەژین کە زۆربەیان

لە میانەی دەیەی ١٩٧٠ بە زۆر بۆ ئەوێ دوورخراونەتەوە. لە لایەکی ترەوە ٢٥٠ هەزار عەرەب لە کوردستاندا دەژین کە زۆربەیان لە شارەکاندا نیشتەجێن.

هێشتا لە سەدا ٥٠ی حەشیمەتی کوردی عێراق گوندنشینن، بەڵام ڕەوەندنشینی زۆرتر بە هۆی ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکان و بەتایبەت شەڕ ڕوو لەناوچوونەیان کردووە، حەشیمەتی شارەکان تێکەڵاوەو تورکمان، عەرەب و کورد بێ هیچ کێشەیەك لەگەڵ یەکدا دەژین. گرینگترین شاری کوردستان، کەرکوکە کە ٥٨٠ هەزار کەس تێیدا نیشتەجێن. سلێمانی کە زۆرتر لە ٨٠٠ هەزار حەشیمەتی هەیە، شارێکی بە تەواوی کوردنشینەو سەرەکیترین ناوەندی شاری کوردستانی عێراقە. ئەم شارە کە ناوەندی بازرگانییە لە ڕووی ئاو و هەواوە گونجاوترەو لە ناوەندی ناوچە کشتوکاڵییەکاندا هەڵکەوتووە. هەولێر پایتەختی هەرێمی خودموختاری کوردستانە.

سیاسەتی ئابووریی دەوڵەتی عێراق لەسەر بنەمای پەرتەوازەکردنی ناوچەی کوردستانە. لە ساڵی ١٩٧٠ تا ١٩٧٤، لە سەدا تەنها ٧ تا ١٢ی یارمەتییە ساڵانەکانی گەشەپێدانی گشتیی عێراق بۆ کوردستان تەرخانکراوە. هەروەها لەم قۆناحەدا لە نێوان ١٥٠ پرۆژەی ئابووری تەنها ٤ پرۆژە بۆ کوردستان تەرخانکراوە. دەوڵەتی عێراق کانزاکانی ئاسن لە کوردستان دەردەخات بەڵام کارخانەکانی بەرهەمهێنانی ئیستیل و ئاسن کە لە پێشکەوتنی ئابووریی ناوچەدا دەورێکی بەرچاو دەبینن لە ناوچە عەرەبنشینەکاندا دروستکراون. هەروەها لە پێناوی هەمان سیاسەتدا، نەوتی کەرکوك سەرەڕای ئەوە کە ٢٠٪ خەرجی بۆ دەوڵەت زۆرترە، لە دەرەوەی کوردستان لە ناوچەی "حەمام ئەلعەلیل" دەپاڵێورێت.

لە بواری کشتوکاڵیدا تەماکۆ هەرچەند کە تەنها لە کوردستاندا دەچێندرێت، بەڵام بەرهەمەکەی لە پاوانی نەتەوەیی دەوڵەتدایە کە ئەمەش زەختی زۆر چ لەسەر جووتیاران و چ لەسەر نرخەکەی دەکات.

سەرچاوەی سەرەکی کوردستان نەوتە. لە دەیەی ١٩٦٠ نەوتی کەرکوك، خانەقین و عەینزالە ٨٠٪ی بەرهەمی گشتیی نەوتی عێراقی پێکدەهێنا. ئەم هەڵسەنگاندنانە پاشان هەتا ٧٠٪بەرز بووەوە کە دەبوو بە نیوەی داهاتی گشتیی نەتەوەیی عێراق لەو قۆناخەدا. دەوڵەتی عێراق لە ساڵی ١٩٦٤، پرۆسەی نەتەوەییکردنی بەرهەمی نەوتی دەستپێکرد، کە مەبەستی سەرەکیی، ئەو ناوچە خاوەن نەوتانەی کوردستان بوو، کە هێشتا کەڵکیان لێ وەرنەگیرا بوو. بە نەتەوەییکردنی کۆمپانیا بیانییەکان لە ساڵەکانی سەرەتای بە دەسەڵات



گەیشتنی ڕێژیمی بەعس (١ی حوزەیرانی ١٩٧٢) دەستی پێکرد و هەتا ساڵی ١٩٧٣ دەوڵەتی عێراق کۆنترۆڵی ٨٥٪ی بەرهەمی نەوتی گرتە دەست. بەرزبوونەوەی نرخی نەوت لە ساڵی ١٩٧٣ بووە هۆی ئەوە کە داهاتی نەتەوەیی عێراق دووقات بێت. هەر ئەم داهاتە زۆرە بوو، کە وای لە عێراق کرد لە ساڵی ١٩٧٤ شەڕی خۆی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان دەست پێبکاتەوە.

لە بواری کولتووریدا، دەوڵەتی بەغدا هەندێك ئازادیی بەرتەسکی بە کەمینەی کورد داوە. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٧٩ زانکۆیەك لە سلێمانی و ئاکادیمیەکی کوردی لە بەغداد دامەزران، بەڵام زانکۆی سلێمانی پاشان گوێزرایەوە بۆ هەولێرو ناوی کرا بە زانکۆی "سەلاحەدین"و ئاکادیمی کوردیش لە ساڵی ١٩٧٩ داخرا. لە ساڵی ١٩٧٠ هەتا ١٩٧٣، ٣٨ کاتنامەی کوردی (٢ لە کەرکوك، ٦ لە هەولێر، ٤ لە سلێمانی و ١٦ لە بەغداد) بڵاو بوونەوە. ڕادیۆ بەغدادیش لە پاڵ بەرنامەی سریانی و تورکمانی، دەستی بە پەخشی بەرنامە کوردییەکان کرد. لە لایەکیترەوە پاش ساڵی ١٩٨١ قوتابخانە کوردییەکانی کەرکوك، موسڵ و دهۆك تەنها بە زمانی عەرەبی پەروەردەیان دەدا. لە ساڵی ١٩٨٣ لە گەرماوگەرمی شەڕی عێراق دژی ئێران، دەوڵەتی عێراق کۆمەڵێك مافی سەرەتایی دا بە کوردەکان، بۆ نموونە ناوچەی خودموختار دیسان بوو بە ناوچەی "ناوچەی خودموختاری کوردستان". هەروەها لە ئاداری ١٩٨٣ چاپەمەنی کوردی و سەنتەرە کولتوورییەکان دیسان سەر و سامانیان پێدرا، بەڵام لە دوای بەشداریکردنی پێشمەرگەکانی بارزانی لە هێرشەکانی سوپای پاسداران لە تەمموزی ١٩٨٣ فستیڤاڵە کولتوورییە کوردییەکان لە شارە سەرەکییەکانی کوردستان بە خێرایی داخران.

بەڵام سەرەڕای ئەم شانۆگەرییە کورتخایەنەی ئازادیی کولتووری ڕێژیمی عێراق، هەڵاواردنی کولتووری ڕاستەقینە بۆ کوردەکان بەردەوام بووە. ژمارەی قوتابیانی کورد بە ڕوونی کەمتر لە نێونجی ژمارەی قوتابیانی عێراق بە گشتییە. لە ساڵەکانی ١٩٧١و ١٩٧٢ لە سەدا تەنها ٦ی ژمارەی گشتیی خوێندکارانی زانکۆکانی عێراق کورد بوون. لە ڕووی دامەرزاندن و سیستەمی ئیداریی حکوومەتیشدا کورد بە ڕاشکاوی لەگەڵ هەڵاواردندا بەرەوڕوون. لە ئاکادیمیە سەربازییەکانی ڕاهێنانی ئەفسەر و پۆلیس لە سەدا تەنها ٢ی خوێندکارەکانی کوردن. ئیدارەی ڕەگەزنامەی عێراق ئەو کوردانە وەك هاووڵاتی قەبووڵ ناکات کە بنەماڵەیان تەنانەت بۆ ماوەی چەند نەوە لە عێراقدا ژیاون، بەڵام بەپێی

پرۆگرامی پانعەرەبیزمی حیزبی بەعس، لە ڕێگای ئیقامە و ژنهێنان، بە هاوولاتیبوونی عەرەبەکان ئاسان کراوەتەوە.

## دوورخستنەوەی کوردەکان

لە دوای ڕووخانی یەکەمین ڕژێمی بەعسی عێراق، عارف لە ساڵی ١٩٦٣ەوە هەوڵی دا سیاسەتی تەعریبی کوردستان جێبەجێ بکات. دەوڵەتی عێراق بە پێشنیارکردنی پاڵنەرە ماڵییەکان، عەرەبەکانی هان دەدا لە ناوچە سنوورییەکانی کوردستاندا نیشتەجێ ببن. سیاسەتی تەعریبی ناوچەکانی کوردستان ڕۆژ بە ڕۆژ بە شێوازێکی چالاکتر و شەفافتر درێژەی پێدەدرا، بۆ نموونە پاش شەڕی ١٩٧٤ـ١٩٧٥ دەوڵەتی عێراق، کوردو ئاشوورییەکانی بۆ ناوچە بیابانەکانی باشووری وڵات دووخستەوە.

سیاسەتی تەعریبی کوردەکان لە سێ ناوچەی کەرکوك، سنجار و خانەقین دەستی پێکرد. گوندە کوردنشینەکان کاولکران و قەواڵەی زەوییەکان لە کوردەکان سەنرایەوەو درا بە عەرەبەکان. ئەڵبەتە پاش چەند ساڵ، هەندێك لە کوردەکان لە باشووری عێراقەوە گەڕانەوە بۆ کوردستان، بەڵام بە هۆی ئەوەی ئیزنیان پێ نەدرا لە گوندەکانیاندا بمێننەوە ناچاربوون لە شارەکانی سلێمانی، هەولێر و دهۆك نیشتەجێ بن. هەروەها ژمارەیەك شار بە مەبەستی سەربازی لە نزیك بنکە سەربازییەکاندا دروستکران و ئاوارە کوردەکان لەو شارانەدا نیشتەجێکران. بارودۆخی یەکجار دژواری ژیانی کوردەکان لەم شارانە بووە هۆی خۆپیشاندانی کوردەکان لە ساڵەکانی ١٩٧٨و ١٩٧٩.

دەوڵەتی عێراق هەروەها دەستیکرد بە دەرکردنی کوردەکان لە ناوچە سنوورییەکان. لە حوزەیرانی ١٩٧٨و نیسانی ١٩٧٩، ٢٥٠ هەزار کورد بە زۆر لە شارە نوێیەکاندان نیشتەجێکران. لە ٢٦ی حوزەیرانی ١٩٨٩ دەوڵەتی عێراق لە بەیاننامەیەکی ڕەسمیدا، ئامانجی لەم گواستنەوەیە، پێکهێنانی کەرتێك بە پانایی ٣٠ کیلۆمەتر و درێژایی١٣٠ کیلۆمەتر لە پاڵ سنووری تورکیا و ئێران ڕاگەیاند، بەڵام شەڕی عێراق دژی ئێران، ئەم شاڵاوەی ڕاوەستاند. لە ساڵی ١٩٨٥ پاش هەرەسهێنانی وتووێژەکانی دەوڵەتی عێراق لەگەڵ جەلال تاڵەبانی، دەوڵەت بەرنامەی بە زۆر نیشتەجێکردنی ٥٠٠ هەزار کەسی ڕاگەیاند. گوندەکان کاولکران و دانیشتووانەکەیان لە نزیکی جادەکان و بنکە سەبازییەکان نیشتەجێکران بۆ ئەوەی بەردەوام لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتدا بن.



لە حوزەیرانی ١٩٨٠، قەڵادزێ کە کەوتووەتە باکووری سلێمانی و ١٠ کیلۆمەتر لە سنووری ئێران دوورە، بە زۆر چۆڵکرا. لە ٢٩ی ئادار بە ٥٠ هەزار کەس لە دانیشتووانی ئەم ناوچەیە فەرمان درا هەرچی کەلوپەل بۆیان دەکرێ هەڵگرن و لەوێ بچنە دەرەوە. خەڵك لەم فەرمانە سەرپێچیان کرد و لیژنەیەکیان نارد بۆ لای سەدام، بەڵام سەرۆکی لیژنەکە، مەلا موحەمەد دەڵگەیی زیندانی کرا. سەرەنجام قەڵادزی لە لایەن سوپای عێراقەوە گەمارۆ دراو لە مانگی حوزەیران چۆڵکرا، پاشان خاپوورکراو خەڵکەکەی لە کەمپەکانی هەولێرو سلێمانیدا سەرلەنوێ نیشتەجێکرانەوە.

بە پێی هەڵسەنگاندنە جۆراوجۆرەکان (کە ڕەسمی نین) ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکان خاپوورکران. بە پێی سەرچاوە کوردییەکان لە کۆی ٥ هەزار گوند، ٣٥٠٠ یان، واتە لەسەدا ٧٥یان، کاولکران. بە پێی هەڵسەنگاندنی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، ١٢٠٠ گوند کاولکراون، بەڵام ئەم هەڵسەنگاندنانە سەلیقەیین. لە کردەوەدا، شاخەکانی کوردستان چۆڵکران و ئەمەش گیروگرفتی لۆجیستیکی بۆ پێشمەرگەکان پێکهێنا. ڕزگاربووانی کیمیابارانی هەڵەبجە لە شارێکی نوێ کە ٢٠کیلۆمیتر لە "هەڵەبجەی کۆن" دوورەو پێی دەڵێن "هەڵەبجەی تازە" نیشتەجێکران. ٥٠٠ هەزار ئاوارەی کورد لە ڕووی ناچارییەوە لە سلێمانی، هەولێر و دهۆکدا دەژیان. ئەوانی دیکەش بۆ ئۆردوگاکانی باشووری عێراق گوێزرانەوە. دانیشتووانی کەمپەکان، زۆربەیان بێکاربوون و لە بارودۆخێکی دەروونی و جەستەیی سەختدا دەژیان، تەنانەت بەستراوەبوونی بژێوی خەڵك بە دەوڵەت، ڕێگای بۆ کەڵکوەرگرتنی دەوڵەت لە میلیشیاکانو سیخوڕەکان کە لەگەڵ ئیستیخباراتدا کاریان دەکرد، خۆش کردبوو.

سەرەنجام لە بەهاری ١٩٨٩ ڕژێمی عێراق کردەوەیەکی دیکەی دژی هاوولاتیانی شارنشینی کورد جێبەجێکرد: پێش لە کوردەکان بۆ کڕین و کردنەوەی خانوو گیرا و ئەو کەسانەی کە پاش ساڵی١٩٧٥ لە شارەکاندا نیشتەجێ ببوون، ناچار کران خۆیان بە پۆلیس بناسێنن.

## بەکارهێنانی چەکی کیمیایی

ئەوە یەکەمجار نەبوو، کە دەوڵەتی سەدام لە ئابی ١٩٨٨ لە دژی کوردەکان چەکی کیمیایی بەکاردەهێنا. لە ماوەی شەڕی عێراق دژی ئێران، دەوڵەتی عێراق لە ساڵی ١٩٨٣ ناوچە کوردنشینەکانی بە چەکی کیمیایی بۆمبباران کردبوو و سەرەڕای نارەزایەتی

دەربڕینەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئاداری ١٩٨٤، دەوڵەتی عێراق درێژەی بە کەڵکوەرگرتن لەم چەکانە دەدا.

بە پێی هەڵسەنگاندنەکانی دەوڵەتی ئێران، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٣و ١٩٨٨، ٥٠ هەزار کەس لە ئاکامی گازە کیمیاییەکان کوژراون یان برینداربوونە. لە کانوونی دووەمی ١٩٨٨، دەوڵەتی عێراق دیسان بە توندی حاشای لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن سوپای عێراقەوە کرد. دەوڵەتی عێراق لە راستیدا بەرنامەی بەرهەمهێنانی چەکە کیمیاییە زۆر ژەهراوییەکانی خۆی لە ساڵی ١٩٧٥ دەستپێکردبوو. تەنانەت لە ساڵی ١٩٨٥ دەوڵەتی عێراق بڕێکی زۆر گازی خەردەل و دوو جۆر گازی ئەعسابی بەرهەمهێنا. ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە عێراق ببێ بە سەرەکیترین وڵاتی جیهانی سێیەم کە تا ئەو کاتە خاوەن ئەمباری چەکی کیمیایی بوون.

لە ١٥و ١٦ی نیسانی ١٩٨٧ دەوڵەت بە چەکی کیمیایی هێرشیکردە سەر گوندەکانی هەولێر و سلێمانی کە کوژران‌و برینداربوونی ٣٠ کەسی لێکەوتەوە. بە گوێرەی سەرچاوە هەواڵنێرییە باوەڕپێکراوەکان، ٣٨٠ کەس لە برینداربووانی ئەم هێرشانە کە بۆ چارەسەرکردنی برینەکانیان چووبوونە نەخۆشخانە دەوڵەتییەکان، گیران و لە کەمپە سەربازییەکاندا ئیعدام کران. کۆمەڵێك هێرشی کیمیایی دیکەش لە مانگی حوزەیران و ئەیلوولی ١٩٨٧ ئەنجامدرا.

سەرەنجام بۆمبارانی کیمیایی شاری هەڵەبجە لە نزیکی سنووری ئێران لە ١٦و ١٧ی ئاداری ١٩٨٨، سەرنجە ناونەتەوەییەکانی بۆ لای خۆی راکێشا. ئەو وێنانەی کە لە هەواوە لە قوربانیانی بە کۆمەڵی ئەم تراژیدیایە گیرابوون‌و لە تەلەفیزیۆنەکاندا بڵاوبووەوە، کاردانەوەی ناونەتەوەیی بە دواوە بوو. گیرانی شاری هەڵەبجە بە دەستی ئێران بە یارمەتی پێشمەرگەکان، بووە هۆی هێرشی کیمیایی فڕۆکەکانی عێراق بۆ ئەم شارە. ئەڵبەتە دەوڵەتی ئێران لەم هەلە بۆ ریسواکردنی دوژمنەکەی کەڵکی باشی وەرگرت و یەکەم وڵاتێك بوو، کە لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە دژی دەوڵەتی عێراق ناڕەزایەتی دەربڕی.

سەرەنجام لێژنەیەك لە پسپۆڕانی ناونەتەوەیی راپۆرتێکیان لەم کیمیابارانە ئامادە کرد و جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە قوربانیان بە هۆی چەکی کیمیایی کوژراون و بریندار بوونە و زۆربەیان خەڵکی مەدەنی بوونە. کاتێك کە هەڵەبجە کەوتە بەر هێرش، زیاتر لە ٧٠ هەزار حەشیمەتی هەبوو، چونکە ئاوارەکانی ناوچەکانی دەوروبەریش لەوێ نیشتەجێببوون. بەهەرحاڵ



هەڵسەنگاندنی ژمارەی قوربانیانی ئەم کیمیابارانە ئەستەمە، هەرچەند کە ژمارەی کوژراوەکان ٥ هەزار کەس هەڵسەنگێندراوە.

سەرەڕای ناڕەزایەتی دەربڕینەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان (ئەنجوومەنی ئاسایش لە ٩و ٢٦ی ئابی١٩٨٨ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی شەرمەزار کرد)، دەوڵەتی عێراق درێژەی بە کیمیابارانکردنی گوندە کوردنشینەکاندا، بە تایبەت لە درێژایی مانگی ئەیلوول کە کوژرانی چەند هەزار کەسی لێکەوتەوە. تەنانەت تورکیاش کە ژمارەیەك لە ئاوارەکانی ئەم کیمیابارانەی قەبووڵ کردبوو، هەڵوێستێکی دۆستانەی لەگەڵ دەوڵەتی عێراق گرتەبەرو حاشای لەوە کرد کە گازی کیمیایی لە دژی کوردەکان بەکارهاتووە. پزیشکە تورکەکان کە ئاوارە کوردەکانیان دیتبوو، رایانگەیاند ئەو کەسانە تووشی نەخۆشی بوونە و کیمیاییان لێنەدراوە.

لە ساڵی ١٩٨٢ دەوڵەتی تورکیا و عێراق رێککەوتننامەیەکیان لەگەڵ یەکدی واژۆ کرد کە رێگای بە تورکیا دەدا پێشمەرگە کوردەکانی pkk لە ناو خاکی عێراق راوبنێت. لەمە زیاتر، عێراق گرینگترین دابینکەری نەوتی تورکیا بوو و تورکیاش گرینگترین هاوپەیمانی عێراق بوو. لە ئەیلوولی ١٩٨٨، دەوڵەتی تورکیا و عێراق بە یەکەوە پێشنیاری "خاویەر پریز دوکوئیار"، سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانیان لەمەڕ ناردنی تیمێکی پسپۆڕ بۆ سەردانی قوربانیە کوردەکان کە کەوتبوونە بەر هێرشی کیمیایی، رەتکردەوە. نوێنەری یەکێتی عەرەب لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەرامبەر شەرمەزارکردنی عێراق لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئاب و ئەیلوولی کاردانەوەی نیشان داو وتی پرۆتوکولی ژنێڤ (١٩٢٥) ناتوانێ بۆ عێراق بەکاربرێت چونکە ئەم پرۆتوکولە، شەڕی نێوان دوو دەوڵەت دەگرێتە ناوخۆی نە چالاکییە نێوخۆییەکانی وڵاتێکی سەربەخۆ. وەزیری بەرگری عێراق لە ئەیلوولی ١٩٨٨ لە کۆنفرانسێکی چاپەمەنیدا بەتانە و تەشەرەوە رایگەیاند: " لە ناوچە شاخاوییەکان، چەکێکی کیمیایی لۆژیکی نییە و لە راستیدا بۆ تۆقاندن و ترساندن و پاڵپێوەنانی سەدەها هەزار کورد بۆ جادەکان لەم چەکانە کەڵکوەرگیراوە".

بە گوێرەی شێوازی بیرکردنەوەی سەدام حوسێن، کیمیابارانکردنی کوردەکان، سادەترین رێگایە بۆ تەعریبی کوردەکان کە ئاکام و لێکەوتە هەستپێکراوەکانی ئەم سیاسەتە هێشتا لە کوردستان بەجێماوە.

## ئاوارەکان

شەڕ لە کوردستان بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان ئاوارە بن. ژمارەی گشتیی ئاوارەکان، ٤٠٠ هەزار کەس واتا لە سەدا ١٠ی حەشیمەتی کوردەکانی عێراق هەڵسەنگێندراوە. نزیکەی ٣٧٠ هەزار لەم ئاوارانە لە ئێران، ٢٨ هەزار کەس لە تورکیا، ٣٠٠٠ کەس لە پاکستانو ٢٥٠٠ کەس لە رۆژئاوای ئەوروپا دەژین (هەڵسەنگاندنەکانی ساڵی ١٩٩٠). لە ساڵی ١٩٧١ەوە کوردەکان ئاوارەی ئێران بوون، بەڵام لە دوای هێرشە کیمیاییەکانی ١٩٨٨و١٩٨٩، ژمارەی ئەم ئاوارانە بە شێوەیەکی بەرچاو بەرزبووەوە. ئێستا ٣٧٠ هەزار ئاوارە لە کوردستانی ئێران دەژین کە لە نێوان ٢٣ ئۆردوگادا دابەشکراون.

ئاوارە کوردەکانی عێراق لە مافی پەنابەران بێبەشن و کەڵك لە پاراستنی رێکخراوە ناونەتەوەییەکان وەرناگرن. بارودۆخی تەندروستیان زۆر خراپە و سەرماش ئەو بارودۆخەی خراپتر کردووە. لە ئاب و ئەیلوولی١٩٨٨، پتر لە ٥٥ هەزار کوردی عێراق کوردستانیان بەجێهێشتو چوونە کوردستانی تورکیا بەڵام کاربەدەستانی تورکیا سەرپێچیان لە بەخشینی مافی پەنابەرێتی بەم کوردانە کرد. ئەمە لەحاڵێکدا بوو، کە تورکیا لە ساڵی ١٩٥١ کۆنڤانسیۆنی نەتەوە یەکگرتووەکانی سەبارەت بە ئاوارەکان ئیمزا کردبوو. تورکیا تەنها شوێنی تێپەڕبوونی ئاوارەکان بوو، کە چاوەڕوان بوون لە وڵاتێکی سێیەم مافی پەنابەرێتی وەربگرن.

لە ئەیلوولی ١٩٨٨ دەوڵەتی عێراق ٥ فەرمانی لێبووردنی گشتیی بۆ نەیارانی سیاسی دەرکرد کە دوو لەم لێبووردنانە کوردەکانی دەگرتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨ عێراق ئیزنی بە کۆمیتەی ناونەتەوەیی خاچی سوور نەدا یارمەتی بە گەڕانەوەی ئاوارە کوردەکان لە تورکیاوە بۆ عێراق بدات. هەروەها گەڕانەوەی کوردەکان بۆ وڵاتی خۆیان لە ئەیلوولی ١٩٨٨ بە شێوازێکی یەکلایەنەو بێ یارمەتی هیچ رێکخراوێکی پسپۆڕی ناونەتەوەیی جێبەجێکراوە. رێکخراوی لێبووردنی ناونەتەوەیی لە راپۆرتێکدا کە لە ساڵی ١٩٩٠ بڵاوی کردووەتەوە، باسی گەڕاندنەوەی زۆرەملێ ئاوارەکانی بۆ وڵاتی خۆیان کردووە. دەوڵەتی عێراق فەرمانی لێبووردنە گشتییەکانی جێبەجێ نەکردووەو نموونەگەلێکی زۆر لە بێسەر و شوێنکردن، ئەشکەنجە و ئیعدام لە نێو ئەم لێبووردنە گشتییانەدا بەدی دەکرێت.

## راپەڕینی سمکۆ

هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی لەگەڵ لاوازی حکوومەتی ئێران لە دەیەی ١٩٢٠ رێگای بۆ سەرهەڵدانی هەستی ناسیۆنالیستی لە کوردستانی ئێران کردەوە.

یەکەم بزووتنەوەی کوردستانی ئێران، بزووتنەوەی سمکۆ بوو، کوڕی محەمەد ئاغا، سەرۆکی عەشیرەی شکاك. سمکۆ لە دوای ئەوە کە برا گەورەکەی لە ساڵی ١٩٠٧ بە دەستی حوکمڕانی تەورێز کوژرا، رق و کینەیەکی توندی لە ئێرانییەکان گرتە دڵو هەوڵیدا لەگەڵ تورکەکانو دەوڵەتی بریتانیا ببێ بە هاوپەیمان. ساڵی ١٩١٨ سمکۆ لەگەڵ ئەرمەنییەکان لە بەرامبەر تورکەکاندا رانەوەستا و ئوسقۆفی مەزنی ئاشوورییەکان، مارشیمۆن-ی کوشت. لە هەمان ساڵدا سمکۆ ناوچەکانی نێوان دەریاچەی ئورومیەو سنووری تورکیای گرت، بەڵام توندوتیژییەکانی لە دژی ئاشوورییەکان بووە هۆی ئەوەی متمانەی خۆی لەناو ئاشوورییەکاندا لە دەست بدات تەنانەت هەتا ئەو جێگایە کە دەوڵەتە رۆژئاواییەکان لێی نیگەران بوون. ئەمە گۆشەگیری سمکۆی زۆرتر کرد.

دەوڵەتی ئێران پێش هەموو کارێك، هەوڵی دا بە ناردنی بەستەیەك بۆمب بۆ ئەم رێبەرە رێگرە، لەسەر رێگای خۆی لای ببات کە یەکێك لە براکانی کوشت. لە هاوینی ١٩١٩ سمکۆ شاری رەزاییەی گرتو شار بە خێرایی تاڵانکرا. پاشان دەستەیەك لە قەزاقە ئێرانییەکان بە رێبەرایەتی ئەفسەری روس، کۆلۆنیل فیلیۆ، هێرشیانکردە سەر هێزەکانی سمکۆ. هێزەکانی سمکۆ هەرەسیان هێنا، بەڵام لەناونەچوون. لە دوای ئەوە وتووێژەکان دەستیان پێکرد. بارودۆخەکە هەتا تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢١ هەر وەك خۆی مایەوە بەڵام بە هاتنی هێزە تازەکان لە تاران، سمکۆ رووبەڕووی مەترسی بووەوە. سمکۆ دەستپێشخەری کرد و شاری مەهابادی گرت. ٤٠٠ ژاندارم لە بنکەی خۆیان بە کۆمەڵ کوژران و پاش تاڵانی مەهاباد، هەندێك لە گەورەپیاوانی کورد کوژران. ئەم کردەوانەی سمکۆ بووە هۆی ئەوە کە خەڵکی ناوچە لێی بێزار بن. لەگەل ئەمەشدا سمکۆ لەو پەڕی دەسەڵاتدا بوو و بە دەیان جار توانی هەرەس بە سەربازانی دوژمن بهێنێت.

سمکۆ هەرچەند رێبەرێکی عەشیرەتی ئاسایی نەبوو، بەڵام هیچ سیاسەتێکی شەفافو پێناسەکراوی نەبوو. هیچ گومان لە هەستی ناسیۆنالیستی سمکۆدا نییە، بەڵام قەت هەوڵی



نەدا سیستەمێکی ئیداری لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا پێکبهێنێت کە دەیتوانی ببێ بە یارمەتیدەری بۆ ئەوەی بگات بە ئامانجی دوارۆژی واتا دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ.

پاش بە دەسەڵات گەیشتنی رەزاخان، سمکۆ بۆ ئەوەی لە پێکدادانی توند لەگەڵ رێژیمی نوێی ئێران خۆی دووربخاتەوە، هەوڵی دا پشتیوانی بریتانیای مەزن بەدەست بهێنێت. بە کورتی پاش زنجیرەیەك وتووێژی سەرەتایی، دەوڵەتی بریتانیا سەرەنجام ئیدی لەگەڵ سمکۆ وتووێژی نەکردو لەو کاتە بە دواوە، بزووتنەوەی کورد سنووردار و مەحکووم بە مەرگ بوو.

پەیمانی ئێران و تورکیا کە لە تشرینی یەکەمی١٩٢٢ ئیمزاکرا، کۆتایی بە یارمەتییەکانی تورکیا هێناو لەتبوونی بزووتنەوەی سمکۆی تەواو کرد. شەڕی یەکلاییکەرەوەی سمکۆ و سوپای ئێران لە ٢٥ی تەمموزی ١٩٢٢ لە "شەکەریازی" روویدا کە تێیدا هێزەکانی سمکۆ لەگەڵ سەربازە بەرێکخستنکراوتر و تەیارتری ئێراندا رووبەڕووبوونەوە و لە ئەنجامدا هەرەسیان هێنا. لەو ١٠ هەزار کەسەی کە سەرەتا لەگەڵ سمکۆدا بوون، تەنها هەزار کەس مانەوە کە هەموویان هی عەشیرەتی خۆی بوون و درێژەیان بە شەڕێکی یەکجار نایەکسان دا.

سمکۆ چووە عێراق و پاشان تورکیاو سەرەنجام چیرۆکی حەماسی سمکۆ لە ساڵی ١٩٣٠ کۆتایی پێهات واتا کاتێك کە رەزاشا کردی بە حاکمی شنۆ و پاش چەند رۆژ کوشتی. (رەزاشا سمکۆی نەکرد بە حاکمی شنۆ، بەڵکو بانگهێشتی کرد بۆ وتووێژ و لە دەروازەی شنۆ بۆسەی بۆدانا و کوشتی. وەرگێڕ)

## کۆماری مەهاباد

کۆماری مەهاباد کە لە ٢٢ی کانوونی دووەمی١٩٤٥ هەتا کانوونی یەکەمی١٩٤٦ درێژەی کێشا، تەنها نموونەی سەربەخۆیی لەرزۆکی کورد دەمێنێتەوە. ئەم ناوچە خودموختارە چۆن توانی لە قۆناخی دوای شەڕی جیهانی دووەم لەسەر بنەمای بوارە مێژووییەکەی لە بەشێك لە کوردستاندا دابمەزرێ. بوار بۆ ئەم سەربەخۆییە لە دوای داگیرکردنی ئێران لەلایەن بریتانیاو رووسیا لە ئابی ١٩٤١ هەتا ١٩٤٥ رەخسا. ناوچەی مەهاباد وەك قەڵخانی نێوان سەرزەوییە داگیرکراوەکانی دوو هێزی هاوپەیمان (بریتانیا و رووسیا) بوو، بەڵام لەحاڵێکدا کە ئامانجی بریتانیا پاراستنی یەکپارچەیی خاکی ئێران بوو، بۆ کەند و کۆسپ دروستکردن لەسەر رێگای زێدەخوازییەکانی سۆڤیەت، رووسیا بە شوێن ئەوەدا بوو، کە لە رێگای دابەشکردنی ئێران، کۆمەڵێك ناوچەی نوێی ژێر دەسەڵاتی خۆی بەدەست بهێنێت. بەهەرحاڵ هەرچەند کە

یەکگرتنەوەی ئازەربایجانی ئێران و سۆڤیەت مەبەستی سەرەکی رووسیا بوو، بەڵام کوردیش دەیانتوانی یەکێك لە هۆکارە گرینگەکانی دابەشبوونی ئێران بن.

لە تشرینی دووەمی ١٩٤١ دوو ئەفەسەری ئازەربایجانی سۆڤیەت نزیکەی ٣٠ کەس لە گەورەپیاوانی کوردیان بانگهێشتی باکۆ کرد. یەکێك لەم بانگهێشتکراوانە، قازی موحەممەد، رێبەری دوارۆژی کۆماری مەهاباد بوو. قازی موحەممەد پاشان بە ئاشکرا هەوڵی دا لەگەڵ بریتانیاییەکان پێوەندی بگرێت، بەڵام لۆژیکێکی ژیۆپۆلۆتیکی، نەك رێککەوتنێکی سیاسی، پاڵی پێوەنا تا لەگەڵ سۆڤیەتدا هاوکاری بکات. لە باکۆ، باقرۆڤ، سەرۆکی ئەنجوومەنی بەرزی ئازەربایجان هیچ بەڵێنێکی راستەقینەی نەدا بە کوردەکان، بە پێچەوانەوە زۆر بە هۆشیارییەوە نزیکی کوردەکان بووەوە. ئەمە لەحاڵێکدا بوو کە باقرۆڤ بەڵێنی بە ئازەرییەکاندا کە سۆڤیەت پشتیوانی لە یەکگرتنەوەی ئازەربایجانی ئێران و سۆڤیەت دەکات.

لە میانەی یەکەم ساڵەکانی داگیرکرانی ئێران لە لایەن دەوڵەتە هاوپەیمانەکان، قازی موحەممەد بە خێرایی خۆی وەك هاووڵاتییەکی یەکجار بەرێز لە مەهاباد نیشان دا. قازی موحەممەد لە ساڵی ١٩٠٠ لە یەکێك لە بنەماڵە گرینگەکانی مەهاباد لە دایك بوو و بە هۆی ئەوەی کە خوێندەوار بوو (قازی موحەممەد زمانی ئینگلیزی، تورکی، فەرەنسەوی و عەرەبی دەزانی) لە ناو سیاسەتوانانی ناوچەدا، کەسایەتییەکی زۆر بلیمەت بوو.

"کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد" لە ئەیلوولی ١٩٤٢ دامەزرا. ئەو کاتە بێ سەرەوبەرەی بەسەر کوردستاندا زاڵبوو، بەڵام لە لایەن هیچکام لە هێزە داگیرکەرەکانەوە داگیر نەکرابوو. بزووتنەوەی "ژیانەوەی کورد" بە دەستی نزیکەی ١٥ کەس لە گەورەپیاوانی مەهاباد دامەزرا و پاش ماوەیەکی کورت توانی لە رێگای بەرەولای خۆی راکێشانی سەرۆك عەشیرەتەکان، بیاڤی چالاکی خۆی لە دەرەوەی شاری مەهاباد پەرەپێبدات (ناوێزەی ناوچە شیعەنشینەکانی کوردستان کە نەیتوانی لەوێ ریشە دابکوتێت). لە مانگی گوڵانی ١٩٤٣ خەڵکی مەهاباد هێرشیانکردە سەر بنکەی پۆلیسی مەهابادو لەو کاتە بەدواوە، شار بە کردەوە بەتەواوی سەربەخۆ بوو.

قازی موحەممەد هەتا تشرینی یەکەمی ١٩٤٤ نەهاتە نێو "کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان" بەڵام بە خێرایی بوو بە کەسایەتی سەرەکیی بزووتنەوەکە. "کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان" لە نێوان ئاب و تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ بوو بە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. دروشمی حیزب هێشتا زۆر نەرم بوو واتا خودموختاری بۆ کوردستان لە





چوارچێوەی ئێران و بە فەرمی قەبووڵکردنی مافی کولتووری. لەگەڵ ئەمەشدا لە دوای شەڕی جیهانی دووەم بارودۆخەکە بە خێرایی گۆڕا. لە دوای سەفەری دووەمی کوردەکان بۆ باکۆ لە ئەیلوولی١٩٤٥، رێبەرانی حیزبی دیموکرات توانیان لە پشتیوانی یەکێتی سۆڤیەت دڵنیابن. بەهەرحاڵ زۆر زەحمەت بوو، کە رووسیا بەنیاز بێ ملکەچی ئەو رێککەوتننامەیە بێت کە رێگای بۆ چۆڵکردنی ئێران، ئەویش لە ماوەیەك کەمتر لە ٦ مانگ پاش کۆتایی پێهاتنی شەڕ، خۆش دەکرد.

لە ١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ خودموختاری ئازەربایجان راگەیەندرا. کوردەکانیش دوو رۆژ دواتر خودموختاری مەهابادیان راگەیاند. لە راستیدا قازی موحەممەد درێژەی بە پێوەندی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی تاران دا و رایگەیاند ئامانجی ئەوان خودموختارییە نەك سەربەخۆیی. قازی موحەممەد بەپشتبەستن بە پشتیوانی یەکێتی سۆڤیەت لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ بە ئامادەبوونی مەلا مستەفا بارزانی، خودموختاری کۆماری کوردستان-ی راگەیاند. مەلا موستەفا تازە لە کوردستانی عێراقەوە هاتبوو و پاش ماوەیەکی کورت بە پلەی ژەنەڕاڵ-ی بوو بە سەرۆکی سوپای کۆماری کورتە تەمەنی مەهاباد.

دەوڵەتی کۆماری مەهاباد کە زۆرتر لە بازرگانان و سەرۆك عەشیرەتەکان پێکدەهات، کوتوپڕ راگەیەندرا. یارمەتییەکانی سۆڤیەت زۆر کەم بوو و سەرەڕای ئامادەبوونی ئەفسەرە رووسەکان کە سوپای نەریتیی کوردیان رادەهێنا، کۆماری مەهاباد هێشتا هیچ چەشنە چەکێکی قورسی نەبوو. لەمە زیاتر، کۆمارەکانی کورد و ئازەری لەسەر مەسەلەی سنووری نێوان سەرزەوییەکانیان ناکۆك بوون. تەنانەت هەندێك شاری تایبەت کە کەمینەی کوردیان تێدا بوو، بە زیانی کۆماری مەهاباد لکێندران بە ئازەربایجانەوە. رووسیا بوو بە ناوبژیکەر و پەیماننامەیەك لە ٢٣ی نیسان لە نێوان ئازەربایجان و کۆماری کورستاندا واژۆ کرا.

وتووێژەکانی نێوان دەوڵەتی تاران و کۆماری ئازەربایجان لە حوزەیرانی ١٩٤٦ بە ئیمزاکردنی رێککەوتننامەیەك کە تێیدا ئازەرییەکان لانیکەم بە ناویش بێت خۆیان وەك بەشێك لە کیانی ئێران دەناساند، کۆتاییان پێهات بێ ئەوەی هیچ باسێك لە کۆماری کوردستان بکرێت، بەڵام چۆڵکردنی ئێران لە لایەن سوپای سۆڤیەت لە گوڵانی ١٩٤٦ نیشانەی مەرگی کۆماری مەهاباد بوو. دەوڵەتی تاران سەرەڕای ئاگربەستی گوڵانی١٩٤٦ هێرشەکانی خۆی لە تشرینی دووەمی ١٩٤٦ دەستپێکرد و ئازەربایجانی دیسان گرتەوە. گیرانی ئازەربایجان بە هۆی رق و بێزاری گشتیی خەڵك لە رێژیمی لنینیستی "پیشەوەری" ئاسان بوو.

سەرۆك كوردەكانی مەهاباد خۆیان تەسلیم كرد، قازی موحەممەد گیراو سەرەنجام لە نیسانی ١٩٤٧ لەگەڵ چەند كەسی دیكە لە ڕێبەرانی كۆماری مەهاباد لە سێدارە درا. مەلا موستەفا بارزانی و چەند سەد كەس لە هاوڕێیانی توانیان بچنە سۆڤیەت.

كۆماری مەهاباد لە میانەی چەند مانگ ژیانی خۆیدا، بنەماكانی دەوڵەتێكی كوردی دامەزراند، كەوابوو بۆ یەكەم جار پەروەردە بە فەرمی بە زمانی كوردی بوو و چاپەمەنی كوردیش گەشەی كرد. هەروەها بەپێچەوانەی كۆماری ئازەربایجان، بنەما ئابوورییەكانی كۆماری مەهاباد هەستپێنەكراو بوون، نەتەوەپەرستیی توندڕەوانە لە ئارادا نەبوو و ڕێز لە ئازادییە بنەڕەتییەكانی خەڵك دەگیرا.

هەر وەك بزووتنەوە مێژووییەكانی دیكەی كورد لە سەدەی ٢٠، ڕووخانی كۆماری مەهاباد ئاكامی ڕاوەستانی پشیتوانی هێزێكی ناوچەیی (سۆڤیەت) بوو، كە سەرەنجام لە بەرامبەر بەخشینی پوانی نەوتی باكووری ئێران بەم هێزە، دەستی لە پشتیوانی لە كۆماری مەهاباد هەڵگرت. لەمە زیاتر هەندێك لە سەرۆك عەشیرەتەكان كە بژێویان بە بەرهەمی تەماكۆوە گرێدرابوو، لە دوای لە دەستدانی بازاڕی ئێران، لە نەمانی داهاتەكەیان نیگەران بوون و لە ساڵی ١٩٤٦ لەگەڵ كۆماری مەهاباد دژایەتیان كرد.

لەگەڵ ئەمەشدا كۆماری مەهاباد خاڵی وەرچەرخانی مێژووی سیاسیی كوردستانە، بە تایبەت بە دامەزرانی حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران و پارتی دیموكراتی كوردستانی عێراق (بە دەستی بارزانی) كە تا ئێستا لە سەرووی خەباتی نەتەوەیی كورد لە هەردوو وڵاتدا بوونە.

## پێشكەوتنی بەرەبەرەی بزووتنەوەی كورد لە ١٩٤٠ هەتا ١٩٨٠

بە ڕووخانی كۆماری مەهاباد، بزووتنەوەی نەتەوەیی كورد لە كردەوەدا لاواز بوو. حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران لە میانەی ساڵەكانی سەرەتایی دەیەی ١٩٥٠ لە دوای بە دەسەڵات گەیشتنی دوكتۆر موسەدیق زیندوو بووەوە. ئەو كاتە حیزبی دیموكرات خاوەن ڕێبەرگەلێك وەك غەنی بلوریان و عەزیز یوسفی بوو و زۆر بەیانی بەرەو چەپ بوو. لە هەڵبژاردنەكانی ساڵی ١٩٥٢ (٦ ساڵ دوای ڕووخانی كۆماری مەهاباد) كاندیداكانی حیزبی دیموكرات لە سەدا ٨٠ هەتا ٩١ی كۆی دەنگەكانیان لە شاری مەهاباد و ناوچەكانی دەوروبەری بەدەستهێنا. دەوڵەتی ئێران ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنەی بەتاڵكردەوە و مەلایەكی (خەڵكی تاران)ی كرد بە نوێنەری خەڵكی مەهاباد لە پەرلمانی ئێران. لە هەمان ساڵدا، حیزبی





دیموكراتی كوردستانی ئێران ڕێبەرایەتی جووتیارانی بۆكانی كرد لە ڕاپەڕینێك لە دژی ژاندارمو زەویدارەكانی ناوچە (واتا فێئۆدالەكان). ئەم ڕاپەڕینە بە خێرایی هەڵگیرسا، بەڵام بە پشتیوانی هەندێك لە سەرۆك عەشیرەتەكان، بە دەستی سوپای شا سەركوتكرا.

پاش ڕووخانی دەوڵەتی موسەدیق لە ١٩ی ئابی ١٩٥٣ لە دوای كودەتاك كە CIA دایڕژتبوو، سەركوتی كوردەكان رووی لە زیادبوون كرد. لە ساڵی ١٩٥٥ ئێران، عێراق، توركیا و پاكستان " پەیماننامەی بەغداد"یان ئیمزاكرد كە هەرچەند لە بنەڕەتدا لە دژی زێدەخوازییەكانی سۆڤیەت بوو، بەڵام بەهەرحاڵ كوردەكانیشی دەگرتەوە. بۆ نموونە جوانڕۆییەكان كە یەكێك لە عەشیرەتەكانی باكووری كرماشان بوون و توانیبوویان بە یارمەتی هەڵكەوتی سنووریی خۆیان، جۆرێك خودموختاریان هەبێ، سەركوتكران. "پەیمانی بەغداد" شای هان دا تا لە ٤ی شوباتی ١٩٥٦ سەربازەكانی خۆی بنێرێت بۆ سەركوتی جوانڕۆییەكان. لە ئاكامدا جوانڕۆییەكان، قەڵاكانی خۆیان (كە سەمبولی سەربەخۆییان بوو) چۆڵكرد و پەنایان بۆ شاخەكان برد.

حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران پشتیوانی لە موسەدیق كردبوو، كەوابوو لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی موسەدیق تووشی زۆرترین سەركوت و گوشار بوو. كۆمیتەی ناوەندی حیزب لەناوچوو و حیزب خۆی لە قالبی كۆمیتە ناوچەییەكاندا سەروسامان دا. لە نێوان ساڵەكانی ١٩٥٥و ١٩٥٨ عەبدولرەحمانی قاسملۆ خۆی وەك ڕێبەری حیزب نیشان داو هاوكاریو پێوەندییەكی نزیكی لەگەڵ حیزبی شیوعی ئێران (تودە) دروستكرد. حیزبی دیموكرات پاشان، دەیەیەكی پڕ بەسەرهاتی لە كێشمەكێشی ناوخۆیی تەجرووبە كرد. كۆنگرەی دووەمی حیزب كە لە ساڵی ١٩٦٤ لە عێراق بەڕێوەچوو، لەگەڵ گەڕانەوەی بارزانی بۆ ناوەندی بزووتنەوەی كورد بەرەوڕوو بووەوە و هەندێك لە ڕێبەرەكانی وەك عەبدولڕەحمان قاسملو لە بەشداریكردن لە كۆنگرەدا بێبەشكران. پاشان "كۆمیتەی شۆڕشگێڕ" جیا لە حیزبی دیموكرات دامەزرا كە عەبدولڕەحمان قاسملو یەكێك لە ڕێبەرەكانی بوو.

پاش كۆنگرەی دوو، بەرنامەی حیزبی دیموكرات هەر وەك خۆی مایەوە واتا خودموختاری بۆ كوردستان و دیموكراسی بۆ ئێران. حیزبی دیموكرات بە ڕەتكردنەوەی سەربەخۆیی بۆ كوردستان، بە شوێن پێكهێنانی كۆمەڵگایەكی سۆسیالیستی وەك مۆدێلی سۆڤیەت بوو و بە ئیلهام وەرگرتن لە ماركسیزم، حیزبێكی عیلمانی مایەوە. حیزبی دیموكرات پاشان دەستی لە ماركسیسزم (هەڵبەتە بە درێژەدان بە ڕەوتە گشتییەكەی) هەڵگرت.

بە کەڵکوەرگرتن لە لاوازی حیزبی دیموکرات لە دەیەی ١٩٦٠، حیزبێکی نوێ بە ناوی "کۆمەڵە" لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ سەریهەڵدا. "کۆمەڵە" حیزبێکی مائۆئیستی بوو کە ساڵی ١٩٦٩ بە دەستی خوێندکارە چەپە توندڕەوەکان دامەزراو دژی حیزبی " تودە" (حیزبی شیوعی ئێران) بوو، کەوابوو دژی سۆڤیەت-یش بوو. "کۆمەڵە" لە ساڵی ١٩٧٢ەوە لە نێو چینی کرێکار و کوڕ و کۆمەڵە خوێندکارییەکاندا پەرەیسەند، بەڵام لە دوای شەپۆلی دەستگیرکردنەکان، چالاکییەکانی حیزب پاش ساڵی ١٩٧٥ روویان لە کەمبوونەوە کرد. پاش ئازادکرانی ژمارەیەك لە چالاکانی حیزب، "کۆمەڵە" کە لە نیوەی ڕێگای سەرلەنوێ بەرێخستنکردنی خۆیدا بوو، توانی یەکەم کۆنگرەی خۆی لە ساڵی ١٩٧٥بەڕێوە ببات. ئەمە لەحاڵێکدا بوو، کە حیزب لە بەراورد لەگەڵ سەرەتا کە مائۆئیستی بوو، ئاوەڵاتر ببوو. ئامانجی دوارۆژی حیزب، "خودموختاری بۆ کوردستان و سۆسیالیزم بۆ ئێران" بوو. هەروەها هاوکاریو پێوەندی "کۆمەڵە"و "تودە"ش باشتر ببوو.

## سیاسەتی حکوومەتی ئێران لە بەرامبەر کورد

دەوڵەتی ئێران هەروەك هەموو دەوڵەتەکان، گومانی خراپی لە عەشیرەتە گەڕیدەکان هەیە. رەزاشا لە قۆناخی نێوان شەڕی یەکەم و دووەمی جیهاندا بۆ نیشتەجێکردنی ئەو عەشیرەتانە (زۆربەیان کورد بوون) کە هەتا ئەو کاتە گەڕیدە بوون و سەپاندنی کۆنترۆڵی دەوڵەتی ناوەندی بەسەریاندا، لە زەخت و زۆر کەڵکی وەرگرت. ئاکام و لێکەوتەکانی ئەم نێشتەجێکردنە زۆرەملێیە بۆ هەندێك لە عەشیرەتە کوردەکان گران تەواو بوو. بۆ نموونە عەشیرەی "جەلالی" کە زەوی و زارەکانیان لە نێوان ئێران، رووسیا و تورکیا دابەشکراوە، دوورخرانەوە و بە کۆمەڵ کوژران. لە ساڵی ١٩٤١ لە نێوان حەشیمەتی ١٠ هەزار کەسی ئەم عەشیرەتە کە بۆ ناوڕاستی ئێران دوورخرابوونەوە، تەنها چەندسەد کەس توانیان بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان. عەشیرەتی "گەڵباخی" بۆ هەمەدان و ناوچەکانی دەوروبەری ئەسفەهان دوورخرانەوە و زەویوزارەکەیان لە لایەن سەرۆکە تورکەکان داگیرکرا، هەر بۆیە هەوڵیان دا دژی دەوڵەت راپەڕن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون.

لەناوچوونی گەڕیدەرە رەشماڵەنشینەکان، بەتایبەت ئەو گەڕیدەرانەی کە لە سنوور دەرباز دەبن، شێوە بازرگانییە نەریتییەکانی سنووردار و بەرتەسك کردووە، بەڵام بەهەرحاڵ درێژە بە قاچاخچێتی دەدەن. بەگشتی عەشیرەتە کوردەکان لە نێو دوو وڵاتدا دابەشکراون، بۆ نموونە



عەشیرەی "شکاك" لە نێوان ئێران و تورکیادا دابەشکراوە. لە لایەکی ترەوە، کۆتاییهاتن بە ژیانی گەڕیدەری بووەتە هۆی زۆربوونی ژمارەی گوندەکان (نزیکەی ٧٥٠٠ گوند) و گۆڕانکاری زۆری لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا پێکهێناوە. یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی دیکەی گۆڕانکاری بارودۆخی کۆمەڵایەتی ناوچە، دەسپێشخەرییەکی دیکەی دەوڵەت لە دەیەی ١٩٦٠ بوو: بەرنامەی چاکسازی زەوییەکان کە شا بەڕێوەی برد بووە هۆی لەناوچوونی بەشێکی هەرە زۆری خاوەن زەوییە عەشیرەتییەکان.

سیاسەتی نیشتەجێکردنی عەشیرەتە گەڕیدەرەکان بووە هۆی ئەوە کە زەوییەکانی عەشیرە بدرێن بە سەرۆك عەشیرەتەکان، واتا ئاغاکان کە پاشان بوون بە زەمیندارگەلێکی مەزن و بوون بە خاوەنی لە سەدا ٦٠ی کۆی زەوییە کشتوکاڵییەکان (زیاتر لە ٣٠٠ دۆنم بۆ هەر ئاغایەك). ماڵکە نێوەنجییەکان (ئەوانەی کە خاوەن ٣٠ هەتا ٥٠ دۆنم زەوی بوون) کە لە دوای بەرنامەی چاکسازی زەوی دابەشبوون، توانیان زەوییەکانیان بپارێزن و لەو کاتە بەدواوە، بوون بە زۆربە. لەگەڵ ئەمەشدا سەرۆك عەشیرەتەکان ناکۆکی سیستماتیکیان لەگەڵ دەوڵەت نەبوو، بە پێچەوانەوە بوون بە هاوپەیمانی دەوڵەت بۆ ئەوەی کۆمەڵێك پوانی تایبەت وەك مافی لەوەڕاندنی ئاژەڵەکان لە دەوڵەت وەربگرن. لەمە زیاتر زۆربەی شارەدار و ئەندامانی پەرلمان، سەرۆك عەشیرەت یان جێگرەکانیان بوون. هۆکاری ئایینیش هەندێك جار کاریگەری هەبوو. بۆ نموونە ژمارەیەك لە سەرۆك عەشیرە شیعەکان (وەك عەشیرەتی "قەرەپاپاخ" لە دەوروبەری نەقەدە) توانیان لەگەڵ دەوڵەتدا کۆمەڵێك هاوپەیمانی پێکبێنن تا لە کاتی پێویستدا لە دژی عەشیرەتەکانی دیکە کەڵکی لێوەربگرن.

## بزووتنەوەی کورد پاش شۆڕشی ئیسلامی

لە ئەنجامی رووخانی دەوڵەتی پاشایەتی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩، کوردستانی ئێران بوو بە هەرێمێکی خودموختار. پاش ئەوە کە شا لە ئێران هەڵهات، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، نوێنەرەکانی خۆی نارد بۆ تاران تا رژێمی نوێ بە فەرمی بناسێت و لە بارەی خودموختاری کوردستان لەگەڵ دەوڵەت وتووێژ بکات، بەڵام ئایەتوڵڵا خومەینی خودموختاریی بۆ کوردستان رەتکردەوە لەبەرئەوە کە لە روانگەی ئەوەوە خودموختاری دژی پێوانەکانی ئیسلام بوو. لە گەلاوێژی ١٩٧٩، لە دوای ئەوە کە ئایەتوڵڵا خومەینی لە فتوایەکدا شەڕی پیرۆزی دژی گەلی کوردی کافر راگەیاند، هێزەکانی پاسدار هاتنە کوردستان و حیزبی دیموکرات جارێکی دیکە قەدەغە کرا.

له کوردستان کەمتر لە ٥٠٪ی خەڵك بەشدارییان لە ریفراندۆمی یاسای بنەڕەتیدا کرد و پێکدادانگەلێکی خوێناوی لە نێو کوردەکان و هێزەکانی رژێمی ئێران روویدا. لە دوای ئەوە رژێمی ئایەتوڵڵا خومەینی دەستی بە وتووێژ لەگەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کرد، بەڵام ئەم وتووێژە لەسەر کێشەی بێ چەککردنی حیزبی دیموکرات نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك. پێشمەرجی دەوڵەت، بێ چەککردنی حیزبی دیموکرات بوو، بەڵام ئەم پێشنیارە لە لایەن بزووتنەوەی کوردەوە رەتکرایەوە. لە ئاداری ١٩٨٠دا هەڵ بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران رەخسا تا لە هەڵبژاردنی پەرلمانی ئێران کاریگەری خۆی لە ناو خەڵکی کوردستاندا نیشان بدات و ٨٠٪ی خەڵکی کوردستان دەنگی خۆیان دا بە کاندیداکانی حیزبی دیموکرات، بەڵام سەرەڕای ئەم خۆشەویستبوونەی حیزبی دیموکرات لە ناو خەڵکدا، سەرۆك کۆماری ئێران، بەنی سەدر پاش یەك مانگ سوپای نارد بۆ کوردستان تا دژی پێشمەرگەکان شەڕ بکەن. لە دوای ئەم شەڕە پێشمەرگەکان ناچار بوون خۆیان لە ناوچە شاخاوییەکاندا جێگیر بکەن. دەوڵەت لەم هێرشە سەربازییە وەك هەلێك کەڵکی وەرگرت تا (بە پێچەوانەی ئەم راستییە کە ٧٥٪ی خەڵکی کورد سوننە بوون، تەنها کوردەکانی هەرێمی کرماشان شیعە بوون) مەلا شیعەکان لە پۆستە بەرزەکانی کوردستاندا دابنێت.

سەرەڕۆیی مەلا شۆڕشگێڕەکان پاش ماوەیەکی کورت خەڵکی بێزار کرد، بەتایبەت لەبەرئەوە کە مەلاکان لایەنگریان لە زەمیندارە مەزنەکان (کە زۆربەیان ئەندامی کۆمیتەکانی شۆڕش بوون) دەکردو دژی جووتیاران بوون. پاش رووخانی شا، جووتیارانی کوردستان زەویی زەمیندارە مەزنەکانیان داگیر کرد، بەڵام لە دوای ماوەیەك زەمیندارەکان بە پشتیوانی پاسدارەکان، لەدوای هەندێك پێکدادان، زەوییەکانیان لە چەنگی جووتیارەکان هێنایەوە دەرەوە.

پاش هەڵبژاردنی پەرلمانی ئێران لە ساڵی ١٩٨٠ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران تووشی جیابوونەوە هات، کە بووە هۆی ئەوە کە حیزب لەو قۆناخە هەستیارەدا لاواز ببێ. هۆی ئەم جیابوونەوەیە هەڵسەنگاندنی رژێمی ئایەتوڵڵا خومەینی لە ناو حیزبی دیموکرات بوو، واتا گرووپی غەنی بلوریان (رۆشنبیرێکی مارکسیست کە لە زیندانی شا رزگاری ببوو) رەخنەی لە قاسملو بەبۆنەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتی عێراق دەگرت و دەیگووت دەبێ حیزبی دیموکرات، رژێمی ئایەتوڵڵا خومەینی بە فەرمی بناسێت. بلوریان هەروەك حیزبی تودە دەیگوت دەبێ حیزبی دیموکرات پشتیوانی لە رژێمی ئایەتوڵڵا خومەینی بکات لەبەرئەوە کە



رژێمی ئیسلامی دژی ئیمپیریالیزمە واتا دژی ئەمریکایە. بلوریان لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە خودموختاری کوردستان تەنها بە شێوازی ئاشتیخوازانە بەدەستدێت، بەڵام کاتێ کە رژێمی خومەینی لە ساڵی ١٩٨٣دا حیزبی "تودە"ی قەدەغە کرد، هەڵەبوونی ئیستراتژییەکەی بلوریان کەوتە دەرەوە، تەنانەت ئەندامانی حیزبی تودە ناچاربوون بچنە ئەو هەرێمەی کە لە دەستی کوردەکاندا بوو.

پێش ئەوە کە پاسدارەکان حیزبی دیموکراتیان ناچار کرد لە کوردستان بچێتە دەرەوە، حیزبی دیموکرات هەوڵی دا خودموختارییەك لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا پێکبێنێ. حیزبی دیموکرات رێوەبەرییەکی سەرەتایی پێکهێنا و بەتایبەت قورسایی خۆی دا بە پەروەردە بە زمانی کوردی و تەنانەت لە کۆتایی١٩٨١ کتێبی وانەی قوتابخانەکانیشی چاپ کرد. حیزبی دیموکرات هەروەها ئێزگەیەکی رادیۆی دامەزراند کە رۆژانە سێ جار بە زمانی کوردی، ئازەری و فارسی بەرنامەی بڵاو دەکردەوە. لەو سەردەمەدا هەندێك رێکخراوی خێرخوازی ناونەتەوەیی وەك "رێکخراوی پزیشکانی سنوورنەناس" هاوکاری کوردەکانیان دەکرد. بەهەرحاڵ پەیوەندییی نێوان حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵە زۆر خراپ بوو، تەنانەت هەندێك پێکدادانی سەربازی لە ساڵی ١٩٨٢-١٩٨٣لەسەر کۆنترۆڵی هەندێك ناوچە لە نێوانیاندا روویدا، بەڵام پاش ئەو قۆناخە، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵە لەگەڵ هێرشی سوپای ئێران بەرەوڕوو بوونەوە، هەربۆیە ئیدی لەیەکیان نەدا و تەنانەت هاوکاری یەکتریشیان کرد.

حیزبی دیموکرات هەوڵیدا خودموختاری لە کوردستاندا پێکبێنێ، بەڵام ئەو هەوڵانە لە ئەنجامی هێرشەکانی سوپای ئێران کە لە ساڵی ١٩٨٣وە دەستیان پێکرد، سەرنەکەوتن. لە ئۆپەراسیۆنی وەلفەجری ٢دا، سوپای ئێران هەرێمی حاجی عومەرانی گرت و لە ئەنجامدا لۆجستیکی پێشمەرگەکان پچڕا. لە ساڵی ١٩٨٣لە ئۆپەراسیۆنی وەلفەجری ٣دا سوپای ئێران بەرەو پێنجوێن هاتە پێش و شوێنە ئیستراتژیکەکانی کوردستانی گرت. لەوکاتە بەدواوە ئیدی هیچ ناوچەیەك لە دەستی حیزبی دیموکراتدا نەما.

لە ساڵی ١٩٨٤ کۆنگرەی ٤ی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەڕێوەچوو و بڕیاری ئەوە درا کە درێژە بە شەڕی چەکداری بدرێ. لەو سەردەمەدا تەنها یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە رێبەرایەتی جەلال تالەبانی پەیوەندی باشی لەگەڵ حیزبی دیموکراتدا هەبوو. حیزبی دیموکرات هەروەها لەگەڵ مەترسی پەراوێزکەوتن بەرەوڕوو بووەوە، هەر بۆیە لە ساڵی

١٩٨١چووەناو ئەنجوومەنی خۆڕاگری نەتەوەیی (شورای ملی مقاومت)، بەڵام سەرۆکی ئەم ئەنجوومەنە، مەسعود رەجەوی دەیویست کۆمارێك وەك کۆماری ئیسلامی دابمەزرێنێت کە ئەم مەسەلەیەش دژی پرەنسیپە سکولارەکانی حیزبی دیموکرات بوو، هەربۆیە حیزبی دیموکرات لە ئەنجامی ناکۆکی لەگەڵ مەسعود رەجەوی، سەرۆکی رێکخراوی موجاهدینی خەلق لە ساڵی ١٩٨٢دا لە ئەنجوومەنی بەرخۆدانی نەتەوەیی کێشایەوە.

حیزبی دیموکرات بە هاوکاری دەوڵەتی عێراق توانیبووی خۆی لەسەر سنووری ئێراندا جێگیر بکات. پاش ئاگربەستی ئێران و عێراق لە گەلاوێژی ١٩٨٨، قاسملو، رێبەری حیزبی دیموکرات وتی ئامادەیە لە بارەی خودموختاری کوردستان لەگەڵ دەوڵەتی ئێران وتووێژ بکات. پاشان هەندێك وتووێژ لە نێوان قاسملو و دەوڵەت لە ڤییەنا، پایتەختی نەمسا لە ٣٠و ٣١ی بەفرانبار ئەنجامدرا و لە ١٩و ٢٠ی رێبەندانی ١٩٨٩لە هەمان شاردا درێژەی پێدرا. ئەمە بووە هۆی ئەوە کە لە ناو حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا ناکۆکی سازبێت و هەندێك کەس لە ساڵی ١٩٨٩ لە حیزب جودا بوونەوە. لە یەکەم قۆناخی وتووێژەکاندا جەلال تاڵەبانی وەك ناوبژیکەر لە نێوان دەوڵەتی ئێران و حیزبی دیموکرات کاری دەکرد. وەها دیار بوو کە مەرگی خومەینی لە جۆزەردانی ١٩٨٩، پرۆسەی وتووێژەکان پێش دەخات، بەڵام لە ١٣ی پووشپەڕی ١٩٨٩ عەبدەلڕەحمان قاسملو و قادری ئازەر، نوێنەری حیزبی دیموکرات لە ئەوروپا، لە ڤییەنا کوژران.

قاسملو ساڵی١٩٣٠لە بنەماڵەیەکی بلیمەت هاتە دنیا و کوڕی سەرۆك عەشیرەتێکی کورد بوو. قاسملو لە ساڵی ١٩٤٩ چووە فەڕەنسا و پاشان چکسلوڤاکیا و لەوێ لە بەشی ئابووریدا خوێندی و سەرەتا وەك چالاکڤانێك و پاشان وەك ئەندامێکی حیزبی تودە ١٥ ساڵ لە پراگ، پایتەختی چکسلوڤاکیا ژیاو مامۆستای بەشی ئابووری زانکۆی پراگ بوو و پاش ئەوە کە لە پاییزی ١٩٧٨دا گەڕایەوە بۆ ئێران، قەناعەتی بەوە هێنا کە رێگاچارەی کێشەی کورد سەربازی نییە، هەربۆیە لەگەڵ دەوڵەتی ئێران وتووێژی کرد.

قاسملو بوو بە قوربانی ئەو بیرۆکەیە کە دەتوانی لە رێگای وتووێژ لەگەڵ دەوڵەتی ئێران ئەنجامی باش بۆ کوردەکان بەدەست بخات. هیچ گومان لەوە دا نییە کە قاسملو بە دەستی دەزگای سیخوڕی ئێران کوژرا، هەربۆیە بڕیاری دەستگیرکردنی ٢ دیپلۆماتی ئێران لە لایەن دەوڵەتی نەمساوە دەرچوو، بەڵام ئەو بڕیارە جێبەجێ نەکرا و دیپلۆماتە ئێرانییەکان لە نەمسا چوونە دەرەوە، چونکە نەمسا نەیدەویست خۆی بەم کێشەیەوە سەرقاڵ بکات.

کوژرانی قاسملو بووە هۆی ئەوەی زەبرێکی گەورە لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بکەوێت.



## پێکهاتەی کۆمەڵایەتی

کوردەکانی ئێران لە ناوچە شاخاوییەکاندا دەژین، واتا لە شوێنێك کە شارەکان ١٠٠٠مەتر لە ئاستی دەریا بەرزن. ئاووهەوای کوردستان قاڕییە و رەوشی ئاووهەوا زۆر دەگۆردرێت، بەڵام وشکایی ئاووهەوای کوردستان لە شوێنەکانی دیکەی ئێران کەمترە. کوردەکان لە ١٢٥ هەزار کیلۆمەتر لە ٤ ملیۆن دۆنم ناوچەی شاخاوی ئێران نیشتەجێن.

بە هۆی دابەشبوونە ئیدارییەکانی دەوڵەتی ئێران، ناوی "کوردستان" تەنها بە ناوچەی سنە دەگوترێت، ئەمە لەحاڵێکدایە کە پارێزگاکانی کرماشان و (ئیلام) و بەشێك لە ئازەربایجان-ی (رۆژئاوا)ش کوردن.

لەبەرئەوەی کە دەوڵەتی ئێران هیچ هەڵسەنگاندنێکی لە حەشیمەتی کوردەکان بڵاو نەکردووەتەوە، ئامارێکی ورد لەبەر دەستدا نییە، بەڵام کورد لە سەدا ١٥ی حەشیمەتی گشتیی وڵات پێکدەهێنن، واتا نزیکەی ٧ ملیۆن حەشیمەتیان هەیە. رێژەی گەشەی ساڵانەی حەشیمەتی کورد پتر لە ٢/٨ لە سەدە کە لە نێونجی گەشەی ساڵانەی حەشیمەتی وڵات زۆرترە. هەروەها حەشیمەتێکی مەزنی کوردەکان لە دەرەوەی کوردستان، لە "قۆچان"و "دەرەگەز" کە سەر بە پارێزگای خوراسانن، دەژین. ئەم کوردانە لە سەرەتای سەدەی ١٧ لە لایەن "شاعەباس"ەوە بۆ ئەو شوێنانە دوورخرانەوە تا سنوورەکانی ئیمپراتۆری ئێران بپارێزن. حەشیمەتی ئەم کوردانە نزیکەی ٦٠٠ هەزار کەسە. هەروەها دەبێ ئەمە لە بەرچاو بگیردرێت کە لە سەدا ١٥ی دانیشتووانی کوردستان، فارس و ئازەرین.

رێژەی کەڵەکەی حەشیمەتی کوردستان دووقاتی شوێنەکانی دیکەی ئێرانە. لە نێوان ئەو چوار پارێزگایە کە کوردنشینن (ئازەربایجانی رۆژئاوا، کوردستان، کرماشان و ئیلام)، پارێزگای کرماشان لە رووی شارنشینینەوە لە هەموویان پێشکەوتووترە. کرماشان کە ناوەندی پارێزگای کرماشانە لە کۆتایی سەدەی ١٩ گەشەیەکی زۆری بە خۆیەوە بینیو تا ئێستاش بە پتر لە یەك ملیۆن حەشیمەت، گرینگترین شاری کوردنشینە. (زۆربەی) خەڵکی کرماشان شیعەن.

شارە سەرەکییەکانی کوردستانی ئێران بریتین لە مەهاباد، سەقز، سنە، کرماشان (و ئیلام). مەهاباد جگە لەو دەورە مێژووییە کە لە ساڵی ١٩٤٦دا بینی، ناوەندێکی شاریی گرینگەو لەسەر رێگای جادەی تەورێز ـ رواندز هەڵکەتووە کە کوردستانی ئێران بە کوردستانی عێراقەوە گرێ دەدات. مەهاباد بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ شارێکی گۆشەنشین بووەو سەرەڕای کۆمەڵێك پێوەندی لەگەڵ ئازەربایجانو موسڵ، خاوەن پێوەندی ئابووری ئەتۆ نەبووە.

پێکهاتەی ئابووریی کوردستان یەك بەرهەمییەو خاوەن هیچ تەکنۆلۆژییەکی پیشەسازی نییە (تەنها بەشێکی پڕ قازانج کە لە بواری پیشەسازییدا گەشەی کردووە، بەرهەمی نەوتە لە پارێزگای کرماشان). لە ئاکامدا ئاستی داهاتی خەڵکی کوردستان لە بنەڕەتدا کەمتر لە نێوەنجی داهاتی وڵاتی ئێران بەگشتییە. بە هۆی گەشەنەکردنی پیشەسازی، هێشتا ژمارەیەکی زۆرکەم کارخانە لە کوردستاندا هەیەو بە هۆی ئەوە کە دەرفەتی کارکردن لە کوردستان کەمە، خەڵکی ناوچە کوردنشینەکان بۆ ناوچە دەوڵەمەندەکان وەك خوزستان، تاران و ئەسفەهان کۆچ دەکەن. هەر بۆیە کوردستان، گرینگترین بەشی چالاکی حەشیمەتی خۆی بە قازانجی ناوەندە پیشەسازییەکان لە دەست داوە.

هەتا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە بەشی تەندروستییەوە هەیە، کوردستان بە دەست نەبوونی کادری پسپۆڕ دەناڵێنێ. ژمارەی پزیشکانی کوردستان بە بەراورد لەگەڵ شوێنەکانی دیکە کەمترە، ژمارەی قوتابخانەکان وەڵامی پێویستیی حەشیمەت ناداتەوە و جێگای سەرسووڕمان نییە ئەگەر گوندێك کە ٢٥٠ تا ٣٠٠ قوتابی هەیە، تەنها مامۆستایەکی هەبێت. ژمارەیەکی زۆر لە منداڵان بەتایبەت لە گوندەکان قەت ناچنە قوتابخانە، کەوابوو ڕێژەی نەخوێندەواری لە سەرۆیە. لە ساڵی ١٩٧٥، پتر لە ٧٠ ٪ خەڵك بە گشتی و "٨٠ ٪ی ژنان نەخوێندەوار بوون و لە سەدا ٢/٥ی کچان و ١/٤ی کوڕان قەت نەدەچوونە قوتابخانە. لە گوندەکاندا هەموو ژنان (٩٥٪) و ٨٥٪لە سەدی پیاوان نەخوێندەوار بوون. ژمارەی نەخوێندەواران لە شارەکاندا کەمتر بوو (٦٠٪ی ژنانو ٤٠ ٪ی پیاوان).

بە هۆی قەدەغەبوونی پەروەردە بە زمانی کوردی لە قوتابخانەکان، منداڵانی کورد بە زمانی فارسی پەروەردە دەبینن و خوێندن و نووسینی گشتیی کوردە خوێندەوارەکان بە زمانی فارسییە، لە بەر ئەوەی کە زمانی فارسی، زمانی فەرمیی سیستەمی پەروەردەیی ئێرانە. بەهەرحاڵ هەرچەند کە پەروەردە بە زمانی کوردی قەدەغەیە، بەڵام ڕادیۆ دەوڵەتییەکان (بەتایبەت لە کرماشان) هەندێك بەرنامە بە زمانی کوردی بڵاو دەکەنەوە. ئەمە دەبێتە هۆکارێکی یارمەتیدەر بۆ مانەوەی ژیانی کولتووری کوردەکان. هەروەها چاپەمەنی کوردی لە عێراق، کار دەکاتە سەر بوژانەوەی کولتووری کوردەکانی ئێران.

## له پێکەوە هەڵکردن تا سەرکوت

له سوریا کوردەکان سەرژمێری نەکراون، بەڵام حەشیمەتیان نزیکەی یەك ملیۆن کەسە واتا ١٠٪ی دانیشتوانی گشتیی وڵاتی سوریا پێکدەهێنێت. تەنها ١٠%ی کوردەکانی سوریا له شارە عەرەبنشینەکاندا دەژین کە زۆربەیان لە حەلەب، دیمەشق و حەما (کە دراوسێی ناوچە کوردنشینەکانن) نیشتەجێن. لە سوریا ٣ ناوچە زۆربەی دانیشتووەکانی کوردن: جەزیرە، کورداغ، جەبەل سەمعان و ئازا. ئەم ناوچانە بە هۆی ئەوەی کە ناوچەی عەرەبنشین کەوتۆتە بەینیان، بە تەواوی لە یەکجیان، کەوابوو شتێك بە ناوی کوردستان لە سوریا بوونی نییە. لە بەر ئەوەی حەشیمەتی عەرەبی ناوچەی جەزیرە هێشتا کۆچەرن، کوردەکانی سوریا بە یارمەتی ئەو کوردانەی کە لە دەیەی ١٩٢٠ لە تورکیاوە کۆچی ئەو شوێنەیان کرد، زەوییەکانی "جەزیرە"یان کرد بە ناوچەیەکی دەوڵەمەندی کشتوکاڵی.

پتر لە نیوەی کوردەکانی سوریا لە "جەزیرە" دەژین. حەشیمەتێکی مەزنی عەرەبی گەڕیدەریش لە ناوچەی باشووری "جەزیرە" کۆبوونەوتەوە. هەروەها حەشیمەتێکی بچووکی کوردەکان کە لە ژمارەیەك کوردی ئێزدی پێکهاتووە، لە نێزیکی دەریاچەی "خاتون" لەم ناوچەیە نیشتەجێن. ناوچەکانی دەوروبەری "عەینەلعەرەب" کە لە باکووری رۆژئاوای حەلەب هەڵکەوتوون، بەتەواوی کوردنشینن کە نزیکەی ٨٠ هەزار کەس حەشیمەتیان هەیە. نزیکەی ٣٥٠ هەزار کوردیش لە ناوچە شاخاوییەکانی ناسراو بە "کورداغ" (شاخی کوردەکان) کە لە باکووری رۆژئاوای "ئانتیونیچ" هەڵکەوتووە، دەژین. ئەم حەشیمەتە کەڵەکە بە هۆی ئەو زەوییە کشتوکاڵە پڕ پیتانە کە هەیانە، بارودۆخێکی خوازراویان هەیە.

لە رووی مێژووییەوە، کوردەکانی سوریا بە باشی بەرەو کۆمەڵگای سوریا راکێشران و وەك موسڵمان هەمان مافی عەرەبەکانیان هەبوو. بۆ نموونە حکوومەتی ئاریستۆکراتی سەربازیی عەرەب و کوردە موسڵمانەکان لە سەدەکانی ناوەڕاست بەسەر هەموو کۆمەڵگای ئیسلامدا فەرمانڕەواییان دەکرد و سوڵتان سەلاحەدین-ی ئەیوبی کورد لە سەدەی ١٢ لە دژی خاچپەرستەکان، سەرکەوتنێکی یەکلاییەکەرەوەی بەدەستهێنا.

لە سەردەمێکدا کە سوریا لە ژێر چەتری پارێزگاری فەڕەنسا بوو، چاپەمەنی کوردی بە بێ هیچ کەند و کۆسپێك بڵاودەبووەوە، تەنانەت لە کاتی دەرچوونی سەربازەکانی بریتانیاو





فەڕەنسا لە سوریا لە ساڵی ١٩٦٤، کۆمەڵگای عەرەب و کورد پەیوەندیی باشیان لەگەڵ یەکدا هەبوو. بەهەرحاڵ بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی عەرەب کە لە لایەن چینی ناوەڕاستی سوریاوە پشتیوانی لێدەکرا، دژی بە فەرمی قەبووڵکردنی مافی کەمینەی کورد بوو، هەرچەند کە هیچ کردەوەیەکیان بۆ سەرکوتکردنی کوردەکان ئەنجام نەدا. لەو کاتەدا بە کوردەکان ئیزن درا بەرهەمە ئەدەبییەکانی خۆیان بە زمانی کوردی بڵاوبکەنەوە. منداڵانی کورد بە زمانی عەرەبی پەروەردەیان دەبینی، بەڵام پەروەردە بە زمانی کوردی لە دەرەوەی قوتابخانەکان، قەدەغە نەبوو.

ساڵی ١٩٥٦ بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی عەرەب کە لە ژێر کاریگەریی لایەنگرانی جەماڵ عەبدولناسردا بوو، لە دیمەشق زەق بووەوە. لەو کاتە بەدواوە هەڕەشە لە کوردەکان کرا و سەرکوتی کەمینەی کورد دەستی پێکرد. بڵاوکردنەوەی مۆسیقای کوردی لە کافەکان قەدەغەکراو بڵاوکردنەوە و تەنانەت خوێندنەوەی کتێبە کوردییەکان بوو بە سووچ و سووچباران بە سزای یەك ساڵ زیندان حوکم دران.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی سوریا (PDKS) لە ساڵی ١٩٥٧ (پێش بەدەسەڵات گەیشتنی حیزبی بەعس) بە یارمەتی جەلال تاڵەبانی، نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە دیمەشق دامەزرا. نورەدین زازا یەکەمین سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردی سوریا بوو. نورەدین زازا لە بنەماڵەیەکی ناوین لە ئەنادۆڵی رۆژئاوا لە تورکیا هاتە دنیا. پاش راپەڕینی شێخ سەعید پیران (١٩٢٥) بنەماڵەی "زازا" لە یەك هەڵوەشایەوە، هەربۆیە سەردەمی منداڵی خۆی لە سوریا دەرباز کردو قوتابی قۆناخی دواناوەندی قوتابخانەی فەڕەنسەوییەکان لە دیمەشق بوو. ساڵی ١٩٤٤ کاربەدەستانی عێراق نورەدین زازایان بە تاوانی هەوڵدان بۆ چوونەناو ریزی هێزەکانی ژەنەڕاڵ بارزانی زیندانی کرد. "زازا" پاش تەواوکردنی خوێندن لە زانکۆی بێروت، چووە لۆزان و یەکەمین بزووتنەوەی خوێندکارانی کوردی لەوێ دامەزراند. پاشان گەڕایەوە بۆ دیمەشق و لە دوای یەك ساڵ، پارتی دیموکراتی کوردستانی سوریای دامەزراند. نورەدین گیرا و بە تاوانی چالاکی سیاسی لە ساڵی ١٩٦٠ حوکمی ئیعدامی لەسەردرا، بەڵام لە ئاکامی خەباتی ناونەتەوەیی ئازادکرا. یەك ساڵ و نیو پاش ئازاد بوون، "زازا"چووە لوبنان و پاشان چووە ئۆردون، بەڵام دەوڵەتی ئۆردۆن ئەوی تەسلیمی دەسەڵاتدارانی سوریا کردەوە. "زازا" جارێکی دیکە زیندانیکراو سەرەنجام لە ساڵی ١٩٧٠ ئازادکرا. لە کۆتاییدا "زازا" بۆ سویس دوورخرایەوە و لە ئۆکتوبری ١٩٨٨ بە هۆی نەخۆشی شێرپەنجە لەوێ کۆچی دوایی کرد.

دامەزرێنەرانی دیکەی پارتی دیموکرات وەك عوسمان سەبری (شاعیری بەناوبانگ)، حەمید حاج دەرویش (خوێندکاری بەشی ماف و یاسا) و شێخ موحەممەد عیسا مەحموود (ڕێبەری ئایینی) یش خاوەن رابردوویەکی پڕ شکۆ بوون.

ئەو کاتە چالاکییە نهێنییەکانی حیزب، بڵاوکردنەوەی وتار و بڵاقۆك بە زمانی کوردی و عەرەبی و راکێشانی چالاکانی لەخۆ دەگرت. پارتی دیموکرات دژی یەکێتی میسر و سوریا- کە دەبووە هۆی زاڵبوونی ئایدیۆلۆژی پانعەرەبیزم- و هەروەها دژی دەرکردنی کوردەکان، بە تایبەت لە دەمودەزگا حکومییەکاندا بوو. چالاکییە نهێنییەکانی حیزب زۆر درێژەی نەکێشا. لە ١٥ی ئابی١٩٦٠، دەزگای سیخوڕی سوریا ڕێبەرانی کۆمیتەی بەڕێوەبردنی پارتی لە حەلەب دەستگیر و ئەشکەنجە کرد. ڕێکخراوی حیزب بە تەواوی لەناوچوو و ٥ هەزار کەس، لەوانە نورەدین زازا، عوسمان سەبری و رەشید ئامۆ (کە مامۆستا و ئەندامی پێشووی حیزبی شیوعی سوریا بوو) دەستگیرکران.

هەڵوەشانەوەی یەکێتی میسر و سوریا و هەڵبژاردنی پارلمانی سوریا لە ئەیلوولی١٩٦١ ڕێگای بۆ ئەوە خۆشکرد کە شێخ مەحموود عیسا ببێ بە ئەندامی پەرلمان. نورەدین زازاش لە هەڵبژاردندا سەرکەوت، بەڵام سەرکەوتنەکەی بەتاڵکرایەوە. نورەدین زازا سەرەنجام لە ساڵی ١٩٦٣ سوریای بەجێهێشت. ڕێبەرایەتی پارتی دیموکرات لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦١ تا ١٩٦٣ لە ئەستۆی حەمید حاج دەرۆیش بوو. حاج دەرۆیش توانیبووی خۆی لە شەپۆلی یەکەمی دەستگیرکردنەکان لە ساڵی ١٩٦١ بپارێزێت. دەرۆیش سەرەنجام لە ساڵی ١٩٦٥ گیرا و ١٠ مانگ زیندانیکرا. پاشان بە هاوکاریکردن لەگەڵ دەوڵەت تۆمەتبارکرا.

لە دەیەی ١٩٦٠ کوردەکان تەنانەت ئەو کوردانەی کە ئەندامی پارتی دیموکرات نەبوون کەوتنە بەر ئازارو لێپرسینەوەی دەسەڵاتدارانی سوریا. ئەو کاتە بەڵگەیەکی دەزگای سیخوڕی کە موحەممەد تالیب هیلال، حاکمی جەزیرە ئیمزای کردبوو، کەوتە دەر کە شێوازی بیرکردنەوەی هەندێك لە ڕێبەرە عەرەبەکانی نیشان دا. هیلال پێشنیاری ئەوەی کردبوو کە بە هۆی پێگەی نەتەوەیی و گشتیی پارتی دیموکرات لە نێو کوردەکان، حەشیمەتی کورد دەبێ دووربخرێتەوەو عەرەب لە جێیاندا نیشتەجێ بکرێ. بە گوێرەی ئەو توێژینەوەیە کە لە ساڵی ١٩٦٣ بڵاوبووەتەوە، لە ٢٣ی ئابی ١٩٦٣ فەرمانێك لە مەڕ سەرژمێری حەشیمەتی کوردی پارێزگای جەزیرە دەرچوو بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو کوردانەی کە لە تورکیاوە دەهاتن، بەربەرەکانی بکرێت. لە دوای راگەیاندنی ئەنجامەکانی ئەم سەرژمێرییە، ١٢٠ هەزار کورد لە مافی



هاووڵاتی سوریا بێبەشکران. ئەم کوردانە نەیاندەتوانی بێ ناسنامەی سوریا، ژیانی هاوسەری پێکبێنن و ئەگەر نەخۆش دەکەوتن، نەیاندەتوانی بچنە نەخۆشخانەکان، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەبوایە خزمەتی سەربازییان بکردبایە. لە راستیدا گەلێك لەم کوردانە لە ساڵی ١٩٦٧ بۆ شەڕ دژی ئیسرائیل نێردران بۆ بەرزاییەکانی "جەولان".

دەوڵەتی سوریا هەروەها لە درێژەی سیاسەتی تەعریبی کوردەکان، بەرنامەی پێکهێنانی "کەرتی عەرەبی" جێبەجێکرد کە بەپێی ئەو بەرنامەیە، کوردەکانی ناوچە سنوورییەکانی تورکیا و سوریا دەرکران و حەشیمەتی عەرەب رۆژ لە دوای رۆژ لە جێیان نیشتەجێکران. دۆزرانەوەی نەوت لە ناوچەی قەرەچوك، لەوانەیە یەکێك لە هۆکارەکانی جێبەجێکرانی ئەم سیاسەتە بووبێ.

## حزبی بەعس و کوردەکان

پاش بە دەسەڵات گەیشتنی حزبی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣، بارودۆخی کوردەکان رووی لە خراپی کرد. بەرنامەی "کەرتی عەرەبی"هەروەها درێژەی هەبوو و بە پێی بەرنامەی چاکسازی زەوییەکان، جووتیارانی کورد لەسەر زەوییەکانیان دەرکران. لەمە زیاتر، دروستکردنی بەنداوی "تەبقە"، ڕێگای بۆ جووتیارە عەرەبەکان خۆشکرد تا زەوی جووتیارە کوردەکان داگیر بکەن. لە ساڵی ١٩٧٥، حەوت هەزار بنەماڵەی عەرەب لەم ڕێگاوە لە ناوچە کوردنشینەکان نیشتەجێکران.

لەو قۆناخەدا حزبی دیموکراتی سوریا لەگەڵ سیاسەتی سەرکوت رووبەڕووبووەوە و لە ئاکامی ناکۆکی نێوان ڕێبەرەکانی لەسەر شێوازی خەبات، لەتبوو. پارتی دیموکرات یەکەمجار ساڵی ١٩٦٥ بە هۆی ناکۆکی عوسمان سەبری و حەمید حاج دەرۆیش تووشی لەتبوون بوو. ئەم قەیرانە لە ژێر کاریگەریی جیابوونەوە لە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقدا پێکهات، چونکە جەلال تالەبانی کە لەگەڵ حەمید حاج دەرۆیش خوێندبووی، دژی بارزانی بوو، کە عوسمان سەبری پشتیوانی لێ دەکرد. سەرەڕای هەوڵەکانی مەلا موستەفا بارزانی بۆ ئاشتکردنەوەی ئەم دووانە، بزووتنەوەی کورد بە دامەزرانی "پارتی نوێی دیموکراتی کوردستانی سوریا" بە ڕێبەرایەتی داهام میرۆ لەت بوو. حیزبەکەی داهام میرۆ کە دۆستی موستەفا بارزانی بوو، ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی کوردی پێشووی حیزبەکەی کۆکردەوە، کەوابوو شێخ موحەممەد عیسا مەحموود و حەمید سینۆ هاتنە نێو ریزی "حیزبی نوێی دیموکراتی کوردستانی

سوريا". سەرەنجام لە ساڵی ١٩٧٢ بە دەستگیرکرانی ڕێبەرە سەرەکییەکانی حیزب، چالاکییە بەڕێکخستنکراوەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی سوریا بەرەبەر کۆتایی پێهات.

## کورد و ڕژێمی حافز ئەسەد

پاش بە دەسەڵات گەیشتنی حافز ئەسەد لە ساڵی ١٩٧٢، بارودۆخی کوردەکان لە سوریا باشتر بوو. هۆکاری ئەم گۆڕانکارییە ئەوە بوو، کە سەرۆك کۆماری سوریا بە دوو هۆی ناوخۆیی و دەرەکی پێویستی بە کوردەکان هەبوو: هۆکارە ناوخۆییەکەی ئەوە بوو کە لەو کاتەوە کە دەسەڵات کەوتە دەستی کەمینەی بچووك، بەڵام زاڵی عەلەوییەکان، حافز ئەسەد دەیەویست پشتیوانی لە مافی کەمینەکانی دیکە وەك کوردەکان بکات. لەمە زیاتر ڕژێمی سوریا بۆ بەشداریکردنی کوردەکان لە حکوومەتی سوریا، "هێزی سەربازی شانازی کورد"ی دروستکرد. ڕژێمی سوریا لەم کوردانە بۆ سەرکوتکردنی برایانی موسڵمان لە حەلەب لە ١٩٨٠و لە حەما لە ١٩٨٢ بە ڕێبەرایەتی عەلەوییەکان کەڵکی وەرگرت. هۆکارە دەرەکییەکە ئەوە بوو کە چونکە کورد کەمینەیەکی بچووکن و هیچ مەترسییەك نین بۆ دەوڵەتی سوریا، سوریا لە فاکتۆری کورد بۆ ناسەقامگیرکردنی وڵاتانی دراوسێ کەڵك وەردەگرێت. بۆ نموونە تورکیاو سوریا لەگەڵ یەك ناکۆکن کە ریشەی مێژوویی ئەم ناکۆکییە دەگەڕێتەوە بۆ گواستنەوەی دەسەڵاتی پارێزگای ئەلیکساندر بۆ تورکیا لە ساڵی ١٩٣١ لە سەردەمێکدا کە سوریا لە ژێر چەتری پاراستنی فەڕەنسا بوو.

زێدەباری ئەم ناکۆکییە سەرزەوییە، ئێستا تورکیا خەریکی دروستکردنی بەنداوێکی گەورەیە لەسەر ڕووباری فورات (بەنداوی ئاتاتورك) کە سوریا لە نیوەی ئاوەکەی بێبەش دەکات و وا لە تورکیا دەکات گوشار بخاتە سەر سوریا، شتێك کە سوریا بە هەڕەشەی دەزانێ. لە ساڵی ١٩٨٨ ڕێککەوتننامەیەك لە نێوان دوو وڵاتی تورکیا و سوریا ئیمزا کرا کە بە پێی ئەو ڕێککەوتننامەیە سوریا دەبوایە کۆتایی بە یارمەتییەکانی بە pkk بهێنابایا واتا بنکەکانی بزووتنەوەی کوردی pkk لە سوریا دابخات، لە بەرامبەردا تورکیاش بەشی ئاوی سوریای زەمانەت دەکرد، بەڵام pkk لە کردەوەدا بنکەکانی خۆی لە سوریا گواستەوە بۆ دۆڵی بوقاع لە لوبنان (کە لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی حافز ئەسەددا بوو). لەمە زیاتر دەوڵەتی حافز ئەسەد سەرپێچی لە رادەستکردنەوەی عەبدوڵڵا ئۆجەلان، ڕێبەری pkk بە تورکیا کرد. کەوابوو ڕێککەوتننامەکەی نێوان سوریا و تورکیا بێواتا بوو.



دوژمنایەتی نێوان دوو حیزبی بەعسی سوریا و عێراق، هۆی پشتیوانیکردنی سوریا لە کوردەکانی عێراق بوو. سوریا جگە لەوەی کە نووسینگەی نوێنەرایەتی دیپلۆماتیکی کوردەکانی لە سوریا کردەوە، پەناگا و ڕێگای هاتووچۆی ئەوانی بۆ کوردستانی عێراقیش دابینکرد.

ئەڵبەتە سەرەڕای ئەم نەرمونیان نواندنە ڕێژەییەی کاربەدەستانی سوریا، کەمینەی کورد لە سوریا لە هەموو چەشنە مافێك بێبەشە. بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و کتێب و پەروەردە بە زمانی کوردی قەدەغەیە. دەوڵەت هەروەها فستیواڵی جەژنی نەورۆزی کوردەکانی قەدەغە کردووە. ئەم کردەوانەی سوریا بووە هۆی پێکدادانی نێوان کوردەکان و پۆلیس لە ساڵی ١٩٨٦ کە کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی لێکەوتەوە.

لە مانگی ئاداری ١٩٩٠ کوردەکان بە مەبەستی نارەزایەتی دەربڕین لە بێبەشکرانی کوردەکان لە مافی هاووڵاتیبوونی سوریا (لە ساڵی ١٩٦٢ەوە)، خۆپیشاندانیان کرد و کاتێ ویستیان لیستی داخوازییەکانیان تەسلیمی سەرۆك کۆمار بکەن، سەرکوتکران. ئەم ڕووداوە چەند ڕۆژ پاش هەڵبژاردنێك ڕوویدا کە دەرچوونی فەرمانێك بۆ چاکسازی سیستەمی سوریای لێکەوتەوە.

لە هەڵبژاردنەکانی پەڕلمان، ڕێژەی دەنگی کاندیدا سەربەخۆکان لە٤٠٪ بۆ ٨٠٪ زیادی کرد. کەوابوو لەم هەلومەرجەدا، دەنگدەرانی کورد توانیان ١٥ کاندیدای کورد هەڵبژێرن. ٣ کەس لەم کاندیدانە سەر بە لیستی ڕێکخراوە کوردییەکانی سوریا بوون کە بریتی بوون لە کەماڵ ئەحمەد، سکرتێری "پارتی دیموکراتی سوریا"، حەمید حاج دەرویش، ڕێبەری "حیزبی دیموکراتی پێشکەوتنخوازی سوریا" و فۆئاد پیکۆ، نوێنەری "حیزبی گەلی کوردی سوریا". کاندیدا هەڵبژاردووەکانی دیکەش سەر بە ڕێکخراوی کۆمەڵەی کوردەکانی دیمەشقو ناوچە کوردنشینەکانی دیکەی سوریا بوون.

بە کورتی ئەم سەرکەوتنە سیاسییە نائاساییەی کەمینەی کورد، نیشانەی ئەوەیە کە لە نێوان ڕێبەرانی کوردی سوریا و دەوڵەتی سوریا پەیوەندی پێکهاتووە، بەڵام ئەمە بۆ کوردەکان شتێکی مەترسیدارە، چونکە لەوانەیە کوردەکان ناچار بن لە پاشەڕۆژدا وەك عەلەوییەکان بەهایەکی قورس بدەن بۆ ئەو پوانانەی کە ئەمڕۆ بە هۆی بەشداریکردن لە سەرکوتکارییەکانی سوریا، هەیانە. کاردانەوەی زۆربەی حەشیمەتی سوننەی سوریا کە لەوانەیە لە سوریا بێنە سەر دەسەڵات، دەتوانێ ببێ بە قۆناخێکی تۆڵەسەندنەوە و سەرکوتی توندی کوردەکان.

## ئاوڕدانەوەیەکی گشتیی

کۆمەڵگای هەنووکەی کورد لە لوبنان بەرهەمی چەند شەپۆلی کۆچبەرییە[1]. یەکەم شەپۆلی گرینگ دوو دەیە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی روویدا، واتا کاتێك کە هەزاران کورد لە دەستی توندوتیژی و هەژاری کە لەو سالانەدا باڵی بەسەر کوردستاندا کێشابوو، هەڵاتن. زۆربەی ئەم کوردانە لە گوندەکانی ماردین و تورعەبدین هاتبوون. دووەم شەپۆلی گرینگی کۆچ لە سەردەمی نێوان شەڕی دووەمی جیهان و ساڵەکانی سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ روویدا. بەشێکی مەزنی ئەم کۆچبەرە نوێیانە لە تورکیاوە هاتبوون. بەهەرحاڵ، زۆربەی ئەم کۆچبەرانە لە سوریاوە هاتبوون و لە دەستی سەرکوتی کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری و سیاسیی سوریا کە لە ساڵی ١٩٥٨ لەوێ دەستی پێکرد، هەڵاتبوون. باشتربوونی رێژەیی رەوشی ژیانی کوردەکان لە لوبنان و نزیك بوونی ئەم وڵاتە بە کوردستان، دەورێکی گرینگی بینی لە هاندانی ئەم کۆچبەرە نوێیانە بۆ هەڵبژاردنی لوبنان وەك نیشتیمانی نوێی خۆیان یان وەك شوێنی نیشتەجێبوونی کاتی.

هەموو کوردەکانی لوبنان موسڵمانی سوننەن، بەڵام بەهەرحاڵ بە گەلێ گرووپی عەشیرەتی یان بە کۆمەڵ دابەشکراون کە هەرکام بە ناوچە یان گوندێك کە لێهاتوون، گرێدراون. ئەم گرووپە بەکۆمەڵانە ناوی گوندی باوباپیرانیان لە سەرە وەك ئەلراجدیە، ماسارتیح، ئەلمەخاشنییە، ئەلمنەنزیل، مەرجە، جەبەلگراو- کیندیریب، مارسکا، زەنی، فافە و مەتینا.

---

١- مێژووی کورد لە لوبنان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ١٢ی زایینی واتا کاتێ کە ئەیوبییەکان گەیشتنە ئەوێ. چەند سەدە دواتر چەند بنەماڵە (یان عەشیرەتی) کوردی دیکە لە لایەن هێزە جۆراوجۆرەکان (بۆ نموونە عوسمانییەکان) نێردران بۆ لوبنان تا سەقامی ناوچەکە بپارێزن. کوردەکانی دیکە بە هۆی هەژاری و توندوتیژی لە کوردستان بۆ لوبنان کۆچیان کرد. ئەم گرووپە کوردانە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە گەلێ لە ناوچەکانی لوبنان نیشتەجێبوون و دەسەڵاتدارییان کرد، بۆ نموونە میرەکانی سەیفە لە ترپیولی، بنەماڵەی میربی لە ئاکار، جونبەلاتەکان و عیمادەکانی چیای لوبنان و بنەماڵەی حەمییە لە بەعلبەك. ئەم بنەماڵە کوردانە کە ساڵەهای ساڵ لە زێدی خۆیان دوور بوون، بەتەواوی خۆیان لەگەڵ پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتیی لوبناندا رێکخستبوو و هەتا کۆتایی سەدەی ١٩ بە تەواوی ببوون بە عەرەب.



لە رووی زمانەوە کوردەکانی لوبنان بە دوو گرووپ دابەش دەکرێن: ئەوانەی کە بە زاراوەی کرمانجی باکوور (کە بادینانی پێ‌دەڵێن) قسە دەکەن و ئەوانەی کە بە زاراوەی ماردینی (کە ئاوێتەیەك لە عەرەبی، کوردی، سریانی و تورکییە) قسە دەکەن، بەڵام زۆرتر بە زمانی عەرەبی و زاراوەی کرمانجی قسە دەکەن. ئەوانەی کە بە زاراوەی کرمانجی قسە دەکەن بە ئاسانی لە زاراوەی ماردینی تێدەگەن، بەڵام ئەوانەی کە بە زاراوەی ماردینی قسە دەکەن بە ئاسانی لە زاراوەی کرمانجی تێناگەن. ئەمڕۆ ٢٠ گرووپی جۆراوجۆری ئایینیو ئیتنیکی لە لوبنان دەژین[2]. لە نێو ئەم گرووپانەدا، کورد دووەمین گرووپی مەزنی غەیرە عەرەبن کە تەنها ژمارەی ئەرمەنییەکان لەوان زۆرترە. بەهەرحاڵ هیچ ئامارێکی رەسمی یان هەڵسەنگاندنێکی رێژەیی لەمەڕ حەشیمەتی کورد بوونی نییە. هۆکاری ئەم مەسەلەیە دوو شتە: یەکەم لەبەرئەوە کە لە ساڵی ١٩٣٢ بەملاوە هیچ سەرژمێرییەکی رەسمی لە لوبنان ئەنجام نەدراوەو دووەم لەبەرئەوەی کوردەکان ناسنامەی ئیتنیکی خۆیان لە گرووپەکانی دیکەی لوبنان دەشارنەوە.

بە پێچەوانەی ئەرمەنییەکان کە لە رووی ئیتنیکی و ئایینیەوە وەك گرووپێکی جیاواز بە فەرمی ناسراون، کورد لە لوبنان، موسڵمانی سوننە لە قەڵەم دەدرێن و مافێکی تایبەتی ئیتنیکییان نییە. بە گوێرەی هەڵسەنگاندنەکان. حەشیمەتی کوردەکان پێش ساڵی ١٩٥٨، لە نێوان ٦٠ هەزار هەتا ٩٠ هەزار کەس بووە[3]، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە هەزاران بنەماڵەی کورد لە میانەی شەڕی ناوخۆ لە وڵاتی لوبنان هەڵاتن، بیروڕا ئەوەیە کە ئەمڕۆ حەشیمەتیان لە نێوان ٧٥ هەتا ١٠٠ هەزار کەس دەبێت.

---

٢- ئەم گرووپانە بریتین لە موسڵمانە سوننەکان، شیعە ١٢ ئیمامییەکان، دەروزییەکان، ئیسماعیلییەکان، عەلەوییەکان، مارۆنە مەسیحییەکان، کاتولیکە یۆنانییەکان، کاتولیکە رۆمییەکان، ئۆرتۆدۆکسە یۆنانییەکان، پرۆتستانەکان، یەهودییەکان، ئاشوورییەکان (یان نەستوورییەکان)، کاتولیکە کەلدانییەکان، کۆپتەکان، ئەرمەنییە ئۆرتۆدۆکس یان گریگۆرییەکان، ئەرمەنییە کاتۆلیکەکان، کوردەکان، سیرکاسییەکان، بەهاییەکان و تورکمەنەکان.

٣- ئەحمەد موحەممەد ئەحمەد لە کتێبەکەی خۆی بە ناوی "اكراد لوبنان و تنظيماتهم الاجتماعية والسياسية" (تێزی بڵاونەکراوەی ماستەر، زانکۆی لوبنان، ١٩٨٤ـ١٩٨٥). ئەلمارۆنی (حەوتوونامەیەکی عەرەبی بوو کە لە بێروت بڵاو دەبووەوە)، ژمارەی ٣، ١٩٨٠. فاضل شرورو، الأحزاب والتنظيمات القوية السياسية في لوبنان، ١٩٣٠ـ١٩٨٠ (بيروت، دار المسيرة، ١٩٨٣) سامي زوبيان، الحركة الوطنية اللبنانية: الماضي والحاضر والمستقبل من منظور استراتيجي (بيروت: دار المسيرة ١٩٧٧).

زۆربەی ئەو کوردانەی کە هاتوونە لوبنان، لە ناوچە کەمداهاتەکانی بێروت وەك عەینەلمەراسیە، ئەلبەستا، بورجەل بەراجنە، بورجی حەمودو گەڕەکە خوارەکانی شار وەك فورن ئەلشوباك، رەملە زەریفو زەقەلبلاد نیشتەجێن. ئەوانی دیکە، بە تایبەت ئەوانەی کە لە سوریاوە هاتوون لە شوێنە هەژارەکان وەك ئەلقەرەنتینە ئەلمەسلەخ نیشتەجێن. جگە لە بێروت، زۆربەی کوردەکان لە سیدۆن، تریپولیو بوقاع لە نزیکی سنووری سوریا دادەنیشن. رەوشی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە پلەی یەکەمدا رەنگدانەوەی رێکخراوە عەشیرەتییەکانیانە کە هەرکام بە گوێرەی رەگ و بنەچەی خۆیان پێکهاتوون.

هەروەك هاوخوێنەکانیان لە شوێنەکانی دیکە، گەلێ لە کوردەکانی لوبنان شێوازە جۆراوجۆرەکانی نیشتەجێبوونی زۆرەملییان بە جاران تەجرووبە کردووە. بۆ نموونە لە سەرەتای سالّی ١٩٧٦، زۆربەی ئەو کوردانە کە لە کۆمەڵکوژی مەسیحییە مارۆنییەکان لە ئەلقەرەنتینە ئەلمەسلەخ رزگاریان ببوو، بۆ رۆژئاوای بێروت، خەلدە، ئەلجناح و شوێنەکانی تری "کەرتی بەدبەختی"[4] کە شوێنی نیشتەجێبوونی هاوولاّتییە کەمداهاتەکان بوو، گوێزرانەوە.

هەتا سالّی ١٩٧٨ سەرجەم کوردەکانی دانیشتووی بەشە کەمداهاتەکانی بێروت وەك فورن ئەلشوباك و بورج حەمود لە لایەن مارۆنییەکانەوە ناچار کران برۆن بۆ "کەرتی بەدبەختی"و ئەو شوێنانەی کە پێشتر زۆرتر کوردنشین بوون. پاشان لە دەیەی ١٩٨٠، لوبنان نزیکەی یەك لە چواری حەشیمەتی کوردی خۆی لە دەستدا واتا ئەو کاتە کە هەموو بنەماڵەکان دەستیان بە کۆچکردن بۆ ئەوروپا کرد. ئەم کۆچکردنە چەند هۆکاری هەبوو: ١ـ داگیرکردنی لوبنان لە لایەن ئیسرائیل لە سالّی ١٩٨٢ ٢ـ ئەزیەت و ئازاری کوردەکان لە لایەن هێزە دەوڵەتییەکانی ژێر رکێفی مەسیحییەکان لە ساڵەکانی ١٩٨٢ـ١٩٨٣ ٣ـ ناکۆکییە ناوخۆییەکانی کوردەکان لەگەڵ شیعەکانی لوبنان[5].

لە دەیەی ١٩٩٠ زۆربەی شوێنە کەمداهاتەکان کە لە میانەی شەڕدا بە شێوەی نایاسایی بە دەستی کوردەکان، شیعەکان و فەلەستینییەکان دروستکرابوون، لە لایەن دەوڵەتەوە رووخێندران، کەوابوو هەزاران بنەماڵە ناچار بوون بچن بۆ شوێنەکانی تر. هەروەها ئەو بنەمالاّنە کە لەو خانووانەدا دەژیان کە مەسیحییەکان بەجێیان هێشتبوون و پاشان کوردەکان

٤- کەرتی بەدبەختی، هەژارترین گەڕەکەکانی دەوروبەری بێروت، پایتەختی لوبنانە، بە تایبەت لای رۆژهەلاّت و باشووری بێروت.

٥- بنوارن بۆ هەمان سەرچاوە.





و گرووپەکانی دیکەی لوبنانی، سوریایی و فەلەستینی لە میانەی شەڕدا داگیریان کردبوون، ناچارکران ئەو خانووانە چۆڵ بکەن. تەنها ژمارەیەکی کەم لەم بنەمالاّنە قەرەبوو کرانەوە.

## کێشەی هاوولاّتیبوون

توێژینەوەیەك کە لە سالّی ١٩٩٥ ئەنجام دراوەو ٣٠٨ کەسی لەخۆگرتووە، نیشان دەدات کە رەوشی خراپی کۆمەلاّیەتی، ئابووری و سیاسیی کوردەکان لە لوبنان زۆرتر بە هۆی ئەوەیە کە کوردەکان بە هاوولاّتی لوبنان نازانرێن. هەژاری، بێماڵ و دارایی بوون، بێکاری، رێژەی بەرزی نەخوێندەواری، هەستکردن بە پشێوی و نامۆبوون و هەڵسوکەوتی خراپی گرووپە جۆراوجۆرەکانی لوبنان زۆرتر بە هۆی ئەوەیە کە کوردەکان لە مافی هاوولاّتیبوونی لوبنان بێبەشن[6].

هەر لە کاتی دامەزرانی لوبنان لە سالّی ١٩٢٠ بە دەستی فەڕەنسا، راگرتنی هاوسەنگی نێوان کۆمەڵگا ئایینی و ئیتنیکییەکان، پرسێکی قەیراناوی بوو. ئەو کاتە ژمارەی مەسیحییەکان لە موسڵمانەکان زۆرتر بوو و ئەم زاڵبوونە بە هاتنی هەزاران ئاوارەی ئەرمەنی- کە لە کۆمەڵکوژی تورکیا لە میانەی شەڕی یەکەمی جیهان و ئاکام و لێکەوتەکانی هەڵهاتبوون- زۆرتر بوو.

سالّی ١٩٢٤ فەڕەنسا بە شێوازی تیۆریك، مافی هاوولاّتیبوونی لوبنانی بەخشی بە هەموو هاوولاّتیانی پێشووی عوسمانی کە لە لوبنان دەژیان. کەوابوو ئەم ئاوارە ئەرمەنییانە پتر لە جاران زاڵبوونی مەسیحییەکانیان لە لوبنان پتەوتر کرد. ئاماری سالّی ١٩٣٢ نیشاندەدات کە ئەو کاتە ژمارەی مەسیحییەکان لە موسڵمانەکان زۆرتر بووەو ئەم راستییە کە موسڵمانەکان دەیانەویست رێژەی زاوزێیەکی زۆریان هەبێ، مەسیحییەکانی هاندا تا هەموو کردەوەیەك ئەنجام بدەن تا نەهێڵن هیچ سەرژمێرییەکی نوێ ئەنجام بدرێ و بەم شێوەیە حاشا لە هاوولاّتیبوونی کۆچبەرە موسڵمانەکان بکەن بەو ئامانجە کە زاڵبوونی سیاسیی خۆیان بە سەر ولاّتدا رابگرن.

٦- لوقمان محۆ، قەیرانی تاویانەوەی کۆمەلاّیەتی و سیاسی گرووپە ئیتنیکییەکان لە ناو کۆمەڵگا پلۆرالیستەکاندا: مژاری کورد لە لوبنان، تێزی بلاّونەکراوەی ماستەر (بێروت، زانکۆی ئەمریکایی لە بێروت، ١٩٩٥). ئەو کەسانەی کە لەم توێژینەوەیەدا بەشداریان کرد، ئەندامی کۆمەڵە کوردییە مرۆڤدۆستانەکانی لوبنان بوون. هەموو ئەو کەسانەی کە پرسیاریان لێکرا خەڵکی بێروت و دەوروبەری بوون (٦٠٪ نێرینەو ٣١٪ مێینە بوون، ٣٠٪ هاوولاّتی لوبنان بوون و ٧٠٪ هاوولاّتی نەبوون).

هەتا ساڵی ١٩٤٠ بەدەستهێنانی مافی هاووڵاتیبوونی لوبنان بۆ ئەو کەسانە کە لانیکەم ٥ ساڵی تەواو لە لوبنان ژیابوون یان هاوسەری لوبنانییان هەڵبژاردبوو و یەك ساڵ پاش پێکهێنانی ژیانی هاوسەری لە وڵات ژیابوون، دەلوا. بەهەرحاڵ گەلێك لە کوردەکان ئاگایان لە بایەخی بەدەستهێنانی هاووڵاتیبوون نەبوو. بۆ نموونە سەفەرکردن کە ئێستا پێویستی بە کارتی پێناسی هاووڵاتیبوون هەیە، هەتا ساڵی ١٩٤٦ بێ ئەم کارتەش، دەکرا و خەڵك دەیانتوانی بە بەڵگەیەك کە لە لایەن کاربەدەستانی فەرەنساوە دەردەچوو، سەفەر بکەن. بە وتەی کوردێکی لوبنان پاش ئەوەی کە کوردەکان ئیدی نەیانتوانی بەم بەڵگانە سەفەر بکەن، داواکاری هاووڵاتیبوونیان پێشکەشکرد، بە تایبەت، چونکە گەلێکیان هاتووچۆی سوریاو تورکیایان دەکرد.

زۆرتر جیرەبەندی ئەرزاق لە ساڵی ١٩٤١ (پێش دەستپێکردنی شەڕ) بوو کە بووە هۆی ئەوەی کە کوردەکان پەی بە بایەخی هاووڵاتیبوون ببەن. لە میانەی شەڕی دووەمی جیهاندا، زۆربەی کوردەکان لە کارتی جیرەبەندی ئەرزاق بێبەش بوون، چونکە هاووڵاتی لوبنان نەبوون. هەرچەند کە ئەم رووداوە گەلێك لە کوردەکانی ناچار کرد داواکاری هاووڵاتیبوون پێشکەش بکەن، بەڵام کات بۆ بەدەستهێنانی ئەم مافە زۆر درەنگ ببوو. یاسایەك لە ساڵی ١٩٤٠ پەسەندکرا کە بەدەستهێنانی مافی هاووڵاتیبوون بە شێوازی تیۆریك هەڵوەشاندەوە، بەتایبەت بۆ کوردەکان و دەیەك دواتر بۆ ئاوارە موسڵمانە فەلەستینییەکان، بەڵام مافی هاووڵاتیبوون درا بە مەسیحییە فەلەستینییەکان[7].

بە دەرککردن بەوە کە کوردەکان بە ئەنقەست و مەبەست لە بەدەستهێنانی مافی هاووڵاتیبوون بێبەشکراون، گەلێك لە کوردەکان روویان لە میتۆدگەلێکی دیکە کرد بوو ئەوەی مافی هاووڵاتیبوون بەدەست بهێنن. بۆ نموونە لە یەکی شوباتی ساڵی ١٩٥٦، ١٧ بنەماڵەی کورد لە دادگایەك لە شاری مەسیحینشینی جونیە، رەزامەندی خۆیان لەسەر ئەوە دەربڕی کە لە بەرامبەر بەدەستهێنانی مافی هاووڵاتیبوونی لوبنان، ئایینی خۆیان لە موسڵمانی سوننە بگۆڕن بۆ مەسیحی مارۆنی[8]. ئەم بڕیارە کۆمەڵێك دەمبۆڵەی ناوخۆیی لێکەوتەوە کە بووە

٧ـ سەرەڕای ئەو کەندوکۆسپە جۆراوجۆرانە کە مارۆنێە مەسیحییەکان دروستیانکرد، هەندێك لە بنەماڵە کوردەکان توانیان لە رێگای واسیتەوە بن بە هاووڵاتی. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٤٧ کاتێك کە سامی الصلح سەرۆك وەزیران بوو، بە گوێرەی فەرمانی ١٩٢٥ لە بەرامبەر دەنگدان لە هەڵبژاردنەکاندا، مافی هاووڵاتیبوون بەخشرا بە ژمارەیەك لە بنەماڵە کوردەکان.

٨ـ رۆژنامەی النهار، بێروت، ٩ی ئاداری ١٩٥٦.



هۆی ئەوە کە کوردەکان دیسان وەك موسڵمانی سوننە خۆیان ناونووس بکەنەوەو مافی هاووڵاتیبوون بەدەستبهێنن.

ساڵێك دواتر، گرووپێك لە مەسیحییە کەلدانییەکان مافی هاووڵاتیبوونیان بەدەستهێنا. ئەم رووداوە قەیرانێکی نەتەوەیی دیکەی خولقاند. بە ئارمانجی چارەسەرکردنی قەیرانەکە، مەسیحییە مارۆنییەکان رەزامەندی خۆیان لەسەر ئەوە دەربڕی کە مافی هاووڵاتیبوون ببەخشرێ بە هەمان ژمارە لە کوردەکان. پاش ئەم رووداوە، لە راستیدا سەرەڕای داواکاری جۆراوجۆر بۆ چارەسەرکردنی کێشەی هاووڵاتیبوون، مافی هاووڵاتیبوون بە هیچ کوردێك نەبەخشرا.

لە لێدوانێك بۆ ئەندامانی پەرلمانی لوبنان لە ١ی ئابی ١٩٦٠، رێبەرێکی موسڵمانی سوننە بە ناوی سائب سالم وتی: "خەڵکانێك هەن کە وەك ئێوە لەم وڵاتەدا لە دایکبوونە و وەك منو ئێوە کۆمەڵێك مافی رەوایان هەیە، بەڵام لە مافی هاووڵاتیانی ئاسایی بێبەشن. هەندێك لەوانە ناتوانن بەشێوازی یاسایی ژیانی هاوسەری پێکبهێنن، منداڵیان بێت و تەنانەت بمرن و ئەگەر نەخۆش بن لە مافی خزمەتگوزاری لە نەخۆشخانەکان و بنکەکانی تەندروستی بێبەشن". ماوەیەکی کورت پاش ئەوەی کە سالم بوو بە سەرۆك وەزیر، فەرمانێکی لە بارەی بەخشینی هاووڵاتیبوون دەرکرد. زۆربەی کوردەکان داواکاریان پێشکەش کرد بەڵام بەهەرحاڵ ئەم داواکاریانە کوتوپڕ پشتگوێ خران. رۆژنامەی زمانحاڵی مەسیحییەکان بە ناوی "النهار" راپۆرتیدا کە رەوتی بەخشینی هاووڵاتیبوون هەڵوەشاوەتەوە، چونکە هەندێك لە کاربەدەستانی مەسیحی بە هۆی ترسان لە ئاکام و لێکەوتە سیاسییە درێژخایەنەکانی ئەم کردەوەیە، لە بەرامبەریدا راوەستاون. ئەم راپۆرتە ئەوەی زیاد کرد کە ئەم کاربەدەستانە لەوە ترساون کە ئەگەر مافی هاووڵاتیبوون ببەخشرێ بە خەڵك، رێژەی باڵای زاوزێ لە نێوان کوردە موسڵمانەکان پاش ماوەیەك هاوسەنگی نێوان گرووپە ئایینی و ئیتنیکییەکان تێکدەدات[9].

لە نێوان ساڵی ١٩٦١و ١٩٦٢ کێشەی هاووڵاتیبوون تووشی تەنگ و چەڵەمەیەکی دیکە بوو، واتا کاتێك کە کەمال جونبەلات، وەزیری ناوخۆی دەوڵەتی رەشید کەرامی بە شوێن ئەوەدا گەڕا کە چارەسەرییەك بۆ قەیرانی هاووڵاتیبوون- کە وەك کێشەیەکی گشتیی دانپێدانراوی لوبنان ناسراو بوو- بدۆزێتەوە. جونبەلات مافی هاووڵاتیبوونی بە کوردەکان بەخشی کە لە رێگای ئەوەدا، منداڵەکان دەیانتوانی بە گوێرەی فەرمانە یاساییەکان ببن بە

٩. رۆژنامەی النهار، بێروت،١٤ی ئەیلوولی ١٩٦١.

هاووڵاتی لوبنان. به پێی ئەم مادده یاساییە، هەموو کەسێك کە لە دایك و باوکی هاووڵاتی لوبنان لە دایك دەبوو، لوبنانی لە قەڵەم دەدرا. لە ئاکامدا هەندێك لە منداڵە کوردەکان هاووڵاتیبوونیان بەدەستهێنا، بەڵام بە هۆی نەیارێتی مەسیحییەکان، رەوتی بەخشینی هاووڵاتیبوون پاش ماوەیەکی کورت راوەستاندرا و کارتی پێناسی قیدالدراسە (لە ژێر چاودێری) جێگای گرتەوە.

سەرەڕای ئەم راستییە کە هاووڵاتیبوونی کوردەکان و کەمینە بێ دەوڵەتەکانی دیکە بۆ ماوەی زۆرتر لە ١٢ ساڵ دەسەڵاتداری ئەو دەوڵەتانە کە لە نێوان ١٩٧٠و سەرەتای ١٩٩٠ هاتنە سەر دەسەڵات، لە پەرلماندا پشتگوێ خرابوو، هەموو هەوڵەکان بە هۆی نەیارێتی مەسیحییە مارۆنییەکان، بێ ئەنجام مایەوە[١٠]. لە ئاکامدا زۆربەی کوردەکان بۆ چەند دەیە وەك کەمینەیەکی بێ رەوش ژیان و رەوشێکی نامۆیان بەسەردا سەپا کە یەکگرتنی کوردەکانی لەگەڵ کۆمەڵگای لوبنان دواخست. هەتا نیوەی دەیەی ١٩٩٠، کەمتر لە ٢٠٪ کوردەکانی لوبنان، هاووڵاتیبوونی لوبنانیان هەبوو و نزیکەی ١٠٪ هیچ چەشنە ناسنامەیەکیان نەبوو و وەك هاووڵاتی سوریا یان فەلەستین لە قەڵەم دەدران. ئەوانی دیکە، واتە ٧٠٪ی کوردەکان، خاوەن کارتی "قەیدلدراسە" بوون.

کارتی پێناسی "قیدالدراسە" بۆ ماوەی یەك یان سێ ساڵ دەردەچوو و پاش ئەوە تازە دەکرایەوە. ئەم کارتە بۆ هەموو ئەندامانی بنەماڵە متمانەپێکراو بوو. بۆ بەدەستهێنانی

١٠. هەموو کابینەیەك لەسەر لایەنی مرۆڤدۆستانەی کێشەکان و مافی مرۆڤی ئەو خەڵکە کە بە ماوەی چەند دەیە لە وڵات ژیابوون، چڕ دەبووەوە. بۆ نموونە پاش ئەوەی کە کابینەی سەرۆك وەزیرانی سوننە، رشید الصلح لە نۆڤەمبەری ١٩٤٧ پێکهات، رشید الصلح پێی لەسەر ئەوە گرتەوە کە بەیاننامەی رەسمی دەوڵەت، لەوانە ماددەیەك کە دەربارەی چارەسەرکردنی مەسەلەی هاووڵاتیبوونی کەمینەکان بوو، دەبێ جێبەجی بکرێت. لە دوای ئەوە مشتومڕێکی زۆر لە نێوان الصلح لە لایەك و حیزبی فالانژی مەسیحی (الکتائب) و حیزبی ئازادی نەتەوەیی (الحزب الوطنیة الأحرار) لە لایەکی دیکەوە کرا. پاشان جۆرج سادح، وەزیری سەر بە حیزبی فالانژیست لە میانەی هەڵێنجاندنەکانی خۆی لە دژی ئەم پێشنیارە، سەرنجی بەرەو لای ئاکام و لێکەوتە سیاسییەکانی بەخشینی هاووڵاتیبوون بە کوردان راکێشاو وتی: "ئێمە (فالانژەکان) لە رابردوودا کاری زۆرمان کردووە تا هاووڵاتیبوونی لوبنان ببەخشین بە ئەرمەنییەکان و ئەم کارە جێبەجێکرا، بەڵام ئاکامەکەی چ بوو؟ ئەوان لەو ناوچانەی تێیدا دەژیان، بوون بە هۆکاری هاوسەنگی دەنگدان لە هەڵبژاردنەکان. کەواتە ئەگەر سەرۆك وەزیران دەیەوێت چارەنووسی هەڵبژاردنی خۆی بداتە دەستی کوردان، ئێمە لەگەڵ ئەودایین".



کارت، پەنجەمۆرکردن، داخوازینامەی رەسمی و دانی بڕێك پارە پێویست بوو. پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە زۆربەی کوردە ناهاووڵاتییەکان ئەوەندە پارەیان نەبوو، کە بتوانن کارتەکانیان تازە بکەنەوە. ئەوان نەتەنیا دەبوایە پارەی کارتەکەیان بدایە، بەڵکو دەبوایە پارەی دەڵاڵێشیان بدایە. پارەی کارتەکان لە ساڵی ١٩٩٤، بۆ بنەماڵەکانی چینی خواری کۆمەڵگا کە خاوەن ٦ منداڵ بوون، ١٥٪ ی داهاتی ساڵانەی بنەماڵەی لەخۆدەگرت. لەمە زیاتر ئەو کوردانەی کە دانیشتووی وڵاتانی ئەوروپایی و شوێنەکانی دیکە بوون، تووشی گێرەوکێشەی زۆرتر دەبوون، چونکە کاربەدەستانی لوبنانی لە تازەکردنەوەی کارتەکانیان سەرپێچیان دەکرد و بە هۆی ناچار بوون بۆ سەفەرکردن بۆ لوبنان لەگەڵ بنەماڵەکانیاندا تووشی زەرەری ماددی دەبوون. هەروەها داخوازی گەلێ لە کوردەکان رەت دەبووەوە.

ئەم گیروگرفتانەی کوردەکان هەتا ٢١ی حوزەیرانی ١٩٩٤ کۆتایی پێنەهات، واتا کاتێك کە سەرەڕای نەیارێتی توندی گەلێك لە مەسیحییەکان، حکوومەتی رەفیق الحریری فەرمانی هاووڵاتیبوونی دەرکرد کە بە گوێرەی ئەوە، ئەو کەسانە کە مافی هاووڵاتیبوونیان نەبوو، دەیانتوانی داواکاری خۆیان پێشکەش بکەن. بە داخەوە، گەلێك لە کوردەکان لە دەرەوەی لوبنان بوون و نەیاندەتوانی پارەی داواکاری بدەن و نەیاندەتوانی بۆ لوبنان سەفەر بکەن و گەلێك لە کوردەکانیش باوەڕییان بەم داواکارییە نەبوو. لە ئاکامدا، تەنها ١٨ هەزار کورد لەم فەرمانە سوودیان وەرگرت. ئەم پرۆسەیە نزیکەی ٢ ساڵی دەخایاند. پاش ساڵی ١٩٩٦، هەندێك هەوڵ بۆ دەرکردنی فەرمانێکی دیکە بەتایبەت بۆ ئەو کەسانە کە هەلی یەکەمیان لە دەست دابوو، درا. لە ماوەی ٥ ساڵی رابردوودا (١٩٩٦-٢٠٠٠) دەرکردنی فەرمانی دووەم زۆرتر بە هۆی کەمبوونی داواکارە مەسیحییەکان، گەلێ جار هەڵواسراوەتەوە.

ساڵی ١٩٩٦ مافی هاووڵاتیبوون بەخشرا بە کوردەکانی لوبنان. کەوابوو ئەم گۆڕانکارییە بە راشکاوی ئاستی هەڵاواردن بە نیسبەت کوردەکان کەم دەکاتەوەو و هەل و شانسی ئەوان بۆ بەرەوپێشچوون و راکێشان بەرەو کۆمەڵگایەکی پلورالیست وەك لوبنان زیاد دەکات.

## رەوشی کۆمەڵایەتی - ئابووری کوردەکان

زێدەباری کەند و کۆسپە یاساییەکان کە کورد بە ماوەی زۆرتر لە نیو سەدە لە لوبنان لەگەڵیدا ڕووبەڕووبوونە، کورد لەگەڵ هەڵاواردنی کۆمەڵایەتیش بەرەوڕوو بوونە. بۆ باشترین وەسفکاری لەم جۆرە هەڵاواردنە، ئەوەندە بەسە کە دیمانەیەك لەو چینە کۆمەڵایەتییە (چینی

خواروو) کە زۆرینەی کوردەکان سەر بەو چینەن، بخەینەڕوو[11]. هەروەها کورتەیەك لە دەرەنجامەکانی توێژینەوەی خودی نووسەر لە ساڵی ١٩٩٥یش نیشان دەدرێت.

بە گشتیی، چینی خواروو خەڵکی کرێکار لە خۆ دەگرێ، واتا خەڵکێك کە نە موچەخۆرن و نە سەرمایەیان هەیە و رانەهێنراون یان بەکەمی راهێنراون. ئەم کەسانە بریتین لە شۆفیری تاکسی، سەوزە فرۆش، سەرتاش، خاوەن بەرهەمی کشتوکاڵی هاوبەش، کرێکاری رۆژمزی (کرێی رۆژانە) سادە، خزمەتکار، فەراش و کاسبێك کە وەك شاگرد کار دەکات. گەلێك لەمانە چینی کرێکاری ورد پێکدەهێنن کە کاری پەست وەك بیناسازی، جادەسازی و پیشەسازی بچووك دەکەن و لە دابینکردنی کۆمەڵایەتی و تەندروستی و سەندیکا کرێکارییەکان بێبەشن[12]. کەسانی سەر بە چینی خواروو، زۆرتر بەشێوازی کاتی کار دەکەن، بە ئاسانی لە کار دەردەکرێن، کرێکەیان کەمەو ئەوەندە سامان و دارایی و پاشەکەوتیان نییە کە بتوانن لە کاتی بێکاریدا کەڵکی لێوەربگرن. لەمە زیاتر، گەلێك لە ئەندامانی چینی خواروو بەتایبەت ئەوانەی کە حاشا لە مافی هاوولاتیبوونیان کراوە، بە توندی لەگەڵ هەلاواردن و کردەوە نادادپەروەرانەکانی دیکەدا بەرەوڕوونە و وەك نامۆ سەیر دەکرێن.

بەتایبەت کورد پتر لە زۆربەی ئەندامانی چینی خواری دیکە (وەك شیعەکان، سورياییەکان و عەرەبە نەهاوولاتیەکان) لەگەڵ گیروگرفتدا بەرەوڕوونە. راستییەکەی ئەوەیە کە کورد بە هۆی ئەوە کە عەرەب نین، لە مافی دامەرزان لە ئیدارەکان، پشتیوانیی مرۆڤایەتیو هەڵسوکەوتی یەکسان لە ئیدارە دەوڵەتییەکاندا بێبەشن، تەنانەت ئەگەر هاوولاتی لوبنانیش بن. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە پەروەردە لە لوبنان، پێگەی گەلێك لە گرووپە نەریتییە پایەبەرزەکان پتەوتر دەکات و کەناڵێکی گرینگی دیکە بۆ گرووپەکانی دیکە بۆ پێشکەوتن دابین دەکات، خەڵکانی سەر بە چینی خواروو بۆ بەخێوکردنی بنەماڵەکەیان لە ژێر گوشاردان و پارە و کاتی ئەوەیان نییە کە منداڵەکانیان بنێرن بۆ قوتابخانە، لە ئەنجامدا دەبن بە نەخوێندەوارترین چین لە لوبنان بە ئاسانی لە لایەن کەسانی دیکەوە دەچەوسێنرێنەوە. گۆڕانکاری لە چینی خوار بۆ

---

١١ـ ئەمرۆ کۆمەڵگای لوبنان هەروەك سەردەمی شەڕی ناوخۆ بە ٥ چینی پێناسەکراو دابەش دەکرێت: بژاردەی نەتەوەیی، چینی باڵا، چینی ناوەڕاست، چینی خوار و چینی خواری خوار.

١٢ـ تئۆدۆر هانف، لە کتێبی "*بەیەکەوە ژیان لە لوبنان لە سەردەمی شەڕ، لەناوچوونی سەرهەڵدانی نەتەوەیەك*"، وەرگێڕان لە ئەڵمانییەوە لە لایەن ریچارد، لەندەن، سەنتەری توێژینەوەکانی لوبنان، بە هاوکاری تەوریس و کۆمپانیای بڵاوکەرەکان، ١٩٩٣، لاپەڕەی ١٩٩.



چینی ژوور نەتەنها پێویستی بە دارایی هەیە، بەڵکو بزاڤی کۆمەڵایەتی و دەروونیشی پێویستە کە بە واتای ئەوەیە کە بنەماڵە ناچارە خۆی لە بنەماڵەیەکی مەزنیی وردە کولتووری (کە تایبەتمەندی کۆمەڵگای چینە خوارەکانە) بگۆڕێ بۆ شێوازگەلێکی نوێ و خۆی لە بەستراوبوونی کۆمەڵایەتی و ئابووری- کە زۆربەی جاران لە بنەماڵە ناوکییەکاندا بەرهەست دەکرێت-رزگار بکا و سەربەخۆیی کۆمەڵایەتی و ئابووری بە دەست بهێنێ. بەهەرحاڵ هەتا ئەو جێگایەی کە پێوەندی بە کوردەوە هەیە، ئەم رەوتی گۆڕانکارییە هێشتا لە قۆناخی سەرەتایی دایە.

لە توێژینەوەیەکدا کە نووسەر لە ساڵی ١٩٩٥ ئەنجامی داوە، دەردەکەوێت کە ٨٥٪ی کوردەکان لە ناو یان لە ژێر هێڵی هەژاریدا دەژین و رەوشی پەروەردەیان لەرادەبەدەر خراپە. بە گشتی نزیکەی ٦٠٪ی کوردەکان و٩٧ ٪ ی دایكو باوکەکان نەخوێندەوارن. زۆربەی کوردەکان خاوەن بنەماڵەی مەزنن و ٤٤٪ی بنەماڵەکان خاوەن ٦ منداڵن. کورد هەروەها بە دەست هەژاری توندا دەناڵێنن و زۆربەیان کرێنشینن یان لەو خانووانەدا دەژین کە مەسیحییەکان لە میانەی شەڕی ناوخۆدا بەجێیان هێشتوون (ئەڵبەتە ئەم خانووانە ئێستا دراوەتەوە بە خاوەنە پێشووەکانیان). زۆرینەی زۆری ئەو کەسانەی کە لە میانەی توێژینەوەکەدا پرسیاریان لێکرا، دەیانگوت کە خەڵکی لوبنان وەك بێگانە یا هاوولاتی پلە دوو سەیری کوردەکان دەکەن. پتر لە یەك لە سێی ئەوانەی کە پرسیاریان لێکرا، بیروبۆچوونیان ئەوە بوو کە دەوڵەتی لوبنان لە بەراورد لەگەڵ کەمینەکانی دیکە، لەگەل کوردەکاندا خراپ هەڵسوکەوت دەکات و ٦٠٪ی وەلامدەران، دەیانگوت کە پێکهاتەی سیاسی لوبنان، رێگا بە کوردە لێهاتووەکان نادات لە ناو حکوومەتدا بگەن بە پلەی بەرز.

بەهەرحاڵ ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان بوونەتە هاوولاتی لوبنان. ماوەتەوە ببینین کە کورد تا چ رادەیەك و لە چ ماوەیەکدا دەتوانن رەوشی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری هەنووکەیی خۆیان بگۆڕن و جێگای خۆیان لە کۆمەڵگای لوبناندا بکەنەوە.

## رەوشی سیاسیی کوردەکان

هەروەها کە ئاماژەی پێکرا، زۆربەی کوردەکان هەتا نیوەی دەیەی ١٩٩٠، هاوولاتی لوبنان نەبوون. لە ئاکامدا ناچاربوون کە ١ـ ببن بە بەشێك لە سیستەمی کلینتالیست و بە خەرجی خۆیان خزمەتی ئەم سیستەمە بکەن. ٢ـ بچنە ریزی ئەو هێزانە کە نەیاری ئەو

کەسانە بوون کە کوردیان لە مافی خۆیان بێبەش کردبوو و هەڕەشەیان لە بوونی کورد دەکرد. بە لەبەرچاو گرتنی ئەم مەسەلە گرینگە، دەبێ بزانین چۆن ئەم سیستەمە کلینتالیستە لە لوبنان بە تایبەت کاری کردۆتە سەر کۆمەڵگای کورد (و ئێستاش کار دەکات). هەروەها وەسفکردنی ئەوە گرینگە کە کورد چۆن بەرەنگاری نەیارەکانیان دەبنەوە و ئەنجامی خەباتەکەیان چی بووە؟.

## کورد لە سیستەمی کلینتالیستی لوبناندا

لە سەرانسەری مێژووی خۆیدا، حەشیمەتی لوبنان بە بنەماڵە رکابەرەکان و گرووپە ئایینییەکان ـ کە لە رووی سیاسییەوە لەسەر بنەمای پێوەندیی ئاغا و رەشۆکی بە رێکخستن کراون ـ دابەشکراوە. پێوەندیگەلێکی وەها، گۆڕینی نایەکسانی شتومەك و خزمەتگوزاری لە نێوان مەزنەکان (زەعیمەکان یان رێبەرەکان) و رەشۆکەکان (پەیڕەوان) لەخۆدەگرێ‌و کاریگەرییەکی قووڵی کردۆتە سەر کولتووری کۆمەڵایەتی و سیاسیی لوبنان. پەیڕەوان لە بەرامبەر پشتیوانیکردن لە زەعیمێك (زۆرتر لە رێگای دەنگدان و شێوە چالاکترەکانی بەشداری سیاسی) چاوەڕوانیی ئەوەیان هەیە، کە یان لە رێگای دامەزران لە دەزگای ئاسایش و ئیدارە دەوڵەتییەکان یان هاوکاریکردن لەلایەن کارمەندانی دەوڵەت یا کەسایەتییە مەزنەکانی دیکە، یارمەتی بدرێن.

هەتا دەیەی ١٩٨٠، سەرچاوەی پشتیوانی زەعیمەکان٣ گرووپ بوون: یەکەمین و گرینگترینیان ئەربابە دەوڵەمەندەکان بوون، کە سەر بە بنەماڵە مەزنەکان بوون و ئەوەندە پارەیان هەبوو کە پشتیوانی لە زەعیمەکان بکەن. دووەم، دەنگدەرە هەژار و کەمتر گرینگەکان (لە رووی سیاسییەوە) بوون کە زۆرترین پێگەی پشتیوانی زەعیمەکانیان پێکدەهێنا. ئەم خەڵکە بە گشتیی داواکاریگەلێکی سادەیان هەبوو، کە بە یارمەتی زەعیمەکان جێبەجێ دەکران. گرووپی سێیەم، ئاوێتەیەك لە دوو جۆرە خەڵك بوون: ئەوانە کە بە کاندیداکانی دیکە دەنگیان دەدا و ئاوارە کورد و فەلەستینییە بێبەشەکان لە دەنگدان کە هاووڵاتی لوبنان نەبوون، واتا هیچ شتێکیان نەبوو کە بە کەڵکی زەعیم بخوات و لە ئەنجامدا، لە دەرەوەی سیستەمی کلینتالیست بوون.

بە زیادبوونی ژمارەی ئەو کوردانەی کە مافی هاووڵاتیبوونیان بەدەستهێنا، کاندیداکانی هەڵبژاردن دەستیان کرد بە پێوەندیگرتن لەگەڵ کوردەکان بۆ ئەوەی کە دەنگیان پێبدەن. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم کاروکردەوانە، هیچ یارمەتییەکی بە کۆمەڵگای کورد نەدا. هۆیەکەی ئەوە بوو،



کە کورد یەکگرتوو نەبوون و پشتیوانیان لە پتر لە یەك کەسایەتی یان بلۆکی سیاسی دەکرد. لە ئاکامدا کورد هێزی چڕبووی خۆی - کە دەیتوانی بە شێوازێکی کارامە بۆ گوشارخستنە سەر زەعیمە مەحەلییەکان بۆ سەندنی بەرژەوەندی لەوان، بەکار ببردرێت- لە دەستدا.

ئەمڕۆ رەوشەکە لە بەراورد لەگەڵ سەردەمی نێوان ناوەڕاستی دەیەی ١٩٤٠و ناوەڕاستی دەیەی ١٩٧٠ زۆر نەگۆڕاوە. هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکانی ساڵی ١٩٩٢و ١٩٩٦ نیشانی دا کە کوردەکان لە چاو جارانی پێشوو، باشتر بەرێکخستن کراون، بەڵام هێشتا ناتوانن وەك گرووپێکی یەکگرتوو کاربکەن. کورد هێشتا لە نێوان خۆیاندا دابەشبوونە و بێ هیچ بەرامبەرێك یان بە بەرامبەرێکی کەم لە هێزی دەنگدانیان کەڵك وەردەگیردرێت، تەنانەت هەوڵە جۆراوجۆرەکانیان بۆ سەرکەوتن لە هەڵبژاردنەکانی پەرلماندا هەرەسی هێناوە. بۆ نموونە تەنها کاندیدای کورد کە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی١٩٩٢دا بەشداری کردبوو، تەنها ٥ هەزار دەنگی بە دەستهێنا، لە حاڵێکدا کە بۆ ئەندامبوون لە پارلمان ١٠ هەزار دەنگ پێویست بوو. لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٦، ئاکامەکە باشتر نەبوو و دەنگی کوردەکان پتر لە جاران بڵاو بوو[١٣].

هێزی هەڵبژاردنی کوردەکان بەردەوام لە حاڵی گەشەسەندن دایە، بەڵام بەهەرحاڵ بە هۆی نەبوونی سەرچاوە و رێبەرایەتی، ئەم هێزە لە لایەن کەسانی دیکەوە کەڵکی لێوەردەگیردرێت.

## کورد لە میانەی شەڕی ناوخۆ (١٩٧٥ـ١٩٩١) و پاش ئەوە

بە گشتی کوردەکان هیچ بیانوویەکیان بۆ بەشداری لە شەڕی ناوخۆدا نەبوو، بەڵام لە دوای پاکتاوکردنی کوردەکان لە رۆژهەڵاتی بێروت و بە تایبەت لە ناوچەی ئەلقەرەنتینا- ئەلمەسلەخ لە کانوونی دووەمی ١٩٧٦ بە دەستی هێزەکانی فالانژی مەسیحی مارۆنی، بارودۆخەکە گۆڕا. دانیشتووانی ناوچەی ئەلمەسلەخ کە زۆرتر کورد و فەلەستینی بوون، ئەگەر نێرینە ببان دەکەوتنە بەر دەستڕێژی گوللە و ئەگەر مێینە ببان، دەکەوتنە بەر دەستدرێژی و دەردەکران و شوێنی نیشتەجێبوونیان خاپوور دەکرا. تەنها ژمارەیەکی کەم توانیان خۆیان رزگار بکەن. جانسۆن بە وەسفکردنی کۆمەڵکوژییەکانی ئەلقەرەنتینا ئەلمەسلەخ دەنووسێت:

---

١٣ـ یەکەم جار کە کوردێك خۆی بۆ هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی لوبنان کاندیدا کرد، ساڵی ١٩٦٨ بوو، کە جەمیل محۆ (بنوارن بۆ بەشی حیزبە سیاسییەکان) خۆی وەك نوێنەری ناحیەی ٢ی لوبنان کاندیدا کرد، بەڵام سەرنەکەوت.

"راپۆرت، فیلم و وێنەکانی ئەم کۆمەڵکوژییە ترسناك بوون. خانووەکان هەرچەند کە بایەخی کەمیان هەبوو، تالآنکرابوون. تەرمی پیاوان و ژنان لە ناو شەقامەکاندا کەوتبووە سەریەك و یەکێك لە دانیشتووانی گەڕەکە پیسەکانی شار کچەکانی خۆی دایە بەر دەستڕێژی گوللە تا نەبن بە قوربانی دەستدرێژی. لە کۆتاییدا خانووەکانی گەڕەکی ئەلقەرنتینا بە بولدوزەر رووخان و مردووەکان بەکۆمەڵ کرانە ژێر خاکەوە".

لە دوای ئەم کۆمەڵکوژییە و کردەوە بێ بەزەییانەکانی دیکە کە پێش و پاش کۆمەڵکوژی ئەنجامدرا، هەندێك لە کوردەکان بڕیاریاندا لە دژی بەرەی لوبنانی ژێر رکێفی مەسیحییەکان (الجبهەاللبنانیە) چەك هەڵبگرن. کوردەکان یان وەك ئەندامی حیزبە سیاسییەکانی خۆیان چەکیان هەڵگرت یان چوونە ریزی حیزبی شیوعیی لوبنان، بزووتنەوەی سوننەی ناسرییە سەربەخۆکان (المرابتون) و پاشان حیزبی سۆسیالیستی پێشکەوتنخوازی دەروزییەکان (الحزب التقدمیە الاشتراکی). هەروەها گەلێ لە کوردەکان چوونە نێو ریزی رێکخراوە فەلەستینییەکان بە تایبەت "بەرەی ئازادی خەڵکی فەلەستین" (PFIP) و "بەرەی دیموکراتیك بۆ ئازادی فەلەستین"(DFIP). کوردەکان ئامانجی هاوبەشیان لەگەڵ ئەم حیزبە پێشکەوتنخواز و فەلەستینیانە هەبوو، بەتایبەت لەبەرئەوە کەوا بیریان دەکردەوە کە سەرکەوتنی ئەم هێزانە، ئەوان لە نەهامەتییە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان کە مارۆنییەکان بە سەریاندا سەپاندبوویان، رزگا دەکا.

لەساڵەکانی سەرەتایی شەڕدا، ئەو کوردانەی کە لە شەڕدا بەشداریان کرد زۆرتر لەگەڵ میلیشیا مەسیحییەکان لە رۆژهەڵاتی بێروت شەڕیان دەکرد، کەوابوو لە دوای داگیرکردنی لوبنان لە لایەن ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٨٢، ئەو کوردانە کە لە خلدە و ناوچەکانی دەوروبەری رۆژئاوای بێروت دەژیان، هەم بە دەستی ئیسرائیلییەکان و هەم بە دەستی هاوپەیمانە مەسیحییە لوبنانییەکانیان دەرکران و دەستگیرکران. زۆربەی ئەو کوردانەی کە توانیبوویان پێش لە گەیشتنی ئیسرائیلییەکان، هەڵبێن، چوون بۆ بێروت و ناوچەی بیقاع. پاشان لە دوای ئەوە کە ئیسرائیل پەیمانی خۆی خستە ژێر پێ و لە ئەیلوولی ١٩٨٢ هاتە نێو رۆژئاوای بێروت و دەوڵەتێکی فالآنژی لایەنگری ئیسرائیل و ئامریکا بە سەرۆکایەتی "امین جومەیل"ی دامەزراند، هێزە دەوڵەتییە مەسیحییەکان دەستیان کرد بەقەڵاچۆکردنی خەڵکە سەربارەکانی لوبنان کە زۆرتر کورد و فەلەستینی بوون. ئەمانە کۆکرانەوەو ئەوانەی کە بەڵگەیان نەبوو گیران یان دەرکران، لە ئاکامدا دەیان هەزار کورد و کەسانی دیکە ناچار



بوون بۆ ئەورووپا کۆچ بکەن. نزیکەی یەك ساڵ دواتر هێزە میلیشیاکانی دەروزی، شیعە و سوننە کە لە لایەن سوریاوە پشیتوانیان لێدەکرا، هێزەکانی ئیسرائیلیان لە ناوچە زۆرتر موسڵماننشینەکان کردە دەرەوە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣، بزووتنەوەی "ئەمەل" واتا هێزی سەرەکی میلیشیا شیعەکان دەستی کرد بە پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆی بەو مەبەستە کە بە نوێنەرایەتی سوریا لە باشوور و رۆژئاوای بێروت ببێ بە باڵادەست. هەرچەند کە مەبەستی سەرەکیی "ئەمەل" سەرکوتکردنی حەشیمەتی کەمپەکانی فەلەستینییەکان لەزنجیرەیەك گەمارۆدانی ترسناکدا بوو، بەڵام بە شوێن میلیشیا سوننەکانیشدا بوو و بە خێرایی لە ناوی بردن. دەروزی و کوردەکان کە لە زاڵبوونی شیعەکان بەسەر رۆژئاوای بێروت (کە لە ژێر دەسەڵاتی سوننەکاندا بوو) بێزاربوون، چوونە ریزی ئەو هێزانە کە لەگەڵ پێشڕەوی "ئەمەل" بەرەو ناوچە گرینگەکانی رۆژئاوای بێروت بەرەنگاریان دەکرد. ئەم بەرەنگاربوونەوەی ئەوان بە شێوازێکی سەرسووڕهێنەر سەرکەوتوو بوو. میلیشیا کوردەکان لە ناوچەکانی خۆیاندا زۆر بەهێزبوون و لە هەر شەڕێکدا کە بەشداریان دەکرد، شیعەکانیان گەمارۆ دەدا.

شەڕ هەتا ساڵی ١٩٨٧ درێژەی هەبوو واتا هەتا کاتێك کە دەوڵەتی سوریا و گرووپە شەڕکەرەکانی دیکە لەسەر ئەوە رێککەوتن کە سەرجەم میلیشیاکان لە بێروت پاشەکشە بکەن و ئەرکی دەستەبەرکردنی نەزم و ئاسایش رادەستی هیزەکانی سوریا بکەنەوە. بە داوای کاربەدەستانی سوریا، حیزبی سۆسیالیستی پێشکەوتنخوازی دەروزی (psp) بۆ بنکەکانی خۆی لە چیاکانی شوف پاشەکشەیان کرد. بەهەرحاڵ هێزە شیعەکان لە بێروت مانەوە، ئەوان هێشتا پێویستییان بەوە بوو کە کۆنترۆڵی خۆیان بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری کەمپەکانی فەلەستینییەکان رابگرن. ئەم کردەوەیە کوردەکانی لەگەڵ چاودێری سوریا و تۆڵەسەندنەوەی شیعەکان بەرەوڕوو کردەوە. سەدان کورد بەتایبەت ئەوانەی کە ئەندامی PSP و رێکخراوە فەلەستینییەکان و رێکخراوە کوردە دژە سورياییەکان بوون بە دەستی هێزەکانی سوریاو شیعەکان کوژران یان زیندانی کران. هەزاران کەسی دیکە هەڵاتن بۆ ئەورووپا یان چوون بۆ ناوچەی بیقاع و چیاکانی دەروزی.

ئاکام و لێکەوتەکانی بەشداریکردنی کوردەکان لە شەڕدا نەتەنیا بووە هۆی ئەوە کە ئەوان ژیانی خۆیان لە دەست بدەن و ئاوارە بن، بەڵکو کوردەکانی پتر لە جاران لەگەڵ هەڵاواردن لە لوبنان رووبەڕوو کردەوە. بۆ نموونە لە کاتێکدا کە سوننەکان لە نیوەی دەیەی ١٩٧٠ لەگەڵ مەسیحییەکاندا

شەڕیان دەکرد، کوردەکان بە شێوازی خۆویستانە یارمەتی میلیشیا سوننەکانی "مرابتون"یان دا، بەڵام لە کاتی دابەشکردنی یارمەتییەکانی ئەوروپا و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کورد پشتگوێ خران. یارمەتییەکان تەنها لە نێوان مارۆنییەکان، دەروزییەکان، شیعەکان و سوننەکاندا دابەشکرا. ئەرمەنییەکان بە حوکمی ئەوە کە مەسیحی بوون، بەشی خۆیان لە مارۆنییەکان وەرگرت و کوردیش بە حوکمی ئەوە کە سوننە بوون، دەبوایە بەشی خۆیان لە هاوئایینە سوونەکانیان وەربگرتبایا، بەڵام بە بیروبۆچوونی "مرابتون"، کورد تەنها کورد بوون و هیچێکی دیکە.

بە کورتی، کورد لەو خەڵکانەن کە زۆرترین بەدبەختی و نەهامەتییان لە میانەی شەڕی ناوخۆدا بەسەردا هات. کورد لە کۆمەڵگای لوبنان پەرتەوازە کرابوون و بە دەستی ئازار و ئەزیەت و نادادپەروەریی سیستماتیك کە حاشای لە مافی مرۆڤی ئەوان وەك هاووڵاتی دەکرد، گیرۆدە ببوون. کورد بە هیوای ئەوە کە رەوشیان دەگۆڕدرێت، بە هەڵە بەشداریان لە شەڕی ناوخۆدا کردو ئەم هۆکارە ئەوانی پتر لە جاران بڵاو و هیلاك کرد. تەنانەت ئەمڕۆ کورد لە لوبنان هێشتا هەتا رادەیەك هەست بەوە دەکەن کە هیچ دۆستێکیان نییە. کورد دۆستی کەمیان لە لوبنان دۆزیوەتەوە کە بیەوێ لایەنی کورد بگرێ یان پشتیوانی لە بەرژەوندییەکانیان بکات.

بە گوێرەی ئەنجامی توێژینەوەکەی ساڵی ١٩٩٥، کورد لە دەستی هەموو گرووپە سەرەکییەکانی لوبنان نەهامەتییان بینیوە. مارۆنییە مەسیحییەکان، حاشا لە هاووڵاتیبوونی کورد دەکەن لەبەرئەوە کە ئەگەر کورد ببن بە هاووڵاتی، هاوسەنگی نێوان گرووپەکان بە قازانجی موسڵمانەکان تێکدەدرێت. سوننەکان کە لەژێر کاریگەری ئایدیۆلۆژییە رکابەرە عەرەبییە جۆراوجۆرەکاندان (بۆ نموونە ئایدیۆلۆژی ناسریزم و بەعسیزم) حەزیان لە کورد نییە، کەوابوو زۆر هەوڵ نادەن بۆ ئەوەی کە کورد ببن بە هاووڵاتی. بە بیروبۆچوونی شیعەکان، کورد تەنها خەباتکاری سوننەکان و هاوپەیمانی دەروزییەکانن و هیچی دیکە. بۆ دەروزییەکان، کورد شەڕکەرانێکی باشن. دەروزییەکان و سوننەکان دەیانەوێت کورد شەڕیان بۆ بکەن، بەڵام کاتێك کە کاریان بە کورد نەما، پشتگوێیان دەخەنو بێجێیان دەکەن. هەتا ئەو جێگایەی کە پەیوەندی بە رێبەرە خۆجێییەکانەوە هەیە، کوردەکان (جگە لە چەند ناوێزایەك) متمانەیان بە سەرجەم بژاردە سیاسییەکانی لوبنان نییەو بێکەڵك سەیریان دەکەن و بەوە تۆمەتباریان دەکەن کە هەڵپەرەستن[14].

١٤ـ ناوێزا سەرەکییەکانی ئەم بابەتە بریتین لە سامی الصلح، سەرۆك وەزیری سوننەی دەیەی ١٩٥٠و ١٩٦٠، کەماڵ جونبەلات، سەرۆکی دەروزییەکان و رێبەری هێزە ناسیۆنالیستە عەرەبە چەپەکان لە سەردەمی شەڕی



## رێکخراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی کوردەکان

پێش کۆتایی دەیەی ١٩٥٠، کوردەکانی لوبنان لە راستیدا لە هیچ چالاکییەکی بەرچاوی سیاسی یان کۆمەڵایەتیدا بەشداریان نەدەکرد و تەنها لە دوای رووداوەکانی ساڵی ١٩٥٨ و پاش ئەوە بوو، کە کورد کەوتنە بیری ئەوە کە لەم چالاکییانەدا بەشداری بکەن. یەکەم هۆکاری ئەم مەسەلەیە ئەوە بوو، کە لە دوای شەڕی ناوخۆی لوبنان لە ساڵی ١٩٥٨، ولاتی لوبنان کۆچی بەرفراوانی گوندنشینان بۆ شارەکانی بە خۆیەوە بینی، بە شێوەیەك کە تەنها لە دەیەی ١٩٦٠، نزیکەی یەك لە ٥ی حەشیمەتی گوندنشینی لوبنان بۆ شارەکان (زۆرتر بێروت و دەوروبەری بێروت) کۆچیان کرد. ئەم کۆچبەرانە لە بێروت ژیانی کوردەکانیان ئاستەمتر کرد لەبەرئەوە کە بە شوێن هەمان کارانەدا بوون کە کورد بە شوێنیاندا بوون و لە هەمان ناوچانەدا نیشتەجێبوون کە کورد تێیاندا دەژیان. بەهەرحاڵ، بە پێچەوانەی رکابەرە نوێیەکانیان، کوردەکان هیچ مافێکی هاووڵاتییانیان نەبوو. لە ئەنجامدا کورد تووشی زەرەر و زیانی ئابووری توند بوون، کەوابوو دەنگی ناڕەزایەتی خۆیان لەمەڕ مەسەلەی هاووڵاتیبوون بەرز کردەوە.

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی ئەم مەسەلەیە ئەوە بوو، کە لە ساڵی ١٩٥٨، یەکێتییەك لە نێوان سوریا و میسر پێکهات کە کاریگەریی نەرێنی گرینگی زۆری لەسەر رەوشی سیاسیو کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردەکان لە سوریا کرد. ئەنجامیی کۆتایی ئەم یەکێتییە لە لوبنان هەستی پێکرا. ئەم یەکێتییە یەکەم کردەوەی سەرکوتکەرانەی خۆی لە دژی کوردەکان لە سوریا ئەنجامدا. هەزاران کوردی سوریا کە زۆربەیان خوێندکارە سیاسییەکان، کرێکارو ئاوارەو پەنابەرەکان بوون، هەڵاتن بۆ لوبنان. ئەم کەسانە سەرەڕای ئەوە کە بە شێوازی کاتی لە لوبنان دەژیان، توانیان کوردەکانی لوبنان لەمەڕ گرینگی چالاکی کۆمەڵایەتی و سیاسی هۆشیار بکەنەوە. ئەوان تەنانەت یارمەتییان بە پێکهاتنی رێکخراوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کوردەکان، بەتایبەت لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠و سەرەتای دەیەی ١٩٧٠داو بەشداریان لە چالاکییەکانیان کرد.

دوایین و لەوانەیە گرینگترین هۆکاری دەستکردنی کوردەکان بە چالاکی سیاسیو کۆمەڵایەتی، رووخانی حکوومەتی پاشایەتی عێراق لە ساڵی ١٩٥٨ بوو کە سەرەنجام بوو بە هۆی هەڵگیرسانی

ناوخۆ (کە ساڵی ١٩٧٧ بە دەستی سوریا کوژرا). سالم الهوس، سەرۆك وەزیری سوننە لە دەیەی ١٩٧٠، ١٩٨٠، ١٩٩٠و رەفیق الحریری، سەرۆك وەزیری سوننە لە دەیەی ١٩٩٠بوو.

شەڕی ١٩٦١ـ١٩٧٥. مەلا مستەفا بارزانی پێویستی بە چوارچێوەیەکی جەماوەری بۆ شەڕ بوو، هەربۆیە توانی چوارچێوەیەك لە شاری بێروت دروست بکات کە هەزاران کوردی تێیدا دەژیان. لە ئەنجامدا، گەلێ لە کوردەکانی لوبنان بە هۆی ئەم شەڕە، هۆشیاری نەتەوەییان پێشکەوت و هەستیان بە رەوشی خەراپی خۆیان کرد و بیریان لە میتۆدگەلێك کرد تا ئەم رەوشە بگۆڕن. یەکێك لەم میتۆدانە دامەزراندنی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بوو.

لە درێژەدا کورتەیەك لە وردەکارییەکانی شێوازی پێکهاتن و پێشکەوتنی هەر ڕێکخراوێك (لەوانە کاروکردەوەیان لەگەڵ گرووپە کوردو لوبنانییەکانی دیکە) دەخەینە بەرباس.

## ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان

### الجمعیة الخیریة الکوردیة اللبنانیة (ئەنجوومەنی خێرخوازی کوردی لوبنان)

ئەمە یەکەم ڕێکخراوی یاسایی کوردی بوو، کە کە لە لوبنان لە ١٩ی ئەیلوولی دامەزرا ١٩٦٣ واتا لە کاتێکدا کە کەمال جونبەلات وەزیری ناوخۆ بوو. یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی ئەم ڕێکخراوەیە پتەوترکردنی پەیوەندە دۆستانەکانی نێوان جوانە کوردەکانی لوبنان، پەرەپێدانی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتی و گشتییەکان و پەرەپێدانی خوێندەواریو زانست لە نێو کوردەکان بوو. چالاکی سەرەکی ئەم ڕێکخراوەیە، دامەزراندنی بنکەیەکی تەندروستی لە تشرینی یەکەمی ١٩٦٧و دابەشکردنی یارمەتییە مرۆڤدۆستانەکان بوو.

ئەم ڕێکخراوەیە هێشتا تەنها ڕێکخراوی یاسایی و فەرمییە کە زۆربەی ئەندامەکانی کوردە کرمانجەکانن و ئەم راستییە دەربڕی دابەشبوونی ڕێکخراوە کوردییەکان بەگوێرەی هێڵە زمانیو کۆمەڵایەتییەکانە. ئەم ڕێکخراوەیە هەرچەند کە زۆر چالاك نییە و چالاکییەکانی زۆرتر لە پێناو دابینکردنی خزمەتگوزاریی راستەوخۆ بە ئەندامەکانییەتی، بەڵام هێشتا بە شوێن گۆڕینی رەوشی کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری و یاسایی کوردەکانی لوبنانە. بۆ نموونە هەروەك هەموو ڕێکخراوەکانی دیکە، وەك نیگەرانی یەکەمی خۆی بە شوێن کێشەی هاوولاتیبووندا دەچێت.

### جمعیة الارز الریاضیة الثقافیة (ئەلئەرز ـ کۆمەڵە وەرزشییە کولتورییەکان)

ئەم ڕێکخراوەیە لە ١٨ی ئاداری ١٩٧٩ لە ژێر ناوی "جمعیة الارز الریاضیة"بە مەبەستی پەرەپێدانی چالاکییە وەرزشییەکانی کوردەکان، دامەزرا و ٣ ساڵ دواتر داوێنەی





چالاکییەکانی بۆ چالاکیی کولتووری پەرەپێدا، هەر بۆیە ناوی تەواوی بوو بە "جمعیة الأرز الریاضیة الثقافیة". دامەزرێنەری ئەم ڕێکخراوەیە پەی بەوە برد کە پێویستی سەرەتایی گرووپێکی نەخوێندەوارو بەرێکخستننەکراوی وەك کورد، ناوەندێکی کولتوری وەك کۆمەڵەی "ئەلئەرز"ە.

ئەندامانی ئەم ڕێکخراوەیە، تەنها کوردە ماردینی زمانەکان بوون و یەکێك لە کەسایەتییە سەرەکییەکانی فەیسەڵ فەخرۆ بوو کە "حیزبی رزگاری" دامەزراند. یەکێك لە چالاکییە بەرچاوەکانی ئەم ڕێکخراوەیە دامەزراندنی یانەیەکی تۆپی پێ بوو کە لە پلە دووی لوبناندا یاری دەکات.

### اتحاد الطلبة الأکراد في لوبنان (یەکێتی خوێندکارانی کورد لە لوبنان)

ئەم ڕێکخستنە لە ٩ی حوزەیرانی ١٩٧٠ لە لایەن گرووپێك لە خوێندکاران دامەزرا، کە لە کەشوهەوای قۆناخی وەزارەتی ناوخۆی کەمال جونبەلات کەڵکیان وەرگرت. ئامانجی ئەم یەکێتییە، پەرەپێدانی رەوشی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی خوێندکارانی کورد لە لوبنان و دابین کردنی خزمەتگوزاری پەروەردەیی بۆ ئەو کوردانە کە نەیاندەتوانی بچنە زانکۆکانی لوبنان و پتەوکردنی پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ یەکێتی خوێندکارانی لوبنان و یەکێتیە خوێندکارییەکانی دیکە بوو. بەهەرحاڵ چالاکییەکانی یەکێتی زۆر لاواز بوو، لە بەر ئەوە کە ژمارەی خوێندکارانی کورد لە لوبنان کەم بوو. لەمە زیاتر، ناکۆکییە ناوخۆییەکانی ناو یەکێتی کە لە ساڵی ١٩٧٤ لەسەر شێوازی ڕێبەرایەتی، لە نێو ئەندامانی ڕێبەرایەتیدا هاتە ئاراوە، چالاکییەکانی زۆر کەمکردەوە. کەوابوو نەیتوانی بگات بە ئامانجەکانی و بە دەستپێکردنی شەڕی ناوخۆیی لوبنان، هەڵوەشایەوە.

### الجمعیة الکردیة الثقافیة الأجتماعیة (کۆمەڵەی کۆمەڵایەتی کولتوری کورد)

ئەم ڕێکخراوەیە لە ٣ی گوڵانی ١٩٧٥ بە دەستی ڕێکخراوی "منضمات البارتی الکوردیە الیساریە فی لبنان"، بەمەبەستی پەرەپێدانی خوێندەواری و کاروکردەوە لەگەڵ ڕێکخراوە کولتورییە کوردییەکانی دیکەو پتەوکردنی رەوشی کۆمەڵایەتی و کولتوری کوردەکانی لوبنان، دامەزرا. بەهەرحاڵ، چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوەیە کە بەرنامەی خوێندەواری و بڵاوکردنەوەی بۆلتۆنێك بە ناوی "ڕێبەر" و هەروەها کۆمەڵێك نامیلکە لە بارەی ئەدەبیاتی کوردی

لەخۆدەگرت، پاش چەند مانگ لە داگیرکردنی لوبنان لە لایەن ئیسرائیل لە حوزەیرانی ١٩٨٢ کۆتایی پێهات. ئەم رێکخراوەیە بە هۆی پەیوەندییە نزیکەکانی لەگەڵ رێکخراوە جۆراجۆرە فەلەستینییەکان بەناوبانگ بوو، هەر بەم هۆیەوە گەلێك لە بەرێوەبەرانی پێش لە گەیشتنی هێزە ئیسرائیلییەکان، لوبنانیان بەجێهێشت. ئەم رێکخراوەیە، کۆمەڵێکی مەزن کتێبی نایابی دەربارەی کوردەکان بە زمانە جۆراوجۆرەکان بوو، کە لەنێوان خەڵکدا دابەشکرا یان فرۆشرا بە خەڵك. ناکۆکییە ناوخۆییەکانی نێوان ئەندامەکانی رێکخستن، کۆتایی بە ژیانی ئەم رێکخراوەیە لە کانوونی دووەمی ١٩٨٣دا هێنا.

**مجلس الأعيان الكرد اللبنانية الأعلى (ئەنجوومەنی باڵای کوردە ئەعیانەکانی لوبنان)**

ئەم رێکخراوەیە لە ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٤ دامەزرا و ئامانجی سەرەکیی بایەخدان بە چالاکییە کۆمەڵایەتی، کولتوری، پەروەردەیی و گەشەسەندنەکان بە مەبەستی باشترکردنی بارودۆخی کوردەکان لە لوبنانو یەکگرتنی هەموو گرووپ، بنەماڵە، حیزبە سیاسییەکان، کلوپ و کۆڕ و کۆمەڵە کوردییەکانی لوبنان بوو[15]. بە هەرحاڵ، شێوازی تاکەکەسی پێکهاتە و رێبەرایەتی ئەم رێکخراوەیە، نەیهێشت کە خەڵك پشتیوانی لێ بکەن و رێکخراوە کوردییەکانی دیکەی لوبنان هاوکاریی بکەن. لە راستیدا ناوی ئەم رێکخراوەیە، رەنگدانەوەی جۆری ئەندامەکانی بوو، واتا دەوڵەمەندەکان کە خەڵکی بەساڵاچوون کە پارەیان هەیە، بەڵام خوێندەواری یان میکانیزمی پێویستیان بۆ باشترکردنی رەوشی گشتیی کۆمەڵگای کورد نییە.

بە کورتی دەکرێ وەك دەرەنجام بگوترێت کە رێکخراوە غەیرە سیاسییەکانی کورد نەیانتوانی رەوشی کۆمەڵایەتی- ئابووری کوردەکان بگۆڕن و بە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ لە ساڵی ١٩٧٥ رەوشیان خراپتر بوو و لەوە لاوازتر بوون کە بتوانن تەنانەت رەوشی ئەندامەکانی خۆیان بگۆڕن، چ بگات بە رەوشی کوردەکان بەگشتی. بۆ نموونە بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە کاتی دامەزراندنیاندا رایاندەگەیاند، نەیانتوانی تەنها قوتابخانەیەك یان نەخۆشخانەیەك دروست بکەن یان پلانێکی کۆمەڵایەتی بە ئامانج دابڕێژن. لەمە زیاتر، رێکخراوەکان نەیانتوانی کادری رێبەرایەتی نوێ- کە تێڕوانینێکی دیکەی بە نیسبەت

١٥ـ دامەزرێنەری ئەم رێکخراوەیە، وەهاج ئەلشێخ موسا بوو کە سەر بە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی کورد بوو کە خۆی لە هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی ساڵی ١٩٩٢کاندیدا کرد، بەڵام سەرنەکەوت.



کێشەکاندا هەبێ و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی هان بدات- پەروەردە بکەن. رێکخراوەکان زۆر لاواز بوون و نەیانتوانی گوشار بخەنە سەر دەسەڵاتدارانی لوبنان و نەیانتوانی کوردەکان بەرەو لای کۆمەڵگای لوبنان رابکێشن. ئەم ئاکامانە، گەلێ لە کوردەکانی شێلگیر کرد تا یەکێتییە بنەماڵەییەکان دابمەزرێنن (کە لە میانەی دەیەی ١٩٧٠ بە شێوازی گرووپە بنەماڵەییەکان دامەزران) و خزمەتی خۆیان بکەن. پێکهاتەی ئەم یەکێتییانە کاردانەوەیەك لە بەرامبەر نارەزایەتی ئەوان یان ناسازگاری لەگەڵ رێکخراوە کوردییەکان بوو. لەگەڵ ئەمەشدا، ئامانج و چالاکی ئەم یەکێتییانە جیاوازی لەگەڵ ئامانج و چالاکییەکانی رێکخراوە غەیرە سیاسییەکان نەبوو و لەوان باشتر نەبوون. بە داخەوە ئاکام و ئەنجامی ئەم رێکخراوانە، بڵاوبوونی زۆرتری کۆمەڵگای کورد بوو.

## حزبە سیاسییەکان

**الحزب الديمقراطي الكوردي في لبنان- البارتي (حزبی دیموکراتی کوردی لوبنان ـ بە "ئەلپارتی" ناسراوە)**

ئەمە یەکەم حیزبی یاسایی کوردی بوو، کە لە ساڵی ١٩٧٠ لە لوبنان بە دەستی جەمیل محۆ کە بۆیاخچی ماڵان بوو، دامەزرا. حیزب چالاکیی خۆی بە شێوازی نهێنی لە تەمموزی ١٩٧٠ لە ژێر ناوی المنضمات الشباب الكورديە فی لوبنان (رێکخراوی جوانانی دیموکراتی کورد لە لوبنان) دەستپێکرد. ئەم رێکخراوەیە لە لایەن دەستەیەك لە لاوانی کوردی سوریا و لوبنان بە یارمەتی و هاندانی حزبی دێموکراتی کورد لە سوریا (PDKS) پێکهات[16]. لە سەرەتادا، چالاکییەکانی ئەم رێکخراوەیە بریتی بوون لە پێوەندیگرتن لەگەڵ کوردەکانی خۆوڵاتی، بڵاوکردنەوەی بەیاننامە لەمەڕ رەوشی کۆمەڵایەتی، کولتوری و سیاسی کۆمەڵگای کورد و میتۆدەکانی باشترکردنی ئەم رەوشە بە پێداگرتنی تایبەت لەسەر پرسی هاووڵاتیبوون. هەتا ساڵی ١٩٧١و بە مۆچیاری PDKS، ئەم رێکخراوەیە یارمەتی بە نوێنەرانی مەلا مستەفا بارزانی دا کە ناردرابوون بۆ لوبنان تا بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە عێراق پڕۆپاگەندە بکەن.

١٦ـ دروشمەکانی گرووپ بریتی بوون لە "هاووڵاتیبوون یەکێك لە مافەکانی کوردانە"و "یەکبگرن، پاشان داوای مافی خۆتان بکەن".

چالاکییە سیاسییەکانی گرووپ هەتا ساڵی ١٩٧٠ نهێنی بوو، واتا هەتا کاتێك کە محۆ لە کۆنگرەی هەشتەمی پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK) کە لە ئابی ١٩٧٠ لە عێراق بەڕێوەچوو، بەشداریکرد. لەم کۆنگرەیەدا، بارزانی لەمەڕ گرینگی بەرێکخستن کردنی چالاکییە سیاسییەکانی کوردەکان لە چوارچێوەیەکی یاساییدا کە هەم خزمەتی کوردەکانی لوبنان و هەم خزمەتی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بکات، ئاگاداری دا بە محۆ. بارزانی دەیزانی کە محۆ لەگەڵ کۆمەڵێك گیروگرفت لە لایەن سەلاح بەدرەدین (ڕێبەری پێشووی حیزبی دیموکراتی کوردی سوریا کە لە لایەن بارزانییەوە تەرێك خرابووەوە، بەڵام لایەنگری زۆری لە لوبنان هەبوو) ڕووبەڕوویە، هەربۆیە نامەیەکی دا بە محۆ و لەم نامەیەدا بۆ کوردەکانی لوبنانی نووسی کە محۆی بۆ ڕێبەرایەتی کوردەکانی لوبنان هەڵبژاردووە. ڕاستییەکەی ئەوە بوو، کە کوردەکانی لوبنان وەك قارەمانی ئامانجی کورد سەیری بارزانیان دەکرد، کەوابوو هەرچی کە بارزانی بیگوتبایا، بە گیان و دڵ قەبووڵ دەکرا.

هەڵبژاردنی محۆ وەك نوێنەری بارزانی، خۆشەویستیی ئەوی لە لوبنان زیاد کرد. ئەم ڕاستییە سەلاح بەدرەدین-ی تووڕە کرد و محۆی تاوانبار کرد کە دەستێوەردانی نامەکەی بارزانی کردووە. بەهەرحاڵ، محۆ پاش ئەوە کە لە عێراق گەڕایەوە، توانی گەلێ لە کوردەکان لە پشتی حیزبەکەی تەیار بکات و داوای لە دەوڵەتی لوبنان کرد کە وەك حیزبێکی یاسایی قەبووڵی بکات. لە ٢٤ی ئەیلوولی ١٩٧٠، حیزب بوو بە یاسایی و "حیزبی دیموکراتی کورد لە لوبنان" کە بە "ئەلپارتی" ناسراوە لە دایك بوو. بەهەرحاڵ، بەدرەدین تەسلیمی ئەم کەند و کۆسپە نەبوو و پاش ماوەیەکی کەم دەستیکرد بە خەبات دژی محۆ و بەوە تاونباری کرد کە بە هۆی ماددی، بەرەولای دەوڵەتی عێراق ڕاکێشراوە. هەر بۆیە خۆشەویستی محۆ بە شێوازێکی سەرسووڕهێنەر کەمی کرد، لە بەر ئەوە کە نەیتوانی پێچەوانەی بانگەشەکانی بەدرەدین بسەلمێنێت. محۆ پاشان بە خزمپەرەستیش تاوانبار کرا. سەرەنجام بارزانی بانگی محۆی کرد و بۆ ماوەی سێ ساڵ ـ لە ساڵی ١٩٧١ هەتا ١٩٧٤ ـ لە کوردستانی عێراق ڕایگرت.

پاش گەڕانەوە بۆ لوبنان، محۆ بەردەوام لە ڕۆژنامەکەی خۆی بە ناوی "صوت ألاكراد" (دەنگێ کورد) کەڵکی وەرگرت تا نەیارێتی خۆی لەگەڵ بارزانی و پشتیوانیکردن لە بەرنامەی خودموختاری دەوڵەتی بەغداد بۆ کوردەکان ڕابگەیەنێت. ئەم کارە بووە هۆی لەتبوونی ناوخۆیی زۆرتری کۆمەڵگای کورد لە لوبنان و لەتبوونی "ئەلپارتی"و لاوازبوونی پێگەی محۆ وەك ڕێبەری کۆمەڵگا. "ئەلپارتی" لە ئاستی مەحەلیدا هەتا ساڵی ١٩٧٦ لە چوارچێوەی



بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبناندا کاری دەکرد، بەڵام لەم ساڵەدا بە بیانووی ئەوە کە ئیدی لە لایەن پارتی شیوعی لوبنان (LCP) پێشوازی لێناکرێ، لە بزووتنەوە کێشایەوە. LCP لەسەر ئەوە پێداگری دەکرد کە منضمات البارتی الكوردیە الیساریە فی لوبنان (ڕێکخستنەکانی حیزبی چەپی کورد لە لوبنان) شوێنی "ئەلپارتی" بگرێتەوە.

محۆ دەستگیرکراو هەتا ساڵی ١٩٧٧ لە لایەن کاربەدەستانی سوریاوە زیندانی کرا. چالاکییەکانی "ئەلپارتی" پاش مەرگی محۆ لە ساڵی ١٩٨٢ کۆتایی پێهات و لە ساڵی ١٩٩١ لەسەر داواکاری کاربەدەستانی سوریا، ڕەوشی یاسایی خۆی لە دەستدا.

### القيادة المركزية للپارتي (ڕێبەرایەتی ناوەندی ئەلپارتی)

پاش ئاشکرابوونی لایەنگریکردنی محۆ لە دەوڵەتی عێراق، چەند ئەندامی ئەلپارتی لە ساڵی ١٩٧١ ڕیزەکانی حیزبیان بە جێهێشت بە مەبەستی پێکهێنانی "حیزبی دیموکراتی کوردی لوبنان ـ ڕێبەرایەتی ناوەندی"، تەقلی ئەو دۆستانە بوون کە داواکاریی ئەندامێتییان پێشتر لە لایەن "محۆ"وە ڕەتکرابۆوە. تایبەتمەندی ئەم گرووپە ئەوە بوو، کە بەتەواوی هاوکاری بارزانی دەکرد و وەفاداری بارزانی بوو. هەر ئەم ڕاستییەش بووە هۆی ئەوە کە خۆشەویستی حیزب لە ناو دڵی گەلێ لە کوردەکانی لوبنان و سوریا زۆرتر ببێ. ئەم حیزبە، بۆڵتۆنێکی بە ناوی "ئەلپارتی" بلاو دەکردەوەو گەلێ جار داوای مۆڵەتی لە دەوڵەتی لوبنان کرد، بەڵام بێ ئاکام بوو. چالاکییە سەرەکییەکانی بریتی بوون لە کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە عێراقو بلاوکردنەوەی دەنگوباسی ئەم بزووتنەوەیە لە لوبنان و دەوروبەری لوبنان. پاش هەڵوەشانەوەی بزووتنەوەی کورد لە ئاداری ١٩٧٥، چالاکییەکانی حیزب هێدی هێدی کەمی کردەوەو بە کوشتنی سکرتێری گشتیی حیزب، قازی فەرەح لە تەمووزی ١٩٧٨، کۆتایی پێهات و هەوڵەکان بۆ زیندووکردنەوەی چالاکییەکانی لە دەیەی ١٩٨٠ بە تەواوی هەرەسیان هێنا.

### ڕزگاری (حیزبی کوردی لوبنان)

فەیسەڵ فەخرۆ لە سێ هۆکار کەڵکی وەرگرت تا لە ٣ی نیسانی ١٩٧٥ ئەم حیزبە دابمەزرێنێت:١- سەرنەکەوتنی "ئەلپارتی" لە ڕاکێشانی کوردە غەیرە کرمانجەکان ٢- پشتیوانیکردنی محۆ لە بەرنامەی ڕێژیمی عێراق بۆ خودموختاری کوردەکانو٣- پێکهاتەی

ڕێبەرایەتی "ئەلپارتی" کە ببووە ڕێکخراوی بنەماڵەی محۆ نە نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگای کورد بە گشتی.

ڕزگاری ماوەیەکی کورت پاش دامەزران، لە ڕێگای بۆڵتەنی خۆی بە ناوی"خەبات"، پشتیوانی خۆی لە دەوڵەتی لوبنان و بێلایەنی بە نیسبەت گرووپەکانی بەشدار لە شەڕی ناوخۆدا ڕاگەیاند. هەروەها لە بەرەی "جبهة الأحزاب والقوى القومية والوطنية في لوبنان" بەشداریکرد کە نە لایەنگری لە سیاسەتەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبنانی ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان دەکردو نە لایەنگریی بەرەی لوبنانی ژێر دەسەڵاتی مەسیحییەکان.

لە کردەوەیەکی سەرسووڕهێنەردا لە ٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٦، محۆ و فەخرۆ ناکۆکیو هێرشە زمانییەکانیان خستەلاوە و پێکهاتنی "الجبهة الوطنية الكوردية الاريدا" (بەرەی نەتەوەیی مەزنی کورد) یان ڕاگەیاند کە ئامانجە سەرەکییەکانی بەریتی بوون لە یەکخستنی چالاکی سیاسی کورد لە لوبنان، گارانتی کردنی یەکێتی کۆمەڵگای کورد لە لوبنان، باشترکردنی ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردەکان، داکۆکی لە مافی هاوولاتیبوون و دامەزران لە ئیدارە دەوڵەتییەکاندا. حیزب هەروەها پشتیوانی لە بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبنان دەکردو لە هەمانکاتدا پێشوازی لە دەستێوەردانی هێزە ڕێگرە عەرەبییەکان بە ڕێبەرایەتی سوریا وەك باشترین چارەسەری بۆ کۆتایی پێهاتنی شەڕ دەکرد. بەهەرحاڵ پاش کەمتر لە ساڵێك لە دوای زیندانی کرانی محۆ لە لایەن کاربەدەستانی سوریاوە، چالاکییەکانی حیزب بەرە بەرە ڕاوەستا. ڕزگاری لە ساڵی ١٩٧٧ وە زۆر لە گۆڕەپانی لوبناندا لاوازبووە، بەڵام هەتا ئەمڕۆ درێژە بە ژیان دەدات.

## ڕزگاریی دووەم (حزبی کوردی لوبنان)

لە دوای پێکهاتنی بەرەی نەتەوەیی مەزنی کورد لە نێوان "ئەلپارتی" و "ڕزگاری"، تاقمێك لە ڕزگاری جیابوونەوە و سکرتێری گشتیی حیزب، فەخرۆیان بە ئاشتی کردنەوە لەگەڵ محۆ و گەڕانەوە بۆ عەشیرەگەرایی کوردی، تۆمەتبار کرد. ئەم تاقمە نوێیە کە لە لایەن عەبدی ئیبراهیمەوە ڕێبەرایەتی دەکرا، لە باڵادەستیی محۆ بە سەر بەرەدا ناڕازی بوو و فەخرۆی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە بە شوێن نموونەی محۆدا دەچێ و ناهێڵێ گرووپە کوردییە جۆراوجۆرەکان بەشداری تێدا بکەن. لەمە زیاتر، فەخرۆ بە پشتیوانیکردن لە بەرنامەی دەوڵەتی عێراق بۆ خودمختاری کوردستانی تۆمەتبارکرا.



لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٧ ئیبراهیم ڕایگەیاند کە پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی حیزب دەپارێزێ و دامەزرانی "بەرەی نەتەوەیی مەزنی کورد" ی شەرمەزار کرد. لە ئەنجامدا، ئیبراهیم پێکهاتنی حیزبێکی نوێی بە ناوی حیزبی کوردی لوبنان (یان ڕزگاری دووەم) ڕاگەیاند کە شوێنی حیزبی ڕزگاریی لە بەرەی جبهه الأحزاب و القوى القومية و الوطنية في لبنان دا گرتەوە.

"ڕزگای دووەم" هەتا کاتی داگیرکرانی لوبنان لە لایەن ئیسرائیل لە حوزەیرانی ١٩٨٢ درێژەی بە چالاکیدا، بەڵام لەو کاتە بەدواوە، واتا لە دوای ئەوە کە سکرتێری گشتیی حیزب، لوبنان ی بەجێهێشت و ڕۆیشت بۆ سوریا، ژیانی حیزب کۆتایی پێهات و هەوڵدان بۆ زیندووکردنەوەی حیزب کە سێ ساڵ دواتر ئەنجام درا تووشی هەرەسهێنان بوو. لە ڕاستیدا، ماوەیەکی کورت پاش ئەوە کە ئیبراهیم لوبنانی بەجێهێشت، جەمیل حەسەن، یەکێك لە ئەندامانی ڕێبەرایەتی حیزب لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵ لە حیزب جیا بووەوە و "حیزبی ڕزگای سۆسیالیستی لوبنان" ی دامەزراند. جەمیل حەسەن پاش ئەوە کە بوو بە هاوپەیمانی محۆ و دوابەدوای یەکگرتنەوەی حیزبی سۆسیالیست و "ڕزگاری" لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٤لە گرووپی نوێ جیا بووەوە. حیزبی سۆسیالیست تووشی لەتبوونی زۆرتر بوو و لە ساڵی ١٩٨٥ ژیانی کۆتایی پێهات.

## منضمات البارتية الكوردية اليساريه في لبنان (ڕێکخراوی حزبی چەپی کورد لە لوبنان)

ئەم حزبە مارکسیست لنینیستە (ڕێکخراوی حزب) یەکێ لە گرووپە جیابووەکانی الحزب الديمقراتيه الكورديه اليساری (LKPD) بوو. LKPD لە ٥ی ئابی ١٩٦٥ بە دەستی سەلاح بەدرەدین پاش ئەوە کە لە حیزبی دیموکراتی کوردی سوریا (PDKS) جیابووە، دامەزرا. سەرەتای چالاکییەکانی "ڕێکخراوی حزب" دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ واتا کاتێ کە ژمارەیەك لە کۆچبەرانی کوردی سوریا بوون بە ئەندامی حزب و لەگەڵ "منضمات الشباب الكورديه" هاوکاریان دەکرد. ئەم هاوکارییە هەتا ساڵی ١٩٦٩ درێژەی هەبوو. لەم ساڵەدا، پێوەندییەکانی نێوان سەلاح بەدرەدین و بارزانی خراپ بوو، لە بەر ئەوە کە بارزانی بە ڕاشکاوی پشتیوانی لە PDKS دەکرد. لە ئەنجامدا، بەدرەدین بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ لوبنان. لەوێش تووشی گیروگرفتی زۆر بوو، لە بەر ئەوە کە زۆربەی کوردەکانی لوبنان وەفادار بە بارزانی بوون.

"ڕێکخراوی حیزب" چالاکییەکانی خۆی بە ڕەسمی لە ساڵی ١٩٧٠ دەست پێکردو لە میانەی نیوەی یەکەمی دەیەی ١٩٧٠ زۆرتر کاری بۆ ئەوە دەکرد کە کوردەکانی لوبنان بکا بە ئەندامی حیزب، لەبەرئەوە کە زۆربەی ئەندامەکانی کوردی سوریا بوون. ئەم کارە لە چەند ڕێگاوە ئەنجام درا، بۆ نموونە بە راشکاوی ڕەخنەی لە جەمیل محۆ بە هۆی لایەنگری کردن لە عێراقییەکان[١٧] و سورياييەکان و دوورکەوتنەوە لە بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبنان (کە بووە هۆی ئەوە کە ژمارەیەك لە ئەندامانی ئەلپارتی بچنە ریزی ڕێکخراوی حیزب) دەگرت. محۆ بەتوندی، شیوعییەکانی (کە "ڕێکخراوی حیزب" پێوەندی باشی لەگەڵیاندا هەبوو) بەوە تۆمەتبار کرد کە ناکۆکی دەخاتە نێو بزووتنەوە، لە ئەنجامدا "ئەلپارتی" لە بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبنان کێشایەوەو "ڕێکخراوی حیزب" شوێنیی گرتەوە. لە کردەوەدا "ڕێکخراوی حیزب" کە پاشان ناوی خۆی گۆڕی بۆ الاتحاد الشعبیە الکرد فی لبنان (یەکێتی گەلی کورد لە لوبنان)، لە کاتێکدا کە سکرتێری گشتیی حیزب، بەدرەدین پاش داگیرکاری ئیسرائیل، هەڵات بۆ قوبرس، ژیانی کۆتایی پێهات. بەر لەوەش "ڕێکخراوی حیزب" تووشی کۆمەڵێك ناکۆکی ناوخۆیی بووە کە سەرەنجام پێکهاتنی گرووپێکی لادەر بە ناوی منضمات البارتی الکوردیە الیساری فی لبنان- الحرکە التصحیحیە (ڕێکخراوی حیزبی چەپی کوردی لوبنان- بزووتنەوەی ساخکەرەوە)ی لێکەوتەوە. ئەم ڕێکخراوەش بە داگیرکردنی لوبنان لەلایەن ئیسرائیل ژیانی کۆتایی پێهات.

### منظمات التقدمیە الأکراد فی لبنان (ڕێکخراوی پێشکەوتنخوازی کوردی لوبنان)

ئەم حیزبە یەکێك لە گرووپە لادەرەکانی ڕێکخراوی حیزب بوو، کە لە لایەن ئەحمەد جمهوور و مستەفا سۆفییەوە ڕێبەرایەتی دەکرا. لادەرەکان، بەدرەدین-یان بە هۆی پێوەندییەکانی لەگەڵ ڕژێمی عێراق لە ساڵی١٩٧٥، بە خیانەت تۆمەتبار کرد. پاشان لە حوزەیرانی ١٩٧٦ جمهوور و سۆفی بەیاننامەیەکیان لە ژێر ناوی "القیادة الشرعیة المنظمة" (ڕێبەرایەتی یاسایی ڕێکخراوی حیزب) بلاوکردەوە و لە نیوەی ساڵی ١٩٧٨دا ناوی حیزبەکەیان کرد بە "ڕێکخراوی پێشکەوتنخوازی کورد لە لوبنان". چالاکییەکانی حیزب بریتی بوون لە دامەزراندنی رابکە التقدم الفکریە (یەکێتی ڕۆشنبیران بۆ پێشکەوتن)، بەڕێوەبردنی فستیواڵ و سمینار و

١٧- سەلاح بەدرەدین ساڵی ١٩٧٥ چووە پاڵ دەوڵەتی عێراق.



بلاوکردنەوەی چەند نامیلکەیەك. لەگەڵ ئەمەشدا، تەمەنی ئەم ڕێکخراوەیە زۆر کورت بوو و بە داگیرکردنی لوبنان لە لایەن ئیسرائیل لە حوزەیرانی ١٩٨٢، هەڵوەشایەوە.

### الحزب الدیموقراطیة الکوردیه فی لوبنان ـ البارتی/ القیادة الموقتة (حزبی دیموکراتی کوردی لوبنان ـ ئەلپارتی/ ڕێبەرایەتی کاتی)

پاش پێکهاتنی "بەرەی نەتەوەیی مەزنی کورد" لە ساڵی ١٩٧٦ لە نێوان ئەلپارتی و رزگاری، موحەممەد محۆی کوڕی جەمیل محۆ، لە حیزبەکەی باوکی جیابووەوە و حزبێکی لە گولانی١٩٧٧ دامەزراند. موحەممەد لە ڕێگای بلاڤۆکەکەیەوە بە ناوی "صوت الشباب الکوردیە" (دەنگی جوانانی کورد)، بە راشکاوی دەستی کرد بە ململانێ لەگەڵ باوکی و بە هۆی پشتیوانی لە سیاسەتی ڕژێمی عێراق لە دژی بارزانی و چوونە دەرەوە لە بزووتنەوەی نەتەوەیی لوبنان، ڕەخنەی لە باوکی گرت. بەهەرحاڵ هەم موحەممەد و هەم باوکی یەك بیروبۆچوونیان دەربارەی کوردە غەیرە کرمانج زمانەکان هەبوو و ئەم ڕاستییە کاریگەریی نەرێنی کردە سەر "ئەلپارتی- ڕێبەرایەتی کاتی". موحەممەد لە پێکدادانێکدا لەگەڵ بزووتنەوەی شیعەی "ئەمەل" لە ١٦ی نیسانی ١٩٨٢ کوژرا و ژیانی حیزبەکەیشی کۆتایی پێهات.

ڕێکخراوە کوردییەکانی لوبنان (چ سیاسیو چ غەیرە سیاسی) نەیانتوانی بگەن بە ئامانجە خوازراوەکانیان، چونکە کوردەکان بەشداری کەمیان لە چالاکییەکانیاندا دەکرد. چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوانە هیچ پێوەندییەکی بە پێداویستییە سەرەکییەکانی کوردەکان واتا کار و خواردن و دەوا و دەرمانەوە نەبوو. یەکێك لە هۆکارەکانی دیکە، کەمتەرخەمی و گرینگی نەدانی کوردەکان بە چالاکیی سیاسی باش و بە ڕێکخستنکراو بوو. لەمە گرینگتر، ڕێکخراوەکان بە تایبەت پارتە سیاسییەکان لە هۆشیاری و ئاگایی کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردەکانی لوبنان هەڵنەقووڵا بوون و بە هۆکارە دەرەکییەکان هان دەدران و بە ناکاو وەك کاردانەوەیەك لە بەرامبەر نارەزایەتی لە حزبەکان دامەزران.

لەمە زیاتر، ڕێبەران یان مەزنەکانی کوردەکان لە لوبنان نەتەنیا بەسەر دامودەزگای دەسەڵاتداری ڕێکخراوەکان زاڵ نەبوون، بەڵکو سەرچاوەی ڕێکخراوەکانیان بۆ بەرژەوەندی تاکەکەسی بەکاردەهێناو گەلێ لە کوردەکانیان لە ئەندامبوون لەم ڕێکخراوانە بێبەش دەکرد.

لە پاڵ ئەمانەشدا، ڕێبەرایەتی ڕێکخراوەکان خوێندەواری و شارەزایی سیاسییان نەبوو کە پێویستیی سەرەتایی هەموو ڕێکخراوێکی راستەقینەیە. حیزبەکان بە دەستی ناکۆکی ناوخۆییەوە هیلاك ببوون و بە توندی تاقم تاقم ببوون. لەمە زیاتر، لە کاتێکدا کە زۆربەی ڕێکخراوەکان تەنانەت نەیاندەتوانی لە رووی ماددییەوە خۆیان بەخێو بکەن[18]، بەڵێنی دروستکردنی قوتابخانە و نەخۆشخانەیان بە خەڵك دەدا. ئەم کردەوانە، پتر لە جاران، ڕێکخراوەکانیان لە چاوی خەڵکی کورددا بێزار کرد.

دوو هۆکاری گرینگی دیکەی هەرەسهێنانی ڕێکخراوە کوردییەکان و سەرنەکەوتن لە باشترکردنی رەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردەکان ئەوە بوو کە ١- گەلیٚ جاران کێشە نەتەوەییەکان (واتا ڕووداوەکانی کوردستان) بەسەر کێشە مەحەلییەکاندا زاڵبوون و دەستێوەردانی چالاکییە سەرەکییەکانی ڕێکخراوەکانیان دەکرد. ئەم راستییە بووە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی و کێشە لە نێوان ڕێکخراوەکاندا. هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە ڕێکخراوەکان لە هەوڵدان بۆ باشترکردنی رەوشی گشتیی کۆمەڵگای کورد لە لوبنان، غافڵ بن. ٢ـ زۆربەی کوردەکان لە هاووڵاتیبوونی لوبنان بێبەشبوون و ئەمە بووە هۆی ئەوە کە گەلیٚ لە خەڵك لە بەشداریکردنی چالاك لە ڕێکخراوەکاندا بێ هیوا بن.

لێرە دەبێ ئاماژە بەوە بکرێت کە بۆ دامەزراندنی هەموو ڕێکخراوەیەك لە لوبنان پێویستە ٢لە ٣ی بەڕێوەبەرانی ڕێکخراوەکە هاووڵاتی لوبنان بن، بەڵام لەبەرئەوە کە تەنها ژمارەیەکی کەم لە کوردەکان هاووڵاتی لوبنان بوون، ڕێکخراوەکان پشتیان بە هەر کەسێك کە هاووڵاتی لوبنان ببایا دەبەست، بێ ئەوەی رادەی لێهاتوویی ئەو کەسە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی رەچاو بکەن.

بەکورتی کارنامەی پارتە سیاسییە کوردییەکان هیوابەخش نەبوون. ئەوان ئەوەندە لاوازبوون کە نەیاندەتوانی پشتیوانی کۆمەڵێك خەڵك بۆ لای خۆیان رابکێشن و لە راستیدا نەتەنها لە پشتیوانی کۆمەڵانی خەڵك بێبەشبوون، بەڵکو پەرەیان بە چوارچێوەیەکی بە ڕێکخستنکراو و جێگیریش نەدا تا پشتیوانی کۆمەڵانی خەڵك بەرەو لای خۆیان رابکێشن و سەلمێندرا کە چییەتی ئەدەبیاتی سیاسی و هێزی خەباتیان بەلاڕێدابەرە. تەنانەت گەلیٚ لە

١٨ـ داهاتی ڕێکخراوە کوردیەکان، بە تایبەت ڕێکخراوە غەیرە سیاسییەکان زۆرترلە ڕێگای حەقی ئەندامەتی ئەندامەکانی دابین دەکرا. یارمەتیەکانی دیکە زۆر کەم بوو.



پارتەکان هەوڵیان دا تا روانگە تەسکەکانی خۆیان لەگەڵ لە خۆباییەکانیاندا ڕێکبخەن تا پێگەی ئەندامییەتی خۆیان قایم بکەن.

لەمە زیاتر، حیزبەکان لەوە لاوازتربوون کە بتوانن پێکەوە هەڵکردنێکی راستەقینە لە خۆیان نیشان بدەن، بەتایبەت لەبەرئەوە کە زۆربەیان لە لایەن دامەزرێنەرەکانیانەوە ڕێبەرایەتی دەکران و کاتێك کە ئەم ڕێبەرانە نەدەمان (بە هۆی مردن یان هەڵاتن) حیزب هەڵدەوەشایەوە. زۆربەی پارتەکان بە شێوازی نایاسایی کاریان دەکرد و ماوەیەکی کورت پاش دامەزرانی دەوڵەتی لایەنگری ئیسرائیل لە لوبنان لە ساڵی ١٩٨٢، هەڵوەشانەوە.

ئەوەی کە ئەمڕۆ لە هەمووی ئەم حیزبە سیاسییە کوردییانە ماوەتەوە، حیزبی "رزگاری"یە کە ئەویش هەنووکە پشتیوانییەکی زۆر کەمی لە لایەن خەڵکەوە لێدەکرێ. لە ناو ڕێکخراوە غەیرە سیاسییەکانیشدا، "ڕێکخراوی خێرخوازی کوردی لوبنان" و "ڕێکخراوی کولتووری و وەرزشی ئەلئەرز" درێژە بە کاری خۆیان دەدەن.

## دەرەنجام

هەتا کۆتایی شەڕی ناوخۆی لوبنان لە ساڵی ١٩٩١، کورد لە ڕەوشێکی خراپدا دەژیان‌و سووکایەتییان پێدەکرا، گاڵتەیان پێدەکرا و لە بەرامبەریاندا رق و کینە و توندوتیژی بەڕێوە دەچوو. بە نیسبەت سیاسەتی گشتیی، کورد هەروەك گرووپە غەیرە هاووڵاتییەکانی دیکەی وڵات، هەڵسوکەوتی تایبەتیان لەگەڵدا دەکرا. مافی ملکدارییان سنووردار کرابوو، لە ژێر چەتری پاراستنی یەکسانی یاسادا نەبوون، لە مافی دەنگدان بێبەشبوون و لە ئیدارە حکوومییەکاندا دانەدەمەزران. زۆربەیان ناچار بوون بە بێ کەڵکوەرگرتن لە قازانجی گرێبەستەکان و بێ هیچ چەشنە متمانەیەك کار بکەن و لەئەنجامدا بە شێوازی سەرەڕۆیانە لە کار دەردەکران.

توێژینەوەکەی ساڵی ١٩٩٥ نیشانی دا کە کێشەی هاووڵاتیبوون کاریگەرییەکی زۆری کردووەتە سەر ڕەوشی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری کوردەکان لە لوبنان و لە هەموو ڕوویەکی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، ڕەوشی کوردە هاووڵاتییەکان لە کوردە نەهاووڵاتییەکان باشترە. لەمە زیاتر کوردە نەهاووڵاتییەکان لە دامەزران لە ئیدارە حکوومییەکاندا بێبەشن و دوکتۆر، ئەندازیار و پارێزەر لە ناو کوردەکاندا دەگمەنە، چونکە بۆ وەرگرتنی ئەم پیشانە، بەر لە توانایی بەڕێوەبەری، دەبێ ئەندامی سەندیکا یان یەکێتییەك بێت و بۆ ئەندامەتی لە سەندیکاکان و یەکێتییەکان، دەبێ هاووڵاتی لوبنان بێت. کەوابوو کورد لە بەر ئەوە کە هاووڵاتی نەبوون، لە مافی بەشداریکردن لە ژیانی سیاسی لوبنان و خستنەڕووی داواکارییەکانیان و نیشاندانی کاردانەوەی هاوشێوە لە کاتی دەنگدانـدا، بێبەشبوون و لەگەڵ هەڵاواردنی سیستەم ڕووبەڕوو بوونەوە.

ئەم کردەوانە بوونە هۆی ئەوە کە کورد توێژێکی کۆمەڵایەتی جیاواز لە لوبنان پێك بهێنن و ببن بە خەڵکێکی نایەکانگیر و لە خوارووترین پلەی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری لوبناندا جێ بگرن. بەکورتی، گۆڕانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی لوبنان و کاریگەرییە نەرێنییەکانی لەسەر کۆمەڵگای کورد، لە ڕاستیدا نەیهێشت کە کورد پێگەی کۆمەڵایەتی خۆیان بگۆڕن یان کادرێك پێبگەیەنن کە پێوەندی ئەوان لەگەڵ دەوڵەت و سیستەمی ئیداری لوبنان ئاسان بکات و خزمەتگوزارییەکانی دەوڵەت زەمانەت بکات. لەم پەیوەندییەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکرێت کە تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتی- ئابوورییەکانی کوردەکان کە بە گوێرەی ڕادەی داهات، پیشە یان





خوێندەواریی ئەوان دیاری دەکرێت، بێگومان هەتا ڕادەیەك بە هۆی ئەو ڕەوشە خراپەیە کە زۆربەی خەڵکی لوبنان بە سەریاندا سەپاندوویانە.

توێژینەوەکەی ساڵی١٩٩٥ کۆمەڵێك دۆزینەوەی پارادۆکسی دەربارەی چۆنیەتی و ڕادەی ڕاکێشانی کوردەکان بەرەو کۆمەڵگای لوبنان ئاشکرا کرد. سەرەڕای هەستی بەهێزی ناسنامەی کوردی لە نێو کوردەکان (کە لە ڕووی بەکارهێنانی زمانی کوردی وەك زمانی ڕۆژانە، هۆگری زۆر بە موسیقای کوردی، هەڵسوکەوتی خۆناسانە و هاوبەش، هەڵوێستی نەرێنی بە نیسبەت گرووپەکانی دیکەی لوبنان و حەز نەکردن بە پێکهێنانی ژیانی هاوسەری لەگەڵ گرووپەکانی دیکە دیار دەبێت) نزیکەی ٨٥٪ی کوردەکان لەمەڕ کۆچکردن بۆ وڵاتێکی دیکە، لەوانە کوردستانێکی سەربەخۆ دوودڵن. ئەم دۆزینەوانە هیوای کوردەکان بۆ دۆزینەوەی شوێنێکی ئەمن و جێگای ڕێز لە ناو کۆمەڵگای لوبنان، نیشان دەدات[١٩].

بە کورتی، ئاستی هەڵاواردن دژی کوردەکان هێشتا لە سەرەوەیە. کورد هێشتا وەك کەسانێکی جیاواز سەیر دەکرێن و لە ڕووی تاکەکەسییەوە بەهایەکی زۆریان داوە. لەگەڵ ئەمەشدا، پاش چەند دەیە، کورد لە لوبنان شێوە ژیانێکی دوولایەنەیان هەیەو دەست لە هەوڵەکانیان بۆ ناسراوبوون وەك کورد و لوبنانی نەکێشاوە. بە واتایەکی دیکە کورد ئەو کۆمەڵگایەی کە تێدا دەژین وەك ماڵی خۆیان، وەك یەکەم کۆڕی یەکێتییان، وەك شوێنێك کە خواست و ئاواتە تاکەکەسییەکانیان پێکدێت و چێژی لێوەردەگیرێت، قەبووڵ دەکەن. تەنیا شتێك کە کورد پێویستییان پێ بووە (و ئێستاش پێویستیان پێیەتی) بە فەرمی ناسین و قەبووڵ کردنیانە وەك تاکێکی لوبنانی لە لایەن سیستەمی سیاسی لوبنان و خەڵکی لوبنان بە گشتی.

١٩ـ هەستی بەهێزی کوردایەتی ڕەنگە بە هۆی ئەوە بێ کە گرووپە زاڵەکانی لوبنان، کورد وەك خەڵکێکی جیاواز دادەنێن و بە هەڵاواردن مامەڵە و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەن. شێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵ گرووپە زاڵەکان وای لە کوردان کردووە کە زۆرتر هۆشیار بن‌وئاگایان لە جیاوازی خۆیان لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە ببێت. ئەوان لە کۆمەڵگایەکی عەرەبیدا کوردن و جلوبەرگ و هەڵسوکەوتی ئەوان لەگەڵ جلوبەرگ وهەڵسوکەوتی کۆمەڵگای عەرەبی جیاوازە.

## کورد لە سەردەمی ئیمپراتۆری روسیا

لە سەرەتای سەدەی ١٩، گورجستان، رۆژهەڵاتی ئەرمەنستان و باکووری ئازەربایجان لە لایەن روسیاوە داگیرکران. هەموو ئەم سەرزەمینانە کە پێشتر لە ژێر دەسەڵاتی ئێراندا بوون، ژمارەیەکی بەرچاو کوردیان تێدا بوو. ئەمە ئایا ئەم کوردانە (جگە لە کوردەکانی ئازەربایجان)، لە نەوەی کوردەکانی قەفقازیای سەدەکانی پێشووتر بوونە یان نا، بە هۆی ئەو گۆڕانکارییە مێژووییە ئاڵۆزانە کە لە سەردەمی دەسەڵاتداری شەدادییەکان (جگە لە دەسەڵاتداری خورین و میدیانەکان لە سەردەمانی پێشووتردا) رووی داوە، روون نییە. تەنها شتێك کە دەکرێت بە دڵنیاییەوە بگوترێت ئەوەیە کە دانیشتووانی رەسەنی کوردستان بە کۆمەڵێك هۆ (لە گوشاری ئابووری و کێشەی ناوخۆییەوە بگرە هەتا تایبەتمەندییەکانی ژیانی نیمچە رەوەندنشینی) سنووری خۆیان بۆ سەرزەوییەکانی دراوسێ، لەوانە قەفقاز درێژ دەکرد.

بە گوێرەی ئامارەکانی ساڵی ١٨٩٧ (کە یەکەم ئامارێکە کە بە پێی زمانی زگماکی ئەنجام دراوە) حەشیمەتی گشتیی ئیمپراتۆری رووسیا ١٢٥/٦٤٠/٢٠٠ کەس بووە (هەروەها کە خشتەی ١ نیشانی دەدات) کە نزیکەی ١٠٠ هەزاریان کورد بوونە.



**خشتەی ١: حەشیمەتی ئەتنیکەکانی رووسیا بە گوێرەی ئاماری ساڵی ١٨٩٧***

| | |
|---|---|
| رووسی ـ ئوکراینی و بلاڕووس | ٨٩/٩٣٣/٦٠٠ |
| ئەرمەنی | ١/١٧٣/١٠٠ |
| گورجی | ٨٢٤/٠٠٠ |
| تاجیك | ٣٥٠/٤٠٠ |
| تورکمان | ٢٨١/٤٠٠ |
| ئوستیایی | ١٧١/٧٠٠ |
| کورد | ٩٩/٩٠٠ |
| کاباردینی (قەفقازی زمانەکان) | ٩٨/٦٠٠ |
| تات (ئێرانی زمانەکان) | ٩٥/١٠٠ |
| ئەبخازی (قەفقازی زمانەکان) | ٧٢/١٠٠ |
| سیرکاسی (قەفقازی زمانەکان) | ٤٦/٣٠٠ |
| فارس | ٣١/٧٠٠ |
| ئەفغانی | ٥٠٠ |
| یەهوودی | ٥/٠٦٣/٢٠٠ |
| ئەتنیکەکانی تر | ٢٧/٣٩٨/٦٠٠ |
| **کۆ** | **١٢٥/٦٤٠/٢٠٠** |

ئامارەکانی خشتەی ١ (هەروەك ئامارەکانی دواتری سۆڤیەت) جێگای متمانە نین و هەندێك هۆی بەهێز هەیە، کە نیشان دەدات ئەو ئامارەی ٩٩/٩٠٠ کوردە کە لەم خشتەیەدا هاتووە، تەنیا حەشیمەتی کوردەکانی قەفقازە و حەشیمەتی کوردەکانی تورکمەنستان (کە لەو سەردەمەدا تەنها سەرزەمینێکی ئاسیای ناوەڕاست بووە، کە کەمینەی کوردی تێدا بووە)ی لەخۆ نەگرتووە. ئەم کوردانە کە لانیکەم وەك کەمینەی یەکێتی سۆڤیەت ناسراون، لە راستیدا

* سەرچاوە: ئاماری ئیتنیکییەکانی یەکێتی سۆڤیەت، بەرگی فەرەنسەوی، وەرگێڕانی ئیمێری لاریۆنۆڤا و ریگالۆف، مۆسکۆ، ١٩٨٢، لاپەڕەی ٣٥

بەشێك لە کوردە کرمانجەکانی خوراسان (لە رۆژئاوای ئێران) بوون کە لە سەدەی ١٨ لە لایەن شاعەباس-ەوە لە ئازەربایجان بۆ ئەو شوێنە دوورخرانەوە تا سنوورەکانی باکووری رۆژهەڵاتی ئێران لە بەرامبەر ئۆزبەکەکاندا بپارێزن. هەتا کۆتایی سەدەی ١٩ کوردەکانی تورکمەنستان بە قەد کوردەکانی قەفقاز پڕ حەشیمەت و خۆشبەخت بوون.

هەتا ئەو جێگایەی کە پێوەندی بە رەگ و بنەچەی حەشیمەتی کوردی ئەمڕۆی ئەرمەنستانی سۆڤیەتەوە هەیە، ژمارەیەکی کەمیان لە نەوەی ئەو کوردانەن کە لە ئامارەکەی ساڵی١٨٩٧دا جێیان گرتووە، لەبەرئەوەی کە زۆربەی ئەو کوردانەی لە ئامارەکەی ساڵی ١٨٩٧دا هاتوون، لە میانەی شەڕی یەکەمی جیهان یان لە سەردەمی کۆماری تاشناکی ئەرمەنی لە ساڵەکانی ١٩١٨ـ٢٠ ژینۆساید کران و کوردە ئێزدییەکان کە لە میانەی شەڕی دووەمی جیهان لە باکووری کوردستان بۆ ئەو شوێنە کۆچیان کردبوو، شوێنی ئەوانیان گرتەوە. کوردەکانی ئەرمەنستان ئەم رووداوەیان لە ساڵی ١٩٩٠ بۆ نووسەر پشتڕاست کردەوە.

لە میانەی نیوەی دووەمی سەدەی ١٩، بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی ئەرمەنی بانگەشەی ٦ ویلایەتی رۆژهەڵاتی تورکیای دەکرد، کە بریتی بوون لە ئەرزەرۆم، وان، بتلیس، دیاربەکر، مامورت عەزیز و سیواس. ئەمە لەحاڵێکدا بوو، کە بە پێچەوانەی ئەوە کە ئەم بزووتنەوەیە لە ئەورووپا خۆی وەك نوێنەری بیروڕای گشتیی خەڵکی ئەم ویلایەتە ئەرمەنییانە نیشان دەدا، تەنها ١٧ لە سەدی حەشیمەتی ئەم ویلایەتانە لە راستیدا ئەرمەنی بوون (بە گوێرەی ئامارەکانی ئێستای دەوڵەتی عوسمانی). ئەم بانگەشە زیادەڕۆیانە خەسارێکی بەرچاوی لە پێوەندییەکانی نێوان ئیمپراتۆری عوسمانی، کوردو ئەرمەنییەکاندا. ئەو کاتە حەشیمەتی سیواس زۆرتر تورك بوون و ٨٠ ٪ی حەشیمەتی ٥ ویلایەتی دیکە کورد بوون. بەهەرحاڵ رەوشەکە بە هۆی نیگەرانی رووسیا، بریتانیا و فەڕەنسا لە مەڕ ئازادکردنی مەسیحییەکانی باڵکان لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی ئاڵۆزتر بوو.

زۆربەی کوردەکان کەوتنە ناو رەوشێکی زەحمەت. کورد لەو رێفۆرمە بەدی نەکراوانە کە تەنها بۆ قازانجی کەمینەی ئەرمەنی داڕێژرا بوون، بێبەشکران و پشتگوێ خران لەبەرئەوەی کە ئەرمەنییەکان و مەسیحییەکان پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کە کورد کۆمەڵێك عەشیرەتی تالانچین. یەکێك لە هۆیەکانی دیکە ئەوە بوو، کە کورد موسڵمان بوون و بە خەلافەتی تورکیاوە گرێدراوبوون و دەسەڵاتداری تورکەکانیان لە دەسەڵاتداری ئەرمەنییەکان بە باشتر دەزانی. لەگەڵ ئەمەشدا کورد خۆیان بە نەتەوەیەکی جودا دەزانی، هەر بۆیە چەند جار لە





سەدەی ١٩ لە دژی دەسەڵاتداری عوسمانی راپەڕینیان کرد. یەکێك لە گرینگترینی ئەم راپەڕینانە، لە میانەی شەڕی کریمە لە ساڵەکانی ١٨٥٣-١٨٥٥ روویدا کە رێبەرەکەی بەزدانشێر بوو کە بتلیس، موسڵ و پاشان تەواوی ناوچەی نێوان وان و بەغدادی گرت، بەڵام دواتر بە خیانەتی" نەمرود راسم" کە پیاوی کونسولگەری بریتانیا بوو، دەستگیرکرا.

پاش هەرەسهێنانی عوسمانی لە شەڕ لەگەڵ رووسیا لە ساڵی ١٨٧٨، رووسیا بە گوێرەی یاسا و مەرجەکانی پەیماننامەی سان ئیستیفانۆ، سەربەخۆیی بەخشی بە رۆمانیا و بولغارستان. ماددەی ١٦ی ئەم پەیماننامەیە دەیگوت دەبێ لە پارێزگا ئەرمەنینشینەکانی رۆژهەڵاتی عوسمانی چاکسازی بکرێت و دەسەڵاتی عوسمانی بەسەر کوردەکان دەستەبەر بکرێت، بەڵام زۆرتر بە هۆی ئەوە کە بریتانیا هۆگری ئەوە بوو، کە عوسمانی بکەوێتە ژێر چەتری پارێزگاری رووسیا، پەیماننامەی بەرلین لە هەمان ساڵدا (١٨٩٨) جێگای پەیماننامەی"سان ئیستیفانۆ"ی گرتەوە. ماددەی ٦١ی "پەیماننامەی بەرلین" جەختی لەسەر وشە بە وشەی ماددەی ١٦ی پەیماننامەی "سان ئیستیفانۆ" کردەوەو ئەوەی زیاد کرد کە دەبێ دەوڵەتی عوسمانی، چاودێریکردنی زلهێزەکان بەسەر پێشوەچوونی رفۆرمەکان لە ٦ ویلایەتی رۆژهەڵاتی تورکیا قەبووڵ بکات. سوڵتانی عوسمانی نەیدەویست ئەم رێفۆرمە سەپێندراوانە ئەنجام بدات. کاتێك کە گ. ج گوشین، دیپلۆماتی پایەبەرزی ئەورووپا لە یادداشتنامەیەك لە ١١ی حوزەیرانی ١٨٨٠ داوای لە دەوڵەتی عوسمانی کرد تا لەمەڕ پێشوەچوونی رفۆرمەکان راپۆرت بدات، وەڵامێکی ٦ لاپەڕەیی لە ٥ی تەمموزی لە لایەن وەزیری باڵا، عابدین پاشا بەدەست گەیشت. گرینگی وەڵامەکەی عابدین پاشا لەوەدا بوو کە دەوڵەتی عوسمانی ئەوەی قەبووڵ کردبوو کە لەمەڕ رفۆرمەکان لە پارێزگاکانی کوردستان و ئەنادۆڵی کە ئەرمەنی تێیاندا دەژیان، زلهێزەکان ئاگادار بکاتەوە. بەهەرحاڵ هەروەها کە وڵامەکەی عابدین پاشا نیشان دەدات هیچ پارێزگایەکی ئەرمەنینشین لە عوسمانیدا بوونی نەبوو، بەڵکو عوسمانی لە دوو کیانی کوردستان و ئەنادۆڵی پێکهاتبوو. کوردستان لە کاتی بە دەسەڵات گەیشتنی رێژیمی کەمالیست لە تورکیا، بوو بە "ئەنادۆڵی رۆژهەڵات"، هەروەك باشووری کوردستان کە پاشان بوو بە باکووری عێراق.

لە حاڵێکدا کە ئەم ئاڵوگۆڕە دیپلۆماتیکانە روویان دەدا، کورد بە ئامانجی سەربەخۆیی کوردستان دەستیان کرد بە راپەڕینی چەکداری لە کوردستانی تورکیاو ناوچەکانی باکووری کوردستانی ئێران. رێبەری ئەم راپەڕینە، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری و شەمزینان، سەرۆکی

ڕێکخراوی "یەکێتی کورد" بوو کە لە بەیاننامەیەکدا بە راشکاوی رایگەیاند، کە کورد نەتەوەیەکی جیاوازە[*]. شێخ عوبەیدوڵڵا کۆپییەك لەم بەیاننامەیەی نارد بۆ زلهێزەکانی رۆژئاوا و هەوڵی دا ئاسایشی کەمینە مەسیحییەکان لە کوردستان گارانتی بکات، بەڵام هەروەها کە "رابرت ئولسۆن" ئاماژەی پێدەکات، زلهێزەکان بە تایبەت رووسیا هەر وەك ئێران و تورکیا دژی سەربەخۆیی کوردستان بوون[١]. ئولسۆن دەڵێت:

"لە کۆتایی یەکەم قۆناخی ناسیۆنالیزمی کورد، هەموو زلهێزەکانی ئەورووپا، هەر بەو شێوەیە کە لە پەیماننامەی برلیندا جەختیان لە سەری کردبووە، دژی بزووتنەوە سەربەخۆخوازەکانی کوردستان بوون. رووسیا نەیدەویست ئەو سەرزەمینە زۆرتر کوردنشینانەی رۆژهەڵاتی تورکیا لە دەست بدات، کە بە گوێرەی پەیماننامەی برلین بە دەستی هێنابوون و خوازیاری ئەوە نەبوو کە حکوومەتێکی کوردی (بە تایبەت جۆرە حکوومەتێك کە بەگوێرەی ئایینی تەریقەتی نەقشبەندی هان درابێت) لەسەر سنووری قەفقازی ئەو وڵاتە دابمەزرێت. رووسیا بە هۆی بزووتنەوەگەلێکی وەها، لەگەڵ شا ئیسماعیلی سەفەوی لە دەیەی ١٨٤٠ کێشەی هەبوو".

بەهەرحاڵ راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵا هەرەسی هێنا. خودی شێخیش لە ساڵی ١٨٨١ زیندانی کراو بۆ مەککە دوورخرایەوە.

لە ساڵی ١٨٩١، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (کە ساڵی ١٨٧٨وە ببوو بە سوڵتانی عوسمانی) سوپای سوارەی حەمیدیە (حەمیدییە حافیف سوواری ئالایلاری) ی دامەزراند کە بە تەواوی لە سەرباز و ئەفسەرە کوردەکان پێکهاتبوو کە کوڕی سەرۆك عەشیرەتەکان بوون و لە ئاکادیمیای سەربازی ئەستەنبوڵ مەشقیان پێکرابوو. پێکهاتنی ئەم سوپایە ناکۆکی لە نێوان کوردەکان دروستکرد، لەبەرئەوە کە تەنها موسڵمانە سوننەکان لە سوپادا وەردەگیران و عەلەوییەکان وەرنەدەگیران. بە بیروبۆچوونی "ئولسۆن"، عەبدولحەمید لە سوپای "حەمیدییە" وەك ئامرازێك بۆ

* ئاماژەیە بەو نامەیە کە شیخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە ساڵی ١٨٨٠ بۆ کۆنسولی بریتانیا نووسیویەتی و جەختی لە سەر ئەوە کردووەتەوە کە "نەتەوەی کورد تەنەوەیەکی جودایە، ئایینی لەگەڵ ئایینییەکانی دیکە جیاوازە و داب و نەریتی لەگەڵ داب و نەریتەکانی دیکە جیاوازە. ئیمە دەمانەوێت خۆمان کاروباری خۆمان بەڕێوە ببەین واتا هەموو کوردستان خۆی خاوەن دەسەڵات بێت، لەبەر ئەوە کە لەمە زیاتر ناتوانێت شەرارەت و زڵم و زۆرداری و قەسد و نیازە چەپەڵەکانی دەوڵەتی ئێران و عوسمانی تەحەمول بکات (وەرگێڕ).

١ـ جەلیل جەلیل، راپەڕینی کوردی ١٨٨٠، موسکۆ، ١٩٦٦ (بە زمانی رووسی)، بێروت، ١٩٧٩ (بەزمانی عەرەبی). دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی BLU، لەندەن، ١٩٨١ (بە زمانی ئینگلیزی).



پێکەوە گرێدانی ئیمپراتۆری عوسمانی لەگەڵ ریشە ئیسلامییەکانی لە پێناو بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ رووسیا و ئەرمەنییەکان (کە پاش ساڵی ١٨٧٨ هێرشەکانیان زۆرتر ببوو) و هەروەها لە کوردەکان وەك هاوسەنگییەك لە نێوان مەزنە شارنشینەکان و میرنشینەکان کەڵکی وەردەگرت.

سوپای حەمیدییە بەرپرسیاری کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لە ساڵی ١٨٩٥ بوو، هەروەها لە شەڕی باڵکان و شەڕ لەگەڵ سوریا بەشداریکرد. هەتا ساڵی ١٩٨٥، ٥٧ یەکینەی حەمیدییە دامەزران کە هەرکامیان لانیکەم ٥١٢ پیاو و بە گشتی نزیکەی ٥٠ هەزار سەربازی لەخۆ دەگرت کە راستەوخۆ لە ژێر فەرماندەیی سوڵتاندا بوون و بە تەواوی لە سوپای عوسمانی جودا بوون. ژمارەی سەربازانی حەمیدییە لە سەردەمی حکوومەتی "تورکە جوانەکان" لە ساڵی ١٩١٠ بۆ ٦٤ هەزار کەس زیادی کرد. بە وتەی "ئولسۆن" لە ساڵی ١٨٤٧ (واتا ئەو کاتە کە میرنشینی بۆتان کە لە ژێر دەسەڵاتداری بنەماڵەی بەدرخاندا بوو، رووخا) تا ئەو کاتە ئەوەندە هێزو دەسەڵاتی کوردەکان کۆ نەبوبووەوە.

سەردەمی حەمیدییە پێشمەرجێکی پێویست بوو بۆ سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کورد و قۆناخی سێیەمی پێشکەوتنی ئەم ناسیۆنالیزمەی پێکهێنا. حەمیدییە یارمەتی بە پێکهاتنی هەستی هاوخەمی لە نێو کوردە سوننەکاندا و دەرفەتی رێبەرایەتی زۆری بۆ گەلێ لە کوردە جوانەکان رەخساند. "حەمیدییە" هەروەها زانیاری تکنۆلۆژیی سەربازیی و کەرەستە سەربازییەکان و شێوازی کەڵکوەرگرتن لەم کەرەستانەی بۆ کوردەکان دابینکرد و ئەمە راستە کە گەلێ لە رێبەرانی سەرهەڵدانی شێخ سەعید (کە کوردە عەلەوییەکانی باکوور بە دەگمەن بەشداریان تێدا کرد) ئەفەسەرانی پێشووی"حەمیدییە" بوون.

وەڵامی ئەرمەنییەکان بە کۆمەڵکوژییەکانی ١٨٩٥ــ١٨٩٦، قڕکردنی کوردەکان لە ئەرمەنستان و باکووری کوردستان لە میانەی هێرشی رووسیا لە بایەزید، ئەرزەرۆم، ئەلەشکیرت، وان، بتلیس، موش و ناوچەکانی باشووری رووباری ئاراس لە ساڵی ١٩١٤ـ١٩١٥ بوو.

مێژوونووسی کورد، موحەممەد ئەمین زەکی (١٨٨٠ـ ١٩٤٨) کە خەڵکی سلێمانی بوو و وەك ئەفسەری ستاد لە سوپای عوسمانی خزمەتی کردبوو، ئاماژە بە کۆمەڵکوژییە مەزنەکانی حەشیمەتی کورد لەم ناوچانە بە دەستی گرووپە چەکدارە تەیارەکانی ئەرمەنییەکان - کە پێشەنگی هێزەکانی سوپای رووسیا بوون- دەکات[٢]. زەکی هەروەها ئاماژە بە کۆمەڵکوژی

٢ـ موحەممەد ئەمین زەکی، "کورتەیەك لە مێژووی کورد و کوردستان"، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی دارالاسلامی، بەغداد، ١٩٣١، بە زاراوەی سۆرانی، وەرگێڕان بۆ عەرەبی، عەونی موحەممەد عەلی، قاهیرە، ١٩٣٦ (چاپی نوێ، لەندەن، ١٩٦١).

کوردەکان بە دەستی هێزەکانی ژێر فەرماندەیی ئەفسەرە تورکەکان کە لە ئایدیۆلۆژی پانتۆرانیزم ئیلهامیان دەگرت، دەکات. ئەم رووداوانە و قاتوقڕی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە پەتاکان و دەرکردنی کوردەکان، پاڵ بە زەکییەوە دەنێت تا ژمارەی کوژراوە مەدەنییەکانی کوردەکان ٥٠٠ هەزار کەس بەراورد بکات. شایانی ئاماژەپێکردنە کە بەرپرسیارە سەرەکییەکانی کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لەم سەردەمەدا (١٩١٦-١٩١٥) واتا تەلعەت پاشا، ئەنوەر پاشا و جەماڵ پاشا ئەندامی کۆمەڵەی پانتورانیستی" یەکێتی و پێشکەوتن" (ئیتیحاد و تەرەقی جەمعیەتی) بوون.

هەرچەند کە سیاسەتی رووسیا دژی سەربەخۆیی کوردستان بوو، بەڵام شاری سەنپیترزبورگ لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩ بەملاوە بوو بە مەڵبەندی توێژینەوە کوردییەکان. دامەزرێنەری ئەم ناوەندە توێژینەوەیە هەتا ئەو جێگایە کە دەزانین، میسیۆنێری پێشوو، "پادرۆما ورۆزیۆ گارزۆنی" بوو کە کتێبی رێزمانی کوردی لە ساڵی ١٧٨٧ لە رۆم و فەرهەنگی بەراوردکاری پاڵاس (کە چەند سەد وشەی کوردی لەخۆدەگرت)ی بە یارمەتی کاترینی مەزن لە هەمان ساڵدا بڵاوکردەوەو بناخەی توێژینەوەکانی دواتری لە لایەن توێژینەرە رووسی، ئاڵمانیو فەرانسەوییەکان دامەزراند. زۆربەی ئەم بەرهەمانە بە یارمەتی ئاکادیمیای زانستەکانی ئیمپراتۆری بڵاوبوونە، کە یەکێك لە ئەندامەکانی، ژابا، کۆنسولی پێشووی رووسیا لە ئەرزەرۆم بوو کە کتێبێکی دەربارەی کوردەکان لە ساڵی ١٨٦٠ بڵاوکردەوە. ژابا هەروەها فەرهەنگێکی کوردی ـ فەرەنسەوی و کتێبێکی گفتوگۆ بە زمانی کوردی و فەرهەنگێکی فەرەنسەوی ـ رووسی ـ کوردی نووسی. لێکۆڵەری ئەڵمانی، پیتر لیرخ هەڵبژاردەیەك لە دەقە کوردییەکانی بە ناوی forschungen uber die kurdan لە ساڵی ١٨٥٧ لە سەنپیترزبورگ بڵاوکردەوە کە لەو دەقانە پێکهاتبوو کە "لیرخ" لە میانەی شەڕی "کریمە" لە بەندکراوە کوردەکان (کە بۆ ئەم مەبەستە لە کەمپێك لە سمۆلینسك راگیرابوون) کۆی کردبوونەوە. فردیناند جۆستۆ، کتێبێکی بە ناوی رێزمانی کوردی لە ساڵی ١٨٨٠و "ئی پریم" و ئالبێرت سۆسین کتێبێکیان بە ناویKurdische sammlungen لە ساڵی ١٨٩٠ بڵاوکردەوە.

رەنگە گرینگترین بەرهەمێك کە لەمەڕ کورد لە سەنپیترزبورگ بڵاوبووەتەوە، کتێبی مێژووی کورد بە ناوی "شەرەفنامەیە" کە لە ساڵی ١٥٩٦ لە لایەن شەرەفخان (میری بتلیس، موش، خینیس و ئەخلات) نووسراوە. ئەم کتێبە کە بە زمانی فارسی نووسراوە، مێژووی ٥ سەدە لە خۆ دەگرێت، کەوابوو مێژووی سلسلە حاکمە مەزنەکانی کوردستان نەناسراو ماوەتەوە. بەرگی دەستنووسی ئەم کتێبە کە لە ساڵی ١٥٩٩ لە کتێبخانەی سەلتەنەتی



سەفەوی لە ئەردەبیل بە دەستی خودی شەرەفخان نووسراوە و هەڵەچنی کراوە و ئیمزاکراوە پاش شەڕی ئێران و رووسیا لە ساڵی ١٨٢٨ وەك بەشێك لە دەسکەوتەکانی رووسیا برا بۆ سەنپیترزبورگ. دەقی فارسی ئەم کتێبە بە پێداچوونەوەو پێشەکیی ئاکادیمیسیەنی رووسی، ویلادیمیر زیرنۆڤ لە ژێر ناوی "شەرەفنامە یان مێژووی کوردەکان" لە ساڵی ١٨٦٠ بڵاو بووەوە. هەروەها دەقی فەرەنسەوی ئەم کتێبە لە چوار بەرگ لە ژێر ناوی "شەرەفنامە" یان fastes de la nation kourde لەگەڵ پێشەکی و هەڵەچنی و پێداچوونەوەی فرانشیز شارمۆی لە ساڵەکانی ١٨٦٩ـ١٨٧٥ لە سەنپیترزبورگ بڵاوبووەوە.

ئەم بووژانەوەی توێژینەوە کوردییە ئاکادیمیکەکان و کولتووری کورد-کە هەتا ئەو شوێنەی کە پێوەندی بە لێکۆڵەرەکانەوە هەبوو، بێلایەنانە ئەنجام دەدرا- رەنگدانەوەی روونی زێدەخوازییە سەرزەمینییەکانی رووسیا بوو، کە لە هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری ئێرانو عوسمانیو گەیشتن بە ئاوە گەرمەکانی[کەنداو]و ئازادکردنی کەمینە مەسیحییەکان رەنگیدەدایەوە. سەربەخۆیی کوردستان هیچ شوێنیکی لەم زێدەخوازییانەی رووسیادا نەبوو و ئەو هاندانانەش کە جارناجار ئەنجام دەدرا، پتر لە هەلێك بۆ جێبەجێکردنی ئەم زێدەخوازیانە نەبوو.

## لە لینین تا برێژنێڤ

کاتێك کە بولشڤیکەکان لە تشرینی دووەمی ١٩١٧ دەسەڵاتیان لە پترۆگراد گرتەدەست، رووسیا هێشتا لە شەڕ لە دژی ئەڵمانیا و تورکیا هاوپەیمانی بریتانیا و فەرەنسا بوو. ئەم هۆکارە، ناتوانایی دەوڵەتی نوێی بۆ پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری ئیمپراتۆری رووسیادا پتەوتر کرد. زۆربەی ئەم سەرزەوییانە، لەوانە قەفقاز و ئاسیای ناوەڕاست، لە سەروبەندی ئەوەدا بوون، کە سەربەخۆیی خۆیان رابگەیەنن. لە ١١ی تشرینی دووەم، سێ رۆژ پاش بە دەسەڵات گەیشتنی بولشڤیکەکان، ئەنجومەنی نیشتیمانی قەفقاز پێکهات. ئەم ئەنجومەنە نوێنەری نەتەوە جۆراوجۆرەکانی لە دەوری یەك کۆکردەوە: گورجییەکان کە زۆرتر لایەنگری حیزبی منشڤیکەکان بوون، ئەرمەنییەکان کە ئەندامی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی تاشناك بوون و تاتارەکان کە سەر بە گرووپی کۆنەپارێزی موساوات (یەکسانی) بوون. هەندێك لە کوردەکان-یش تەڤلی ئەم بزووتنەوانە بوون[٣].

٣ـ پێکهاتەی ئیتنیکی قەفقاز ئاڵۆز بوو. هەتا ساڵی ١٩١٧، حەشیمەتی گورجییەکان، یەك ملیۆنو ٤٠٠هەزار کەس بوو، کە زۆربەیان لە ناو خودی گورجستاندا دەژیان. حەشیمەتی ئەرمەنییەکان یەك ملیۆن و

له ٢٢ی نیسانی ١٩٨٨، ئەنجوومەنی نیشتیمانی قەفقاز، دامەزرانی "کۆماری دیموکراتی فیدراڵی قەفقاز"ی راگەیاند و مانگێك دواتر تەسلیمی ناکۆکی نێوان ئیتنیکەکان بوو. گورجستان بە هاندانی ئەڵمانیا لە ٢٢ی گولان، سەربەخۆیی خۆی راگەیاند و رۆژێ دواتر، ئازەربایجانیش بە پشتیوانی تورکەکان (ئەو کاتە ئەنوەر پاشای عوسمانی لە باکۆ بوو) سەربەخۆیی خۆی راگەیاند. لە ٣٠ی گولان ئەنجوومەنی نەتەوەیی ئەرمەنستان لە تفلیس بانگەشەی پارێزگا ئەرمەنییەکانی کرد، بێ ئەوەی وردەکارییە تایبەتەکانی ئەم سەرزەوییانە بخاتەڕوو، گورجستانیش دەستبەجێ لەمەڕ گرتنی تفلیس، ئولتیماتۆمیدا. پاشان دەوڵەتی ئەرمەنی تاشناك خۆی لە ئێریڤان جێگیر کرد و پاش ماوەیەکی کورت کەوتە بەر هێرشی هێزەکانی عوسمانی کە شاری ئەلیکساندرپۆل (لنینکانی نوێ)یان گرتبوو.

لە ساڵەکانی ١٩١٨ـ١٩٢٠ کۆماری ئەرمەنستان سەر لەنوێ لە دایك بۆوەو بە هۆی کۆمەڵێك ناکۆکی کە بە هۆی بەرەنگاربوونە لە بەرامبەر داگیرکەران و کۆمەڵکوژی کەمینەکان بەرفراوان بوو، ئاڵۆز بوو. ئارام مانوکیان پاش ئەوە کە وەك سەرۆکێکی راستەقینە دانرا، توانی توانابییەکانی ئەفسەرە ئەرمەنییەکان کە لە رووسیا مەشقیان پێکرابوو، بخاتەگەڕ تا کۆمەڵێك هێرشی تۆڵەسەندنەوە دژی گوندە کورد و ئازەرینشینەکان لە بەهاری ساڵی

---

٧٠٠ هەزار کەس بوو کە نزیکەی یەك ملیۆنیان لە قەفقاز دەژیان. حەشیمەتی تاتارەکان کە ژمارەیەکی زۆریان لە ئەرمەنستان دەژیان، نزیکەی دوو ملیۆن بوو. تاتارەکان لە دوای ساڵی ١٩٢٠ بە ئازەری لە قەڵەم دران و حەشیمەتی موسڵمانی تورکزمانی قەفقاز و ئازەربایجانیان پێکهێنا.

بە گوێرەی ئامارەکانی رووسیا لە هەمان سەردەمدا، حەشیمەتی پارێزگای ئێریڤان لە ساڵی ١٩١٦، بە گشتیی ١/٢٢٠/٢٤٢ کەس بووە کە لە ٦٦٩/٨٧١ ئەرمەنی، ٣٧٣/٥٨٢ تاتار، ٣٦/٥٠٨ کورد، ١٦/١٠٣ رووس و ١٢/٦٤٢گیپسیز پێکهاتووە. ئێریڤان-ی پایتەخت هەتا رادەیەك بچووك بوو و حەشیمەتەکەی نزیکەی ٣٠ هەزار کەس بوو. حەشیمەتی باکۆ ٢٦٠ هەزار کەس بوو کە ٧٩ هەزاری رووس و ٦٩/٣٠٠ی تاتار (زۆربەیان کرێکارو هونەرمەند بوون) و ٦٣ هەزار ئەرمەنی (کە زۆرتر لە بەشی پیشەسازیو بازرگانی کاریان دەکرد) بوون. تفلیس لە ساڵی ١٨٧٩ بە گشتی ١٥٩ هەزار کەس بوو، کە نزیکەی ٦٠/٥٠٠کەسیی ئەرمەنی و ٤٢ هەزار کەسیی گورجی و ٣٩ هەزار کەسیی رووس بوون. لە ساڵی ١٩١٦ پارێزگای نەخجەوان بەگشتیی ١٣٥ هەزار کەس حەشیمەتی هەبوو کە ٥٤ هەزاری ئەرمەنی و ٨١ هەزاری کورد و تاتار بوون (ئاناهید ترميناسيان، La republique de armenie، پاریس، ١٩٨٩. C F. Y. Terhom La cause armenienene، پاریس، ١٩٨٢).





١٩١٨ بەڕێوەببەن. ئەم هێرشانە لە دژی ئەو ناوچانە بەڕێوە دەچوون، کە ئەرمەنییەکان تێیاندا کەمینە بوون. لە هاوینی هەمان ساڵ ژنەڕاڵ ئاندریانیچ درێژەی بە هێرشکردنە سەر کۆمەڵگا موسڵمانەکاندا. لە تەمموز هەتا ئەیلوولی ١٩٢٠ "روبین ترميناسيان" کە ئەرمەنییەکی خەڵکی تورکیاو وەزیری پاراستنی ئەرمەنستان بوو، خەباتی لە دژی موسڵمانەکانی گرتە ئەستۆ، هەرچەند کە بەیاننامەیەکی دەرکرد و تێیدا ستایشی بوێری و دڵاوەری کوردەکانی کردو شانازی بە قوربانییە کوردانەوە کرد.

نزیکەی ١٨ مانگ پێش لە دەستپێکردنی ئەم خەباتە، واتا لە سەرەتای ساڵی ١٩١٨، ئەنوەر پاشا، نووری پاشای برای نارد بۆ باکۆ. ماوەیەکی کورت پاش گەیشتنی نووری پاشا، راپەڕینێکی گشتیی دژی رووسیا و ئەرمەنییەکان روویداو ئازەربایجان، کۆمارێکی سەربەخۆی راگەیاند. چەند مانگ دواتر، لە ١٥ی ئەیلوول، سوپای عوسمانی باکۆی داگیر کرد و تەنها پاش ئیمزاکرانی" پەیماننامەی مودرۆس" بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕ لە ٣٠ی تشرینی یەکەم و هەرەسهێنانی ئیمپراتۆری عوسمانی لە شەڕی یەکەمی جیهان بوو، کە سوپای عوسمانی لەگەڵ هێزەکانی دیکەی تورکیا پاشەکشەیان کردو سەربازانی بریتانیا کە بەرژەوەندی بریتانیایان لە چاڵە نەوتەکانی باکۆ دەپاراست، شوێنی هێزە داگیرکەرەکانی عوسمانییان لە ئازەربایجان گرتەوە. لەم دۆخ و هەلومەرجەدا موستەفا کەمال کە لەوپەڕی دەسەڵاتی خۆی لە تورکیا بوو، بە ئامانجی بەرەنگاریکردن لەگەڵ ئیمپریالیزمی رۆژئاوا بە شوێن ئەوەدا بوو کە لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەت ببێ بە هاوپەیمان. موستەفا کەمال لە ساڵی ١٩١٩ دوو نوێنەر، خەلیل پاشا (مامی ئەنوەر پاشا) و فوئاد سابی بۆ وتووێژی زیاتر نارد بۆ باکۆ. ئەم وتووێژە، رێککەوتننامەی تورکیا و رووسیای لە ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩١٩ لێکەوتەوە کە بە پێی ئەوە، سۆڤیەت بەڵێنیدا بە پارەو چەك پشتیوانی لە رێژیمی نوێی تورکیا بکات.

لە بەهاری ١٩٢٠، لقێکی حیزبی شیوعیی تورکیا بە سەرۆکایەتی موستەفا سۆفی کە یەکێك لە ئەندامانی رێبەریی حیزبی شیوعی لە تورکیا بوو، دامەزرا و زۆرتر بە هۆی هەوڵەکانی ئەم حیزبە، ئازەربایجان لە ٢٧ی نیسان بێ هیچ نەیارەتییەك بوو بە کۆمارێکی سۆڤیەت. گورجستان-یش لە ٧ی گولانی ١٩٢١ بوو بە ئەندامێکی تەواوی یەکێتی سۆڤیەت. لە ١٩ی تەمموزی ١٩٢٠ وەزیری دەرەوەی تورکیا، بیکۆ سامی، بە سەرۆکایەتی لێژنەیەك چوو بۆ موسکۆ و لە ٢٤ی ئاب، دوو حەوتوو پاش ئیمزاکرانی پەیماننامەی "سیڤەر"، رێککەوتنێك لە نێوان سۆڤیەت و تورکیا بەسترا. لە مانگی ئەیلوول، هێزەکانی تورکیا هێرشیانکردە سەر

ئەرمەنستان و بە هاوکاری ناڕاستەوخۆی سۆڤیەت، ئەلیکساندرپۆل-یان داگیرکرد. لە ئەنجامدا حیزبی" تاشناك" لەگەڵ نەیارییەتییەکی دوو لایەنە بەرەوڕوو بووەو دەسەڵاتی بە سەر ئێریڤان دا نەما و هەتا ٢٩ی تشرینی دووەم، ژیانی کۆماری سەربەخۆی ئەرمەنستان کۆتایی پێهات. سێ ڕۆژ دواتر ئەرمەنستان بوو بە کۆمارێکی یەکێتی سۆسیالیستی سۆڤیەت.

## کوردستانی سوور

لەم سەردەمەدا، زۆربەی دانیشتووانی ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئازەربایجان کە دراوسێی ئەرمەنستان بوون، کورد بوون. زۆربەی ئەم کوردانە، جووتیار و بازرگانی شارنشین بوون و وەك سوننە لەگەڵ ئازەرییە شیعەکاندا ململانێیان دەکرد. کورد لە شاری کەوناری گەنجە بە تەواوی تاویاببوونەوە، بەڵام لە ناوچەکانی هەڵکەوتوو لە ٤٠ کیلۆمەتری باشووری ڕۆژئاوای گەنجە-کە لە رووباری ئاراس و سنووری ئێران هەتا ناوچەی "ناگۆرنی قەرەباخ" درێژ بوو-نەتاوببوونەوە. ئەم سەرزەمینە کە نزیکەی ٥٢٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە بوو، بە تەواوی کوردنشین بوو، پایتەختەکەی "لاچین" بوو و شارە سەرەکییەکانی کەلباژار، کوباتلی، زەنگەلان بوون و قەزاکانی قەرەقوشلاق، قوتورلی، مورادخانلی و کوردحاجی لەخۆدەگرت. لەم سەرزەمینەدا بوو کە دواتر ناوچەی خودموختاری کوردستان کە لە ناو کوردەکان بە "کوردستانی سوور" ناسراوە، پێکهات.

یەکێك لە هۆیەکانی پێکهاتنی ئەم ناوچەیە، نامەیەك بوو کە شێخ مەحموودی بەرزنجی، ڕێبەری بزووتنەوەی نەتەوەیی باشووری کوردستان (کوردستانی عێراقی ئەمڕۆ) ناردبووی بۆ لنین و تێیدا داوای لە سۆڤیەت کردبوو، کە لە خەبات دژی ئیمپریالیزمی بریتانیا یارمەتی بدات و سەرنجی (لنین) ی بەرەو لای گرینگی مەسەلەی نەتەوەیی کورد لە ڕووی ناونەتەوەییەوە، ڕاکێشابوو[٤]. لنین لە وەڵامدا ئاگاداری خۆی لەمەڕ مەسەلەی کورد و گرینگی دەوری کوردەکانی سۆڤیەت دەربڕی بوو. لەمە زیاتر، کوردستانێکی خودموختار دامەزراو ٤٠ ملیۆن روبل پارە بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرا.

ناوچەی قەرەباخ پێش ساڵی ١٩١٧ بە ٧ قەڵەمڕەوی موسڵمان، ٤ قەڵەمڕەوی کورد و ٣ قەڵەمڕەوی ئازەری دابەشکرابوو کە کەمینەی مەسیحی "ناگۆرنی قەرەباخ" لەگەڵ ژمارەیەکی

٤ـ س ك محۆیی، "پرسی کورد لە ئازەربایجانی سۆڤیەت" کە بە زمانی رووسی بڵاوبووەتەوە و "باوێ نازێ" لە رووسی کردوویەتی بەکوردی و لە بڵاڤۆکی *بەربانگ*، ژمارەی ٥٩، ئابی ١٩٨٩ بڵاوی کردووەتەوە.



بەرچاو کورد و تاتار لە ناوەڕاستیدا هەڵکەوتبوون. بەهەرحاڵ پێگەی زۆرینەی ئەرمەنیی ناوچەی قەرەباخ لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٧و ١٩٢٠ پتەوکرا. لە سەرەتای دەسەڵاتداری سۆڤیەت، ئەم ناوچەیە لەگەڵ نەخجەوان بوو بە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوان ئەرمەنستان و ئازەربایجان و بارودۆخەکە بە هۆی نزیکبوونی ناوچە زۆرتر کوردنشینەکان لەگەڵ ئەم ناوچانە، ئاڵۆزتر بوو. بۆ دەوڵەتی سۆڤیەت سێ ساڵ درێژەی کێشا تا ناکۆکی نێوان ئازەری و ئەرمەنییەکان چارەسەر بکات. لە ساڵی ١٩٢٠ چارەسەرکردنی کێشەکە بۆ پاشان دواخرایەوەو سوپای سوور بەرپرسیارێتی ئیدارەی ناوچەی بەدەستهێنا. هەروەها لنین نامەیەکی نارد بۆ نەریمانۆڤ کە بە گوێرەی ئەوە دەبوایا "لاچین" بلکێندرابا بە ئازەربایجانەوە، بەڵام کاربەدەستانی باکۆ و ئێریڤان کۆمەڵێك بەڵێنی نایەکانگیریان لەم بارەوە دا.

لە ١٦ی ئاداری ١٩٢١ تورکیا و یەکێتی سۆڤیەت پەیمانی هێرش نەکردنە سەر خاکی یەکتریان ئیمزا کرد. دوو ساڵ دواتر لە ٤ی تەمموزی١٩٢٣ موسکۆ فەرمانیدا کە ناوچەی کوردنشین کە پایتەختەکەی"لاچین" بوو و ناوچەی "ناگۆرنی قەرەباخ" ببێ بە بەشێك لە ئازەربایجانی یەکێتی سۆڤیەت، سەرەڕای ئەوە کە هەردوویان ناوچەی خوموختار بوون. لە شوباتی ١٩٢٤ ناوچەی نەخجەوان-یش کە لە سێ لاوە لەگەڵ تورکیا، ئێران و ئەرمەنستان هاوسنوور بوو، لکاندرا بە ئازەربایجانەوە و بوو بە کۆمارێکی خودموختار. ئەم بڕیارانە ٥ ناوچەی پێکهێنا کە لە لایەن ڕۆژهەڵاتی نەخجەوانەوە بە شێوازی کەوانێك بە درێژایی رووباری ئاراس کێشرابوو. هەمووی ئەم ناوچانە خاوەن ناسنامەی ئیتنیکی جۆراوجۆر و ڕەوشی سیاسی جیاوازبوون کە ئەم ناحیانەی لە خۆ دەگرت:

١- نەخجەوان (کە ٥٥٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە بوو) وەکو ئامارەکانی سۆڤیەت نیشان دەدەن، زۆربەی دانیشتووەکانی کورد و ئازەری بوون و کەمینەی ئەرمەنی تێدا دەژیان.

٢- کەرتێکی باریکی ئەرمەنینشین لە باشوور کە ناوچەکانی کافان، گوریسو یاخەزگادزۆری لەخۆدەگرت.

٣- ناوچەی خودموختاری کوردستان کە ٥٢٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە بوو و لە چوار ناوچەی کوردنشین پێکدەهات.

٤- ناوچەی خودموختاری ناگۆرنی قەرەباخ (٤٤٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە) کە پایتەختەکەی ئیستیپانکارت بوو و زۆربەی حەشیمەتە ئەرمەنییەکەی لە نێوان ساڵی ١٩١٩و ١٩٢٠ لە ٧٠ لە سەد بۆ ٩٤ لە سەد زیادی کرد. ناوچەی دیکە، ئازەربایجان-ی یەکێتی سۆسیالیستیی سۆڤیەت بوو.

حاشا لەوە ناکرێت کە بە لەبەرچاوگرتنی پێکهاتەی ئیتنیکی ناوچە، باشتر ئەوە بوو، کە ناوچەی ناگۆرنی قەرەباخ وەك بەشێك لە ئەرمەنستان بمابایەوە، بەڵام لنین کە نەخۆش بوو و دواین ساڵی ژیانی خۆی تێپەڕ دەکرد، چارەنووسی ناوچەی خودموختاری کوردستانی سووری لە سەردەمی دەسەڵاتداری ستالین لەبەرچاو بوو.

هۆی ناڕاشکاوی لکاندنی ئەم ناوچەیە بە ئازەربایجان ئەوە بوو کە دەوڵەتی سۆڤیەت دەیویست پێوەندی دۆستانەی خۆی لەگەڵ ڕێژیمی کەمالیستی تورکیا بپارێزێ. مێژوونووسانی ئەرمەن، لەوانە ئاناهید تێرمیناسیان جەخت لەسەر ئەوە دەکەونەوە کە گەلێ ئامانجی سیاسی لە پشت ئەم مەسەلەیەوە هەبوو، کە سەرەکییترینیان، دامەزراندنی ئازەربایجانێکی مەزن بوو، کە لە دەریای خەزەر هەتا دەریای ڕەش درێژەی ببێ، هەروەها کە لێژنەی حیزبی "موساوات"ی ئازەری لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس لە ساڵی ١٩١٩ هەوڵیان بۆ دەدا. لەمە زیاتر، ئەمە هەنگاوێکی دیکەی ناسنامەی پانتۆرانی بوو. بەهەرحاڵ، شرۆڤەکارانی هەنووکەی ئەرمەنی دەوری پرسی کورد لەم میانەدا لە هەموو ڕوویەکەوە پشتگوێ دەخەن.

کوردستانی سوور توانی بۆ ماوەی دوو ساڵ واتا هەتا ساڵی ١٩٢٥ (ساڵی دەستپێکردنی ڕاپەڕینی کوردی شێخ سەعید لە تورکیا) لە نێو ئازەربایجاندا هەروەك ناوچەیەکی خودموختار بمێنێتەوە. لەم ناوچەیە لێژنەیەکی بەڕێوەبەری کوردی پێکهات، قوتابخانە کوردییەکان دامەزران، کۆلیژێکی پەروەردەی مامۆستا دامەزرا، کتێب بە زمانی کوردی چاپکران و کاتنامەیەك بە ناوی "سۆڤیەت کوردستان" بڵاو بووەوە.

ئەم خودموختاریە کورتخایەن بوو. لە ساڵی ١٩٢٩ دەوڵەتی باکۆ ڕەوشی کوردستانی لە ئویەزد (ناوچە) بۆ ئوگروك (ناحیە) کەمکردەوە کە نزمترین یەکینەی سەرزەمینی بۆ گەلە غەیرە ڕووسەکانی سۆڤیەت بوو. هەشت ساڵ دواتر خودموختاری کوردستانی سۆڤیەت بە تەواوی لە ناوبرا. هۆی سەرەکی ئەم لەناوچوونە ئەوە بوو کە وەك جارانی دیکە، سۆڤیەت دەیویست درێژە بە پێوەندییە باشەکانی خۆی لەگەڵ تورکیا (کە تووشی کێشەی ڕاپەڕینی کوردەکان ببوو) بدات.

بۆ پەی بردن بە ڕووداوە دواییەکان کە چ وەك تاکەکەس و چ وەك بنەماڵە، کاریگەرییان کردە سەر کوردەکان، لە جێی خۆیدایە کە ئاماژە بە وتووێژێك لەگەڵ نادر نادرۆڤ، ئەندامی کوردی ئاکادیمی زانستەکانی قەزاقستان بکەین کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٠ (٢٦ی کانوونی دووەم ـ ١ی شوبات) بە چەند زمانی بیانی لە بڵاڤۆکی "موسکۆ نیوز" بڵاوبووەوە. نادرۆڤ



لە سەرەتای وتووێژەکەیدا وەبیری هێنایەوە کە ناوچەی کوردستانی سوور لە ساڵی ١٩٢٣ بە فەرمانی کۆمیتەی ناوەندی لە ئازەربایجان دامەزراو ماوەیەکی کورت پاش ئەوە بوو بە ناحیەیەکی خودموختار کە پایتەختەکەی لاچین بوو. ڕێبەری یەکەمین دەوڵەتی ئەم ناوچەیە، گوسی گوجەڤ بوو. بڵاڤۆکی "کوردستانا سۆڤیەت" لەوێ بڵاودەبووەوە، کۆلیژێکی پەروەردەی مامۆستا لە شاری شوشا دامەزرا، لە قوتابخانەکاندا بە زمانی کوردی پەروەردە دەدرا و بەرنامە بە زمانی کوردی لە ڕادیۆ بڵاودەبووەوە. لە ساڵی ١٩٣٧ کوردەکان، لەوانە بنەماڵەی نادرۆڤ لە ئازەربایجان بۆ ئەرمەنستان دوورخرانەوە. لە ساڵی ١٩٤٤ کوردەکانی گورجستان-یش بۆ کۆلۆنیا تایبەتەکان، لەوانە سیبریا (کە نادرۆڤ سەرەتا لەوێ نیشتەجێ بوو) دوورخرانەوە*. هەروەها زۆربەی پیاوەکان لە یەك جیاکرانەوەو دوورخرانەوە کە هەتا ئێستاش چارەنوسیان دیار نییە.

لێرە دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کە دوورخستنەوەکانی ساڵی ١٩٣٧ هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ شەڕی دووەمی جیهان یان پێشبینی کردنی ئەم شەڕە نەبوو، هەروەها کە دوورخستنەوەکانی ساڵی ١٩٤٤ هیچ پێوەندییەکیان بەشەڕەوە نەبوو. ئەم دوورخستنەوانە لەگەڵ دوورخستنەوەکانی تاتارەکانی کریمە یان ئەڵمانیاییەکانی ڤۆڵگا جیاواز بوون. ئەم دوورخستنەوانە بە هاندانی سەرۆکی دەوڵەتی ئازەربایجان، میرجەعفەر باقرۆڤ کە پەیوەندیگەلێکی نزیکی لەگەڵ ستالین و OGPU هەبوو، ئەنجام دران. ئەمە لەوانەیە لە پێوەندی لەگەڵ کوردە دوورخراوەکانی ئازەربایجان ڕاست بێ،

---

* بەداخەوە گەلێ لە کوردەکانی سۆڤیەت بوون بە قوربانی ئەم شەپۆلی دوورخستنەوەیە بۆ سیبیریا، بە تایبەت لە سەردەمی دەسەڵاتداری ئیستالین. کوردەکان چوار جار (لە جولای ١٩٣٧، ژانوییەی ١٩٣٨، ئاداری ١٩٤٤ و بۆڤەمبەری ١٩٤٤) لە کۆمارە جۆراوجۆرەکانی سۆڤیەت بۆ سیبیریا دوورخرانەوە. هەندێ لەم کوردانە پاشان ڕێگەیان پێدرا بگەڕێنەوە بۆ زێدی پێشووی خۆیان، بەڵام زۆربەیان هەر لەوێ مانەوە و ئێستا بە گشتی نزیکەی ٥٠ هەزار کورد لەو هەرێمە دەژین. هەروەها دوابەدوای لە یەك هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت گەلێ لە کوردەکانی ئەرمەنستان و گورجستان (کە زۆربەیان ئێزدی بوون) بە هۆکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆ ڕوسیا، بە تایبەت ناوچەی "نۆویسبیریك" کۆچیان کردووە.

خۆشبەختانە ساڵی ٢٠٠٥ یەکەم قوتابخانەی کوردی لە شاری نۆویسبی بریسك Novosibirsk بۆ منداڵە کوردەکانی ئەم هەرێمە (کە زۆربەیان ئێزدین) کرایەوە. ڕێکخراوی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی "شەمس" ئەم پێشنیارەی خستووەتە بەر دەستی شارەداری شاری نۆویسبیریك، ویلادیمیر گۆرۆدیتسکی (Vladimir Gorodetski) و ئەویش پەسەندی کردووە. (وەرگێڕ)

بەڵام دیار نییە کە بۆ ئازەربایجان و گورجستان-یش ئەم کارەیان کرد. لەوانەیە ئەم کارەی ئەوان بە هۆی گوشارەکانی تورکیا بووبێ کە خۆیشی لە هەمان سەردەمدا کوردەکانی دەرسیم (تونجلی نوێ)ی لە ساڵەکانی ١٩٣٧ ـ ١٩٣٨ دووردەخستەوە. ئازەربایجان و تورکیا نە تەنها پێڕەوییان لە یەك سیاسەتی ئیتنیکی دەکرد، بەڵکو لە یەك ئامرازیش کەڵکیان وەردەگرت وەك تاواندنەوەی زۆرەملی کوردەکان، دەستێوەردان لە حەشیمەتی کوردەکان، نیشتەجێکردنی غەیرە کوردەکان لە ناوچە زۆرتر کوردنشینەکان، سەرکوتکردنی چاپەمەنیو لەناوبردنی زمانی کوردی وەك زمانی پەروەردە لە قوتابخانەکان. هەروەها لە تاکتیکە باوەکانی سۆڤیەتیش کەڵك وەردەگیرا، بۆ نمونە کەسایەتییە کوردە مێژووییەکان وەك شەرەفخانی بتلیسی و ئەحمەدی خانی و سلسلەی شەدادییەکان بە گشتیی بە ئازەری لە قەڵەم دەدران. ئەو کوردانەی کە لە کارتی پێناسەکەیاندا نووسرابوو کوردن، کاریان پێنەدەدرا. بەشی کوردی ئەنیستیتۆی توێژینەوەکانی رۆژهەڵات لە باکۆ لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ هەڵوەشایەوە، هەرچەند کە توێژینەوە کوردییەکان لە ناوەندە هاوشێوەکانی موسکۆ، لنینگرادو ئێریڤان بەردەوام بوو. هەروەها بڵاڤۆکی " کوردستانا سۆڤیەت " درێژەی بە بڵاوبوونەوە لە دەیەی ١٩٣٠ دا، بەڵام بە کوردی بڵاو نەدەبووە، بەڵکو بە زمانی تورکی و بە ئەلفوبێیەکی دەستکرد کە لە پیتی سیریلیك و رۆمی پێکدەهات بڵاودەبووەوەو ناوەرۆکەکەی هیچ پێوەندییەکی بە کوردەوە نەبوو و هەمووی لە بارەی زاستۆیا (سەردەمی دابەزین) بوو.

ئامارە رەسمییەکانی سۆڤیەت کە لە ساڵەکانی ١٩٨٩ــ١٩٩٠ لە لایەن ئازەربایجانی سۆڤیەت بڵاوبۆتەوە، نیشان دەدات کە ژمارەی کوردەکان لە ناو سنووری ئازەربایجان بە گوێرەی ئامارەکانی ٧٠ ساڵ پێش ئەوە، کەمی کردووە:

خشتەی ٢: ئاماری کوردەکانی ئازەربایجانی سۆڤیەت

| | |
|---|---|
| ١٩٢١ | ٣٢٧٨٠ |
| ١٩٢٦ | ٤١٠٠٠ |
| ١٩٣٩ | ٦٠٠٠ |
| ١٩٥٩ | ١٥٠٠ |
| ١٩٧٠ | ٥٠٠٠ |
| ١٩٧٩ | ٠ |
| ١٩٨٩ | ١٣٠٠٠ |



ئەم ئامارانە متمانەپێ نەکراون و بەدڵنیاییەوە ناڕاستن. ناکرێت ئاماری ساڵی ١٩٢٦ کە حەشیمەتی ناوچەی "کوردستانی سوور"یشی لەخۆگرتووە، ئەوەندە بێ، لە حاڵێکدا کە حەشیمەتی ساڵی ١٩٢١ تەنها ٨ هەزار کەس لە حەشیمەتی ساڵی ١٩٢٦ کەمتر بێو حەشیمەتی ناوچەی خودموختاری "کوردستانی سوور"ی لەخۆنەگرتبێ. هەروەها نالوێ حەشیمەتی کوردەکان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٩و ١٩٨٩ ئەوەندە کەم و زۆر بووبێ.

یەکێ لە هۆکارەکانی ئەم کەم و زیادبوونەی حەشیمەتی کوردەکان، سیاسەتە رەسمییەکانی دەوڵەتی ئازەربایجان بوو. بۆ نمونە کاتێك کە کوردەکانی سۆڤیەت لە بارەی لەناوبردنی کوردەکان (وەندابوونا کوردەکان) پرسیاریان لە کاربەدەستانی ئازەربایجان کرد، جوابیان درایەوە کە "ئەوان بە هۆگەلی ئابژکتیڤ تاویاونراونەتەوە"، واتا لەبەرئەوە کە ئەوان هەروەك ئازەرییەکان موسڵمان بوونە.

بەهەرحاڵ لە ساڵی ١٩٨٨، نزیکەی ١٠ هەزار لەم کوردە ونبووانە پاسپۆرتەکانی خۆیان تەسلیمی دەوڵەتی رووسیا کردەوە تا رەگەزەکەیان بکرێتەوە بە کوردی. پرۆفسۆر شاکرۆ محۆی مەزەندە دەکات کە لە ساڵی ١٩٩٠حەشیمەتی کوردەکان لە ئازەربایجانی سۆڤیەت لانیکەم ٢٥٠ هەزار کەس بووە و مامۆستا خالید دەرۆیشیان، ئیتنیکناسی کوردی دانیشتووی ئێریڤان، ئاماژە بە ئامارێکی ٤٠٠ هەزار کەسی دەکات. لە ساڵی ١٩٨٨ دەرۆیشیان نامەیەکی بۆ گۆرباچۆف نووسی و سکاڵای کرد کە کاربەدەستانی ناوچە رێگرییان لە لێکۆڵینەوەکەی لە "لاچین" کردووە. دەرۆیشیان توانی پرسیارەکانی خۆی لەگەڵ کوردەکانی "کەلباژار" بێنێتە گۆڕێ، لەبەرئەوە کە لە کاربەدەستانی رەسمی ناوچە داوای مۆڵەتی نەکردبوو. بەهەرحاڵ کۆمەڵگاگەلێکی دیکەی کوردەکان لە شوێنەکانی دیکەی ئازەربایجان وەك باکۆ، نەخجەوان و ناگۆرنی قەرەباخ دەژین.

بە وتەی بێنیکسۆن، زۆربەی کوردناسانی سۆڤیەت، ئاماری کوردەکانی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٢٦، ١٩٣٩و ١٩٥٩ بە ناتەواو دەزانن و ئاماژە بە هەڵسەنگاندنەکانی "ئاریستوا" دەکەن کە بە گوێرەی ئەوە، حەشیمەتی کوردەکان لە ساڵی ١٩٥٤، ١٦٠ هەزار کەس بووە. ئاماری ساڵی ١٩٣٩، ١٥ هەزار کوردی ئێزدی لەخۆگرتووە، لەحاڵێکدا کە ئاماری ساڵی ١٩٥٩، ٢١ هەزار کوردی لە ئەرمەنستان لەخۆگرتووەو ژمارەیان لە ساڵی ١٩١٦ تەنها لە پارێزگای ئیتریڤان (کە ناوچەیەك بوو کە نزیکەی لە سەدا ٥٠ی حەشیمەتی ئەرمەنییەکانی سۆڤیەتی تێدا دەژیان) زۆرتر لە ٣٦ هەزار کەس بووە.

تەنانەت ژمارەی کوردەکان لە ئازەربایجان زۆرتر بوو. ئامارەکانی ساڵی ١٩٧٩کە لە خشتەی ٢دا ئاماژەیان پێکراوە و لە بڵاڤۆکی ethniques en USSR processus بڵاوبووەتەوە، متمانەپێنەکراون. لەوانەیە پرسیار بکرێت کە چۆن حەشیمەتی کورد لە نێوان ساڵەکانی ١٨٩٧و ١٩٧٩ ئەوەندە کەمی کردووە، لە حاڵێکدا کە حەشیمەتی نەتەوەکانی دیکەی سۆڤیەت، ٤و هەندێك جار ٨ قات زیادی کردووە. لە سەردەمی دەسەڵاتداری تزارییەکان، حەشیمەتی کوردەکان لە نێوان ساڵەکانی ١٨٩٧ــ١٩١٦ هەتا رێژەی ٣٢ لە سەد زیادی کرد.

هەموو کوردەکانی قەفقاز کە دوورخرانەوە، بۆ هەمیشە لە کۆمارەکانی سۆڤیەت واتا قەزاقستان، قرقیزستان، تاجیکستان، ئوزبەکستان و سیبریا نەمانەوە، بەڵکو هەندێکیان پاشان توانیان بگەڕێنەوە بۆ قەفقاز. ژمارەی دوورخراوەکان دیار نییە. بە بیروبۆچوونی هەندێك، سەرجەم حەشیمەتی کوردستانی سوور دوورخراونەتەوە. ئەم ناوچەیە لە ناوچەی ناگۆرنی قەرەباخ مەزنتر، بەپیتترو پڕ حەشیمەتترەو کەمتر شاخاوییە. بە سەرنجدان بە زیادبوونی حەشیمەتی ناوچە لە هەمان سەردەم و ئەو راستییە کە حەشیمەتی ناگۆرنی قەرەباخ لە ساڵی ١٩٩٠ نزیکەی ١٩٠ هەزار کەس بووە، چوار ناحیەکەی کوردستان دەبێ ٣٠٠ هەتا ٣٥٠ هەزار حەشیمەتی بووبێ کە ٢ لە ٣یان کورد بوونە. هەروەها لە قەفقاز ژمارەی کوردەکان دەبێ نزیکەی یەك ملیۆن (لەوانە تەنها ٥٠٠ هەزار لە ئازەربایجان) بووبێ، جگە لەوانە کە دوورخرانەوە و دەرکران و بوون بە قوربانی شەپۆلی ئازار و ئەزیەت.

ئێرە جێگای لێکدانەوەی وردی ئامارەکانی سۆڤیەت لەمەڕ ژمارەی کوردەکانی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت نییە، بەڵام ئاماری ساڵی ١٩٧٠ کە ئاماژەی بە حەشیمەتی ٨٨/٩٣٠ کەسیی کوردەکانی سۆڤیەت کردووە، نیشانەی دەرکردن و دوورخستنەوەی بە کۆمەڵی کوردانە. "عیسەوی" ئاماژە بە سیاسەتی تاواندنەوەی کوردەکان دەکات لەبەرئەوە کە لە نێو نەتەوەکانی دیکەدا ون ببن و ئەمە بیانووی سۆڤیەت بوو، بۆ دوورخستنەوە زۆرەملییەکانی ساڵەکانی ١٩٣٧و ١٩٤٤و نیشتەجێکردنیان لە کۆمارەکانی سۆڤیەت، بە تایبەت ئاسیای ناوەڕاست. راستییەکەی ئەوەیە کە رەوشی ئیتنیکی قەفقاز لە سەردەمی دەسەڵاتداری سۆڤیەت بەقەد سەردەمی دەسەڵاتداری تزارەکان ئاڵۆز بوو. بەگوێرەی ئاماری ساڵی ١٩٥٩، حەشیمەتی ئەرمەنییەکان لە یەکێتی سۆڤیەت بە گشتیی٢/٧٨٧/٠٠٠ بووە، لەحاڵێکدا کە کۆماری ئەرمەنستان ١/٧٦٣/٠٠٠ حشیمەتی بووە پێکهاتبوو لە ١/٥٥١/٦٠٠ ئەرمەنی،



١٠٧/٧٠٠ ئازەری، ٦٥ هەزار رووسی، ٢٥/٦٠٠ کورد (ئەم ئامارە لەو ئامارە ٢١ هەزار کەسییە کە بینیگسێن لە هەمان ساڵدا ئاماژەی پێکردووە، زۆرترە)، ٥/٦٠٠ ئۆکراینی، ٥ هەزار ئاشووری و ٢ هەزار کەس سەر بە نەتەوەکانی دیکە.

بە گوێرەی ئاماری ساڵی ١٩٧٠ کە "عیسەوی" باسی کردووە، حەشیمەتی گشتیی ئەرمەنییەکان ٣/٥٥٩/١٥١کەس بووە کە ٢/٢٠٨/٣٢٧ کەسی لە ئەرمەنستان، ٤٥٢/٣٠٩ کەسی لە گورجستان، ٤٨٣/٢٥٠ کەسی لە ئازەربایجان و ٢٩٨/٦١٧ کەسی لە فیدراسیۆنی رووسیا ژیاون. "عیسەوی" هەروەها ئاماژە بە حەشیمەتی یەك و نیو ملیۆنی ئەرمەنییەکان لە سەردەمی یەکێتی سۆڤیەت دەکات کە لە راستیدا نزیکەی دوو ملیۆن بووە. ئەرمەنستانی سۆڤیەت کە خودی ئەرمەنییەکان بە ئەرمەنستانی رۆژهەڵات بانگی دەکەن، زۆر لە ئەرمەنستانی کۆن بچووکترە. بەهەرحاڵ دەوڵەتی سۆڤیەت بە پشتیوانی کۆمارە دراوسێیەکان، سیاسەتی بێبەشکردنی ئەو سەرزەوییانەی- کە سەرەتا زۆرتر ئەرمەنیشین بوون، بەڵام هەتا ساڵی ١٩٢٠ زۆربەی دانیشتووەکانی بوون بە گورجی، ئازەری و کورد- گرتەبەر. تەنانەت لە دوای لە دەستدانی ئەرمەنستانی رۆژئاوا- کە ئێستا بەشێك لە تورکیایە- ئەرمەنییەکان لە کوردەکان خۆشبەختتر بوون، چونکە لانیکەم کۆماری خۆیان هەبوو و لە ئەندامێتی درێژخایەنیان لە کۆماری سۆڤیەتدا قازانجیان کردبوو.

لە کۆمارەکانی دیکە، بە تایبەت تورکمانستان، کورد بە قەد قەفقاز پڕ حەشیمەت بوون. ناوچە سەرەکییەکانی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە تورکمانستان، "گوپت داخ" و "فیریوزا" بوو و هەندێك گرووپی گوندنشینی بچووکتر لە "جیوك تەپە"، "خاخا"و "کاراکالا"و هەندێك کۆمەڵگای شارنشین لە "باگیر"، "بایرام عەلی"و" عیشق ئاباد"ی پایتەخت دەژیان، بەڵام بە پێچەوانەی کوردەکانی ئەرمەنستان، کوردەکانی تورکمانستان بوون بە ئامانجی هێرشو تاواندنەوەو هیچ ئاسانکارییەکیان بۆ خوێندن بە زمانی زگماکی بۆ نەکرا. لەگەڵ ئەمەشدا ناسنامەی خۆیان پاراست و لە هەوڵەکانی ئەم دواییانەی کوردەکانی سۆڤیەت بۆ گەیشتن بە مافی خۆیان وەك نەتەوەیەکی جیاواز، بەشداریان کرد[٥].

---

٥ـ بۆ زانیاری زۆرتر دەربارەی کوردانی تورکمانستان بنوارِن بۆ کتێبەکەی سوکولوڤا بەناوی،V. Kurdskiyk. ch. e موسکۆ- لنینگراد، ١٩٥٣. بۆ کوردانی کورمانجی خوراسان بنوارِن بۆ کتێبەکەی گوبانۆڤ بە ناوی pabet, e. I., sovyskiya Turkmenistan Kozuhov, A machinskiy and,Turkmenovedenie، بەرگی ٥ـ٦، عیشق ئاباد، ١٩٢٨،، عیشق ئاباد، ١٩٣٠.

ژمارەی گشتیی ئەو کوردانەی کە ئەمڕۆ لە یەکێتی سۆسیالیستی سۆڤیەتدا دەژین، دیار نییە. بە پێی هەڵسەنگاندنەکانی خودی کوردەکان، حەشیمەتیان لە نێوان ۳۰۰هەزار هەتا ۱/۱۲۰/۰۰۰ (ئەم ئامارە راستترە) کەسە. وەك نموونەیەك لە زیادبوونی حەشیمەتی کوردەکان لە دیاسپۆراکانی یەکێتی سۆڤیەت، دەتوانین ئاماژە بە حەشیمەتی ۳ هەزار کەسی کوردەکان لە نزیکی شاری ولادیڤێستۆك لە ساڵی ۱۹۳۷ بکەین کە حەشیمەتیان لە ساڵی ۱۹۹۰ گەیشتە ۳۰ هەزار کەس و بە زمانی کوردی لە قوتابخانەکاندا پەروەردە دەبینن. هەروەها هەندێك کۆمەڵگای کوردەکان وەك کولکوزی لە ناوچەی یاکوتسك دەژین. ئەم کوردانە ئەوەندە لە ناسنامەی کوردی خۆیان ئاگاو هۆشیارن کە لە سەرەتای ساڵی ۱۹۹۰ لیژنەیەکیان نارد بۆ دوسلدۆرڤ-ی ئەڵمانیا تا تەماشای دادگای چالاکانی pkk بکەن.

پاش ساڵی ۱۹۸۷، ناکۆکییە ئیتنیکییەکان گەلێ لە کوردەکانی ناچار کردووە قرقیزستان، تاجیکستان و ئۆزبەکستان بەجێبهێڵن و بۆ قەفقاز و بەتایبەت ناوچەی کراسنۆدار کۆچ بکەن. لە ساڵی ۱۹۸۷ـ۱۹۸۸ نزیکەی ۱۸ هەزار کورد کە ژیانیان لە ئەرمەنستان لە مەترسیدا بوو، بۆ هەمان ناوچە کۆچیان کرد، هەرچەند کە لە هەمان کاتدا کوردەکانی ئازەربایجان ئەوەندە لە ژێر گوشاردا بوون کە بۆ ئەرمەنستان کۆچیان کرد. ئەو کوردانە کە بۆ شاری سنووری کراسنۆدار کۆچیان کرد، ناسنامەی متمانەپێکراوی ناوخۆییان نەبوو و هەڵسوکەوتی کاربەدەستان لەگەڵیاندا باش نەبوو، هەر بۆیە لە ساڵی ۱۹۸۹ نزیکەی ۲۰ هەزار کەسیان (لە کۆی ٤۰ هەزار کەس) کۆچی ئازەربایجانیان کردو بە هۆی ئەوە کە سیاسەتی دەوڵەتی باکۆ گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، هەڵسوکەوتی باشتریان لەگەڵدا کرا.

هەڵسەنگاندنەکانی خودی نووسەر لە مەڕ حەشیمەتی کوردەکان لە ساڵی ۱۹۹۰ لە هەموو کۆمارەکان یان ناوچەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە خشتەی ۳دا هاتووە.



**خشتەی ۳ـ هەڵسەنگاندنی حەشیمەتی کوردەکان لە یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ۱۹۹۰**

| | |
|---|---|
| ئازەربایجان | ۱۸۰۰۰۰ |
| ئەرمەنستان | ۵۰۰۰۰ |
| گورجستان | ٤۰۰۰۰ |
| قەزاقستان | ۳۰۰۰۰ |
| قرقیزستان | ۲۰۰۰۰ |
| ئوزبەکستان | ۱۰۰۰۰ |
| تاجیکستان | ۳۰۰۰ |
| تورکمانستان | ۵۰۰۰ |
| سیبریا | ۳۵۰۰ |
| کراسنۆدار | ۲۰۰۰۰ |
| شوێنەکانی دیکە | ۱۲۰۰۰ |
| **کۆ** | **٤۵۰۰۰۰** |

۱۰٪ تا ۲۰٪ ی کوردەکانی ئازەربایجان لە ناوچە گوندنشینەکاندا دەژین. ئەم کوردانە هەتا رادەیەك تاویاببوونەوە، بەڵام لە دوای کراوەتربوونی سیاسەتی سۆڤیەت کە بە سیاسەتی "گلاسنۆست"ی گورباچۆڤ دەستی پێکرد، ناسنامەی کولتووری خۆیان سەرلەنوێ دۆزیوەتەوە.

زۆربەی ئەو کوردانەی کە لە ساڵی ۱۹٤٤ بۆ گورجستان دوورخرانەوە لە ناو یان دەڤەری تفلیس-ی پایتەخت دەژین و حەشیمەتیان نزیکەی ۳٤ هەزار کەسە. پتر لە ۸ هەزار کەسی دیکەش لە گوندەکانی نزیکی ناوچەی تەلاوی دەژین. کوردەکانی تفلیس کە زۆربەیان ئێزدین، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و ناوەندێکی کولتوورییان دامەزراندووەو بە زمانی کوردی، گورجی و رووسی پەروەردە دەبینن*. کوردەکانی تفلیس هەروەها گروپێکی شانۆیان

* خۆشبەختانە لە ساڵی ۲۰۰٤یش لە ناوچەی کوردنشینی "چیمکەند"ی وڵاتی قەزاقستان کە نزیکەی ۷۰کیلۆمەتر لە شاری ئەڵمائاتای پایتەخت دوورە، یەکەم قوتابخانەی کوردی بە یارمەتی دەوڵەتی قەزاقستان کرایەوە. من شانازی ئەوەم پێبەخشرا لە نزیکەوە لە یەکێ لە پۆلەکانی ئەم قوتابخانەیە ئامادە بم.

دامەزراندووەو بە تایبەت لە دوای کرانەوەی سیاسەتی دەوڵەتی سۆڤیەت لە کۆتایی دەیەی ١٩٩٠، دەستیان کردووە بە چالاکی لە کەرتی تایبەتدا. بە پێچەوانەی ١٠٠ هەزار موسڵمانی ئەبخازی لە گورجستان، کورد وەك هەڕەشەیەك بۆ گورجستان سەیر ناکرێن و گورجییەکان وەك خەڵکێکی لێهاتوو و ئارام سەیری کوردەکان دەکەن، رووسەکانیش وەها سەیری گورجییەکان دەکەن.

دەبی پشتڕاست بکرێتەوە کە ئەرمەنستان تەنها کۆماری سۆڤیەتە کە لە دوای کوشتن و بڕینەکانی سەردەمی ستالین، کولتووری کوردی پاراستووە. زۆربەی رۆشنبیرانی کوردی سۆڤیەت، خەڵکی ئەرمەنستانن و ئەمە بە هۆی ئەو راستییەیە کە کوردەکانی ئەرمەنستان توانیویانە لە قۆناخی سەرەتایی و ناوەندی بە زمانی زگماکی خۆیان پەروەردە ببینن (جگە لە وانە زانستییەکان). یەکێتی نووسەرانی ئەرمەنستان لقێکی کوردی هەیەو بەشی توێژینەوە کوردییەکانی ئینیستیتۆی توێژینەوەکانی رۆژهەڵاتی ئاکادیمیای زانستەکانی ئەرمەنستان، بووژاوەتەوەو کۆلیژی هاوبەشی کوردی ـ ئەرمەنی دامەزراوە. ژمارەیەکی زۆر کتێب لەوانە کتێبی وانە، ئەدەبیی و زانستی و وەرگێڕانی بەرهەمە بیانییەکان بە زمانی کوردی چاپکراوەو چاپ دەکرێ. کورد نوێنەریان لە کۆمیتەی ناوەندی حیزبی شیوعی ئەرمەنستان، پەرلمان و دەوڵەتدا هەیە و رادیۆ ئەرمەنستان دەنگ و باس، مۆسیقا و بەرنامەکانی دیکە بە زمانی کوردی بڵاودەکاتەوە. لە ئەرمەنستان ناوچە کوردنشینە سەرەکییەکان بریتین لە تالاغوز و تالین. هەروەها کۆمەڵێك کوردی دیکە لە ئاشترات، زەنگیبازار، شەمیران و ئوکتیابر و ١٠ تا ٢٠ هەزار کوردی دیکە لە ئێریڤان دەژین.

لە نێوان نەوەی کۆنی رۆشنبیرانی کوردی لە دایکبووی ئەرمەنستان، یەکێك لە سەرەکییترین کەسایەتییەکان، چیرۆکنووس "عەرەبی شەمۆ"یە (١٨٩٨ـ١٩٧٨). شەمۆ لە بنەماڵەیەکی هەژار لە دەوروبەری ئێریڤان لە دایك بوو و لە سەرەتای تەمەنی مێرمنداڵیدا ماڵی بەجێهێشت و لە باکووری قەفقاز شوانیی کرد و سەختی زۆری لەوێ بینی. پێوەندی لەگەڵ سەربازە شۆڕشگێڕەکان و کرێکاران، شەمۆی پاڵ پێوەنا تا لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا تەڤلی بلشڤویکەکان ببێ و هەتا کۆتایی ژیان بە حیزبی شیوعی یەکێتی سۆڤیەت وەفادار مایەوە. شەمۆ لەو ئاوارانە کە هەڵهاتبوون بۆ قەفقاز بیستی کە کردەوەی بێبەزەییانە و

مامۆستاکان دەیانگوت دەوڵەتی تورکیا هەوڵی زۆری داوە بۆ ئەوەی دەوڵەتی قەزاقستان لەم بڕیارە پەشیمان بکاتەوە، بەڵام بەخۆشییەوە سەرکەوتوو نەبووە. (وەرگێڕ)



دڵڕەقانەی زۆر لە دژی کوردەکان لە لایەن هێزە دژە شۆڕشگێڕەکانی بورژوازی تاشناکی ئەرمەنستان- کە ئامانجیان دامەزراندنی ئەرمەنستانی مەزن لە دەریا بۆ دەریا بوو- ئەنجام دراوە. کاتێك کە شەمۆ بەرەبەرە گەڕایەوە بۆ ماڵ، بیستی کە باوکی بە دەستی تاشناکەکان کوژراوەو دایکیشی لەو شاخانە (کە لەگەڵ تەنیا خوشکی رزگاربووی شەمۆ بە ناوی "چیچەك" بۆ ئەو شاخە هەڵهاتبوون) مردووە. لە دوای دەسەڵاتداری سۆڤیەت، رەوشەکە باشتر بوو و شەمۆ توانی بخوێنێت. شەمۆ بەسەرهاتی خۆی لە کتێبێك بە ناوی "شوانی کورمانج" (شوانی کورد) نووسی کە ساڵی ١٩٣٥ بە زمانی کوردی کورمانجی لە ئێریڤان بڵاوبووەوە.

لە ساڵی ١٩٣٧، شەمۆ سەرەڕای ئەوە کە ببوو بە نووسەرێکی شیوعی، بۆ سیبریا دوور خرایەوەو ٢٠ ساڵی ژیانی خۆی لە کۆمەڵێك لە "گولاك"ەکان[٦] تێپەڕ کرد. شەمۆ کاتێك کە لە سەردەمی خرۆشچۆڤ ئیزنی پێدرا بگەڕێتەوە بۆ ماڵ، درێژەی بە نووسیندا، بەڵام هیچ شتێکی دەربارەی ساڵەکانی ژیانی خۆی لە سیبریا نەنووسی. شەمۆ چوار چیرۆکی کوردی دیکەی بڵاوکردەوە کە یەکەمیان "بەربانگ"و دووەمیان کە ساڵێك دواتر بڵاوبووەوە، "ژینا بەختەوەر" بوو. مامە حەمۆ ئاماژە بەوە دەکات کە دەستەواژەی "کوردستان" کە شەمۆ لە کتێبەکەی خۆیدا لە دەیەی ١٩٣٠ بەکاری هێناوە و مەبەستی ناوچە کوردنشینەکانی قەفقاز بووە، قەت لە چیرۆکەکانی دواتری ئەودا بەکار نەهاتووە. عیسایوڤ- ی زماناناس لە کتێبەکەی خۆی بە ناوی "سەد و سی نەتەوە بە مافی یەکسانەوە"، ئاماژە بەوە دەکات کە زمانی کوردی زوو وەك یەکێك لە ١٣٠ زمانی یەکێتی سۆڤیەت بە رەسمی ناسرا و لە کتێبەکەی دواتری بە ناوی "زمانە نەتەوەییەکانی یەکێتی سۆڤیەت، کێشەکان و رێگەچارەکان" کە ساڵی ١٩٧٧ بڵاوبووەوە، دەڵێت:

((زۆربەی زمان و زاراوە ئێرانییەکان لە سۆڤیەتدا قسەیان پێدەکرێ لەوانە تاجیکی، ئوسیتیکی، کوردی و تاتی کە ئەلفوبێ و بەرهەمی نووسراویان هەیە و ئەوانەی کە ئەلفوبێ و بەرهەمی نووسراویان نییە وەك تالشی، بەلووچی (بەلووچی لە پاکستان بەرهەمی نووسراوی

٦- وشەیەکی روسییە کە کورتکراوی "بەرێوەبەرایەتی بەرزی کەمپەکانی کاری زۆرەملی"یە. مەبەست لە دامەزراندنی ئەم کەمپانە کە لە سەرانسەری یەکێتی سۆڤیەتدا بڵاوبوون، زیندانی کردن و چاککردنەوەی ئەو هاووڵاتیانە بوو کە تاوانی دژایەتی کردن لەگەڵ خەڵکیان خرابووە پاڵ. لەم کەمپانەدا زیندانییەکان بۆ کاری پیشەسازی بێکاریان پێدەکرا. دەگوترێت کە ١٠ هەتا ١٥ ملیۆن کەس لە گولاکەکاندا گیانیان لە دەستداوە. (وەرگێڕ)

هەیەو بەکاردەبردرێت))، یەغنوبی، ئیشکاشمی، یازگولامی و شوغنی روشانی کە سەر بە زمانەکانی پامیرە)).

عیسایۆڤ ئاماژە بە ئامارەکانی ساڵی ١٩٧٠ی کوردەکان دەکات و دەڵێت:

((بە زمانی کوردی زۆرتر لە ئەرمەنستان، ئازەربایجان و تورکمانستان قسە دەکرێت. حەشیمەتی گشتیی کوردەکان لە سۆڤیەت ٨٨/٩٣٠ کەسە، کە لە نێو نەتەوەکانی دیکەدا بڵاوبوونەتەوە. ئەم هۆکارە پاڵی بە تاواندنەوەی کوردەکان و لە دەستچوونی ناسنامەی ئیتنیکی ئەوانەوە ناوە. لە ئەرمەنستان لە قوتابخانەکاندا بە زمانی کوردی پەروەردە دەدرێت، کتێبی کوردی نووسەرە کورد و بیانییەکان بڵاودەبێتەوە، رۆژنامەیەکی کوردی بە ناوی "ریا تازە" چاپ و بڵاودەبێتەوەو کورد یەکێتی کولتووری خۆیان پاراستووە. بەهەرحاڵ، زۆربەی کوردەکان لە دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت دەژین. زمانەکەیان بە چەند زاراوە لەوانە سۆرانی، زازایی، لوڕی، گۆرانی و کرمانجی دابەش دەبێت کە کوردەکانی سۆڤیەت بە زاراوەی کرمانجی قسە دەکەن. زمانی کوردی لانیکەم لە سەدەی ١٢ەوە شێوازی نووسراوی هەبووەو ئەمڕۆ کورد لە ئەلفوبێی عەرەبی (لە عێراق و ئێران) و ئەلفوبێی رۆمانی (لە تورکیا و سوریا) کەڵك وەردەگرن. کوردەکانی سۆڤیەت پاش شۆڕشی ١٩١٧ بە زمانی خۆیان بەرهەمیان چاپ کردووە. یەکەم ئەلفوبێ کە لە ساڵی ١٩٢١ دانرا، لەسەر بنەمای ئەلفوبێی ئەرمەنی بوو و نەیتوانی ببێ بە ئەلفوبێیەکی گشتیی. لە ساڵی ١٩٢٩، ئەلفوبێی رۆمانی شوێنی ئەلفوبێی ئەرمەنی گرتەوەو ساڵی ١٩٤٥ ئەلفوبێی سیریلیك شوێنی ئەلفوبێی رۆمانی گرتەوە. خوێندەواری لە ناو کوردەکان پەرەی سەندووە و ژمارەیەکی بەرچاو نووسەر دەستیان بە چالاکیی سیاسی ـ کۆمەڵایەتی کردووە، لەوانە پێکهێنانی زمانێکی ئەدەبیی کە ئامرازی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو خوێندەواری گشتیی لە ناو ئەم کەمینەیە دایە. بەناوبانگترینی ئەم نووسەرانە، ژیندی، عەودال، شارۆ، گەنجۆ، باکۆ، شامیلۆڤ (عەرەبی شەمۆ) و" نادر نادرۆڤ "ن)).

لە سەرەتای دەیەی ١٩٢٠، کاربەدەستانی سۆڤیەت پشتیوانیان لە بڵاوبوونەوەی بەرهەم بە زمانی کوردی دەکرد و هانیان دەدا. ئەوکات ٩٥ لە سەدی کوردەکانی سۆڤیەت نەخوێندەوار بوون و لێکۆڵەران، نووسەران و شاعیران لە باتی زمانی ئەدەبی کوردی لە کرمانجی زارەکی کەڵکیان وەردەگرت. بەهەرحاڵ حاشا لە دەوری سۆڤیەت لە بردنە سەرەوەی رێژەی خوێندەواری و هاندانی توێژینەوە کوردییەکان ناکرێت، بەڵام ئەم دەستکەوتانە بە هۆی کۆمەڵکوژییەکان،



گوازتنە زۆرەملییەکان و دوورخستنەوەکان کە ستالین و باقرۆڤ و لایەنگرەکانیان بەرپرسیاری بوون، بێ واتا کرا.

## کوردەکانی سۆڤیەت و گلاسنۆست[٧]: کۆنفرانسی مۆسکۆ، ١٩٩٠

لە میانەی دیداری نووسەر لە یەکێتی سۆڤیەت لە ماوەی ٣٠ ساڵدا کە لە ساڵی ١٩٥٩وە دەستی پێکرد، نووسەر توانی پێوەندی نزیك لەگەڵ کوردەکانی سۆڤیەت دابمەزرێنێت و هەستی بە هیچ چەشنە نامۆبوونێکی سیاسی یان کولتووری لەگەڵ ئەوان نەدەکرد. بەدڵنیاییەوە ئەوانەی کە نووسەر لەمیانەی ٥ دیداری یەکەمدا بینینی، زۆرتر رۆشنبیرەکان بوون، بەڵام لە دوایین دیدار لە ساڵی ١٩٩٠ لەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی کوردەکانی سۆڤیەت هەڵسوکەوتی هەبوو. لەسەر بنەمای ئەم ئازمونەیە کە نووسەر دەتوانێت بێ شەرت ومەرج بڵێت کە کوردەکانی سۆڤیەت وەها سەیری خۆیان دەکەن کە لە راستیدا هەن.

کوردەکانی سۆڤیەت بە دوو شت گرێدراون: ناسنامەی کورد و یەکێتی سۆڤیەت و ئەوەی کە سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە گرێدراوبوون بە یەکێتی سۆڤیەت لە ناو نەوەی کۆن لە گرێدراوبوون بەو کۆمارانەی کە تێیدا دەژین، بەهێزترە. لەم رووەوە ئەوان خۆیان بە هاووڵاتی ئیدەئالی سۆڤیەت دەزانن. لەگەڵ ئەمەشدا، هەستی کوردبوون لە پلەی یەکەم دایەو گەلێ لە کوردەکان هیوایان کوردستانێکی سەربەخۆ و یەکگرتووە کە بە بیروبۆچوونی هەموو کوردەکان بە یارمەتی سۆڤیەت بەدی دێ.

لە حوزەیرانی ١٩٨٣، من لەسەر بانگهێشتی ئاکادیمیای زانستەکانی سۆڤیەت سەردانی یەکێتی سۆڤیەت-م کردو لە میانەی دیدارەکەمدا گەلێ ئێوارەی لەبیرنەکراوم لەگەڵ کوردەکانی سۆڤیەت و کوردەکانی شوێنەکانی دیکەی کوردستان (کە لە موسکۆ دەژیان یان دەیانخوێند)، تێپەڕ کرد. لە هەمووی ئەو کاتانەدا، هەستێکی یەکێتی بەهێز لە نێو بەشداربوواندا هەبوو و هەموو خۆشحاڵ بوون. یۆری ئاندرۆپۆڤ وەك سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت لە پاییزی ساڵی رابردووتردا جێگای برژنیف-ی گرتبووە کە وەك یەکەمین رێبەری یەکێتی سۆڤیەت پاش خرۆشچۆڤ سەیر دەکرا کە دەیویست رێفۆرم لە

---

٧- گلاسنۆست ئەو سیاسەتی چاکسازیی ئابووری و سیاسییە بوو کە میخاییل گۆرباچۆڤ، سەرۆك کۆماری یەکێتی سۆڤیەتی جاران لە ساڵی ١٩٨٥ هەتا ١٩٩١ بەڕێوەی برد. ئەم سیاسەتە بە رووخانی حکوومەتەکەی گۆرباچۆڤ و هەڵوەشانەوەی یەکێتی سوڤیەت کۆتایی پێکهات. (وەرگێڕ)

سیستەمی سۆڤیەتدا پێکبێنێ. ئاندرۆپۆڤ لە یەکەم لێدوانی رەسمی خۆی لە کۆبوونەوەی باڵای سۆڤیەت لە تشرینی دووەمی ١٩٨٢، بە تایبەت ناوی کوردی بردبوو و وتبووی کە لە یەکێتی سۆڤیەت هندێك کەمینەی نەتەوەیی هەن، کە سەر بە زۆرینەیەکی نەتەوەیین کە لە دەرەوەی سنوورەکانی یەکێتی سۆڤیەت دەژین وەك ئەڵمانیاییەکان، کۆریاییەکان و کوردەکان. هەرچەند کە کوردەکانی سۆڤیەت بەمە شانازییان دەکرد کە بەم شێوەیە لە نەتەوەکانی دیکەی سۆڤیەت جیاکراونەتەوە، بەڵام هەستیان بەوە دەکرد کە ئاندرۆپۆڤ بە قەد پێویست باسی رەوشی کوردەکانی نەکردووەو دەیانگوت کە ناکرێت کورد بخرێتە پاڵ ئەڵمانیاییەکان و کۆرییاییەکان، لەبەرئەوە کە ئەڵمانیایی و کۆریاییەکان لە دەرەوەی سۆڤیەت لە ولاتی خۆیاندا دەژین و دەوڵەتی خۆیان هەیە، بەڵام کورد وەها نین، کەوابوو کوردەکانیش دەبێ ولاتێکی سەربەخۆیان هەبێ تا تێیدا بژین.

بە دەستپێکردنی سیاسەتەکانی گورباچۆڤ، گڕوتینی ناسیۆنالیستی لە نێو کەمینەکانی یەکێتی سۆڤیەت (لەوانە کوردەکان) بوژایەوە، بەڵام زۆربەی کوردەکان لەم سیاسەتە پێشوازییان نەکرد، لەبەرئەوەی کە ئەوان لەگەڵ کەمینەکانی دیکە جیاواز بوون و هەستیان دەکرد کە تەنها بە یارمەتی دەوڵەتی ناوەندیی سۆڤیەت رەوشی کوردەکان باشتر دەبێ. هیچ گومان لەوەدا نییە کە دەوڵەتی ناوەندیی سۆڤیەت بە تەواوی لە کێشەکانی کوردەکان ئاگادار بوو و دەیویست هەتا رادەیەك یارمەتییان بدات. ئەمە کە "ئاندرۆپۆڤ" باسی کوردەکانی وەك نموونە کردبوو، شتێکی هەڵکەوت نەبوو، چونکە جێگرەکەی، واتە گورباچۆڤ خەڵکی شاری ئیتسراوپۆڵ لە قەفقاز بوو. هەروەها یەکێك لە نزیکترین و یەکەمین هاوکارەکانی واتا ئیدوارد شیڤارد نادزە خەڵکی گورجستان بوو کە بە باشی ئاگاداری رەوشی کەمینەی کورد لەو ناوچەیە بوو. بەهەرحاڵ شكو گومانی زۆر لە نیازپاکی رێبەرانی دەوڵەت لە موسکۆدا هەبوو و نەیانتوانی چارەسەرییەك بۆ مەسەلەی نەتەوەیی بەسەر کۆماریەکاندا بسەپێنن یان لەگەڵ کۆمارەکاندا لەگەڵ پرسی نەتەوەیی رێککەونو یاسایەکی بنەڕەتیی نوێ بۆ یەکێتی سۆڤیەت دابڕێژن.

لە ساڵی ١٩٨٨ کوردەکانی ئازەربایجان لە خۆپیشاندانێکدا کە لە ئێریڤان بۆ نارەزایەتی دەربڕین لەمەڕ ناکۆکی لەسەر ناوچەی ناگۆرنی قەرەباخ بەرێوەچوو، بەشدارییان کرد. لە ٢ی مایسی ١٩٨٩ کوردەکان خۆپیشاندانێکی مەزن و رێکوپێکیان لە مەیدانی پوشکین لە موسکۆ بەرێوەبرد. گرووپی کوردەکان لە ٩ کۆماری سۆڤیەت لەم خۆپیشاندانەدا بەشدارییان کردو بەرەو پارکی ئیسماعیلۆڤسکی رێپێوانیان کرد کە میدیاکانی سۆڤیەت لەوانە



تەلەفیزیۆن، راپۆرتیان لەسەر بڵاوکردەوە. یەکێك لە سەرەکییترین بەشداربووانی ئەم خۆپیشاندانە، ژنانی کوردی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست بوون. زۆربەی ژنانی کوردی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست بێوەژنن، لەبەرئەوەی کە شووەکانیان لە ماوەی ٥٠ ساڵ بەر لەوە دوورخرابوونەوەو لەناوبرابوون. وتەبێژی ئەم ژنانە بە ناوی مەزیحە غەفور دەیگوت:

((من لە قرقیزستانەوە هاتووم، لەو شوێنەی کە من لێهاتووم، ١٠٠ هەزار کورد دەژین کە ٦ هەزاریان ژنن. ئەم ژنانە داوایان لە من کردووە تا بە نوێنەرایەتیی ئەوان قسە بکەم. هەروەها کە ئێوە دەزانن، لە سەردەمی ستالین ئێمە بۆ سەرانسەری ئاسیای ناوەڕاستو قرقیزستان دوورخراینەوە. ئێمە لەم شوێنانە بەتوندی لە ژێر چاودێری داین. دراوسێکانمان نازانن ئێمە بۆچی دوورخراینەتەوەو بۆچی بە دوژمن دەزانرێین. دەڵێن کە ئێمە "دوژمنی خەڵك بووینە"، ئێمە ناتوانین کە ئەم تۆمەتە لە خۆمان بسڕینەوە. لەم بارودۆخەدا کچانی کورد چۆن دەتوانن بچنە قوتابخانە و چۆن دەتوانن وەك مرۆڤێك (چ بگا بە هاوولاتی سۆڤیەت) داوای مافی خۆیان بکەن. لە سەرانسەری جیهاندا، ژنان دەربارەی قارەمانانی ولاتەکەیان چیرۆك بۆ منداڵەکانیان دەگێڕنەوە، بەڵام ئێمە ئەم مافەمان لێ زەوت کراوە. قارەمانانی ئێمە لە بیرکراون. ئەوان قارەمانەکانیان لێ دزیوین. خوێندنی منداڵەکانمان ئاستەمە. ئێمە ناتوانین ئەوان فێری حەزکردن لە ولات و خەڵکەکەیان بکەین. ئێمە شەرم دەکەین بەوان بڵێین کە لە رێگای دایکیانەوە کوردن. بە بیروبۆچوونی من هیچ کەس لەم دنیایەدا ئەوەندەی ژنانی کورد لەم ولاتە لە ماف بێبەش نەکراوە. ئێمە منداڵەکانمان لە ماڵ بەجێهێشتووە و هاتووین بۆ موسکۆ تا داوای دادپەروەری بکەین. ئێمە ژیانمان لە بن مەترسیدایە. ئێمە لە ژیانی منداڵەکانمان دەترسین، لە مرۆڤکوژ و توندڕەوەکان دەترسین، ئێمە خۆمان لە ماڵ دەشارینەوە، بەڵام کاتێك کە لە ماڵ دەردەکەوین، ئەوان بەسەرماندا دەقیژێنن بڕۆنەوە بۆ ماڵ، بەڵام ئێمە ناتوانین بچین بۆ هیچ شوێنێك، ئێمە هیچ ماڵێکمان نییە)).

یەکێکی دیکە لەو کەسانە کە لە مەیدانی "پوشکین" قسەی کرد، عادل جەلیل، خەڵکی لاچین بوو. عادڵ جەلیل کاتێك کە لە دەیەی ١٩٢٠ منداڵ بووە، چووەتە قوتابخانەیەکی کوردی و کاتێك کە کاربەدەستانی ئازەربایجان لە ساڵی ١٩٧٨، لە کارتی پێناسەکەیدا نووسیبوویان "ئازەری"یە، قەبووڵی نەکرد و هەروەك گەلێ کوردی دیکە هەوڵی زۆری دا تا لە کارتەکەیدا بنووسن کە کوردە. ئەو دەیگوت کوردی ئازەربایجان نایانەوێت بمرن و دایکی پێی وتووە "بڕۆ بۆ موسکۆ کوڕم، ئەگەر ئەوان بە راستی دیموکراتن، سەربەخۆییەکەمان پێ دەدەنەوەو ئەگەر

دیموکرات نەبن، ئیدی هیچ باوەڕێکمان پێیان نابێ، چ پرۆستۆریکا[8]، چ گورباچۆڤ، چ لنین".

ئەم لێدوانانە و لێدوانەکانی دیکە لە میدیاکانی سۆڤیەتدا بڵاو بوونەوە.

خۆپیشاندەران داوایان لە دەوڵەتی ناوەندیی سۆڤیەت کرد، کە ئاسایشی ژیانی رۆژانەی کوردەکانی سۆڤیەت بپارێزێت و هەروەها داوایان کرد کە ناوچەی خودموختاری کوردستان کە ساڵی ١٩٢٣ لە ئازەربایجان دامەزرابوو، دیسان زیندوو ببێتەوە. هەندێك لێژنە پێشنیاریان کرد کە کوردستانێکی خودموختار لە ناوچەی کراسنۆدار دابمەزرێت، بەڵام پێشنیارەکە لەگەڵ پێشوازی لێژنەکانی دیکە بەرەوڕوو نەبووە، لەبەرئەوەی کە دەیانگوت رووسەکان قەد زەوییە بەپیتەکانی کراسنۆدار نادەن بە کوردەکان. دەوڵەتی ئازەربایجان پێشنیاری دامەزرانی ناوچەی خودموختاری کوردستانی کرد، بەڵام نە لە ناوچەی خودموختاری ساڵی ١٩٢٣، بەڵکو لە ناوچەی "جیران" کە وەك بیاوان بوو. کوردەکان ئەم پێشنیارەیان رەتکردەوە. شایانی ئاماژەپێکردنە کە دەوڵەتی بیلاڕووس و قەزاقستان ئامادەبوون ناوچەیەك لە وڵاتی خۆیان بدەن بە کوردەکان.

دوو مانگ دواتر لە ١٧ی ئاب، ئەنجوومەنی بەرزی سۆڤیەت یاسایەکی پەسەند کرد، کە بە گوێرەی ئەو یاسایە هەموو ئەو کەسانەی کە لە سەردەمی ستالین دوورخرابوونەوە، قەرەبووی ماددی و مەعنەوی بکرێنەوەو مافەکانیان پێبدرێتەوە. بەهەرحاڵ ئەم یاسایە لەسەر کاغەز مایەوەو جێبەجێکردنی تووشی کێشەگەلێکی چارەسەرنەکراو بوو. خەڵکانێك وەك ئەڵمانیاییەکانی ڤولگا توانیان بگەڕینەوە بۆ ناوچەی خۆیان و پێشوازیان لێکرا، بەڵام خەڵکانێکی دیکە وەك تاتارەکانی کریمەو کوردەکان نەیانتوانی بگەڕێنەوە بۆ ناوچەی خۆیان، لەبەرئەوەی کە ناوچەی تاتارەکان لە لایەن رووسەکان و ناوچەی کوردەکان لە لایەن ئازەرییەکانەوە داگیر کرابوو.

وتەبێژی کوردەکانی سۆڤیەت، عەلی عەبدولرەحمان-ی شاعیر پاشان لە لایەن شبیریکۆڤ، ئەندامی مەکتەبی سیاسی [حیزبی شیوعی سۆڤێەت] و بەرپرسیاری کاروباری نەتەوەکان، وەرگیرا. شبیریکۆڤ پێشنیاری ئەوەی کرد، کە کورد لە رێکخراوێکدا کۆ ببنەوە. ئەم پێشنیارە

8- پروستوریکا وشەیەکی رووسییە کە بە واتای سەرلەنوێ چاککردنەوەیە. پروستوریکا ئەو سیاسەتە بوو کە پارتی شیوعی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٨٧ گرتییەبەر بۆ بەهێزکردنی یەکێتی سۆڤیەت لە رێگای چاکسازی بنەڕەتی، بەڵام بە نەبردنە ژێر پرسیاری دەسەڵاتی خودی حیزبی شیوعی. پروستوریکا بووە هۆی دیموکراتیك بوونی کۆمەڵگای سۆڤیەت و خستنەڕووی کۆمەڵێك خواست کە لە کۆنترۆڵی حیزبی شیوعی چووە دەرەوە و کۆتایی پێهاتنی شەڕی سارد، دابەشبوونی ئەوروپا و هەڵوەشانەوەی سۆڤیەتی لێکەوتەوە. (وەرگێڕ)



بە خێرایی کەوتە قۆناخی جێبەجێکردن و لە ٢٠ی ئەیلوول رێبەرانی کورد لە دەوری یەك کۆبوونەوەو رێکخراوی "یەکبوون"یان دامەزراند و موحەمەد سولەیمان بابایۆڤ (جووتیارێکی خانەنشینکراوی خەڵکی باکوو کە گەلێ پۆستی گرینگی لە وەزارەتی کشتوکاڵدا هەبوو)یان وەك سەرۆکی رێکخراوەکە هەڵبژارد.

ئەندامانی کۆمیتەی رێبەرایەتی "یەکبوون" بریتی بوون لە نادر نادرۆڤ (مامۆستای زانکۆ)، پرۆفسۆر شاکیرۆ میحۆیی، عەلی عەبدولرەحمان، توسەن رەشید (ئەندازیار) و کۆلۆنیل وەکیل. هەروەها سکرتاریای کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شیوعی یەکێتی سۆڤیەتو یەکبوون لەسەر ئەوە رێککەوتن کە کۆنفرانسێکی گشتیی لەسەر پرسی کورد لە موسکۆ بەرێوە ببەن و بۆ ئەم مەبەستە ٧ کەس وەك ئەندامی کۆمیتەی بەڕێوەبەری هەڵبژێردران کە ٤ کەسیان کورد بوون. ئەم ٧ کەسە بریتی بوون لە نادر نادرۆڤ (سەرۆکی کۆمیتە)، ئیوان کیتائۆڤ (جێگری سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندی ئینیستیتۆی مارکسیست لنینیست-هاوسەرۆکی کۆمیتە)، موحەممەد بابایۆڤ ئەودالی (سکرتێر)، شاکیرۆ میحۆییو باگرامۆڤ (ئەندامی ئینیستیتۆی مارکسیست- لنینیست) و تاپرزنیکۆڤ (ئەندامی ئینیستیتۆی پەیوەندییە ئەتنیکییە ناوخۆییەکان).

کۆنفرانس لە ژێر ناوی "کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەت: رابردوو و ئێستا" لە ٢٥-٢٦ی جولای ١٩٩٠ بەڕێوە چوو. ئەو لێژنانەی کە بۆ بەرنامەی رەسمی بانگهێشت کرابوون بریتی بوون لە "ئینیستیتۆی مارکسیست ـ لنینیست"و "ئینیستیتۆی مێژووی حیزبی شیوعی لە کۆمارەکانی ئەرمەنستان، ئازەربایجانو قەزاقستان". هەروەها ١٢ کەس بۆ قسەکردن بانگهێشت کرابوون کە زۆربەیان کوردی سۆڤیەت بوون.

وادیارە کە مشتومڕی پشتی پەردەی زۆر لە نێوان حیزبی شیوعی سۆڤیەت و "یەکبوون" هەبوو لەسەر ئەو کوردانەی کە دەبوایە لە دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت بانگهێشت کرابان. حیزبی شیوعی داوای کردبوو کە تەنها ٣ تا ٥ مێژوونووس، نووسەر یان چالاکی بە ناوبانگی کولتووری بانگهێشت بکرێن، بەڵام "یەکبوون" دەیەویست ٣٨ کەس لە نوێنەرانی رێکخراوە سیاسی و کوردییەکانی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت بانگهێشت بکات. سەرەنجام حیزبی شیوعیو "یەکبوون" رێککەوتن و ١٨ کەس بانگهێشت کران کە زۆربەیان ئەندامی رێبەرایەتی حیزبە سیاسییە کوردییەکانی ئێران، عێراق و سوریا بوون کە بریتی بوون لە: جەلال تاڵەبانی (کە نەیتوانیبوو یان نەیویستبوو بێ و دوکتۆر کەمال فوئاد بە نوێنەرایەتی ئەو

هاتبوو)، مەسعوود بارزانی (کە موحەممەد سالّح جومعە بە نوێنەرایەتی ئەو هاتبوو)، عەزیز محەمەد (سکرتێری گشتیی حیزبی شیوعیی عێراق کە لە مۆسکۆ دەژیا)، سامی عەبدولرەحمان (رێبەری حیزبی دیموکراتی گەل)، دوکتور مەحموود عوسمان (سەرۆکی حیزبی سۆشیالیستی کوردستان)، دوکتۆر سەعید شەرەفکەندی (کە لە دوای دوکتۆر عەبدولرەحمان قاسملو ببوو بە سکرتێری گشتیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)، سەلاح بەدرەدین (کوردی سوریا)، کەندال نەزان (سەرۆکی ئینیستیتۆی کوردی پاریس)، موحەممەد عەلی ئەسلان (مافناسی کوردی تورکیا)، دوکتۆر جەمشید مومتاز حەیدەری (نووسەر)، سەعید مەلا، ئەحمەد کاراموش (کوردی دانیشتووی سوئێد) و رەزا چولپان (نووسەری دانیشتووی ئوسترالیا).

کۆنفرانس لە ئینیستیتۆی مارکسیست ـ لنینیست بەرێوە چوو و ٦٠٠ کەس بەشدارییان تێدا کرد کە زۆربەیان کوردی ٩ کۆماری سۆڤیەت بوون و سەر بە هەموو چین و توێژێك لەوانە چینی کرێکار و جووتیار و رۆشنبیر بوون. "کیتائۆڤ" بە لێدوانێك کۆنفراسەکەی کردەوەو لە دوای ئەو" نادرۆڤ" و "بوریس نیکۆلاویچ" (بە نوێنەرایەتی ئەنجوومەنی گەلانی یەکێتی سۆڤیەت) وتەکانی خۆیان پێشکەش کرد. هەموو لێژنەکانی سۆڤیەت وتارەکانیان بە زمانی رووسی پێشکەش دەکرد کە وەرنەگێڕابوونەوە سەر زمانەکانی دیکە، بەلاّم وتارەکانی دەرەوە کە بە زمانەکانی کوردی، فەرەنسی یان ئینگلیزی نووسرابوون، وەرگێڕابوونەوە سەر زمانی رووسی. لە ماوەی دوو رۆژ کاری کۆنفرانسدا، بە گشتیی ٢٠ وتار و لێدوانی کورت پێشکەشکران و هیچ کات بۆ باس و گفتوگۆ نەمابوو. کوردەکانی سۆڤیەت وتاری زانستییان پێشکەش دەکرد یان داخوازی سیاسیان دەخستەڕوو، بەلاّم لەناکاو دەنگی نارەزایەتیی جووتیار و کرێکارە کوردەکان بەرزبووەوە. ئەم کەسانە وتەی بەسۆزیان لە بارەی ئازادیی نەتەوەیی و هەژاریی خۆیان پێشکەش کرد. یەکێکیان تەنانەت رایگەیاند کە قوتابخانەی ناوێت و نیگەرانی کولتوور نییە، بەڵکو خواردەمەنی پێویستی ئەوێ تا زگی منداڵەکانی پێ تێر بکات و ژیانێکی ئاسوودەی دەوێت.

یەکێك لە خۆشترین کاتەکانی کۆنفرانس ئەو کاتە بوو کە سەیید شێخ حەسەن (سەرۆکی لاوی کوردە موسڵمانە سوننەکان و موفتی کۆماری قەزاقستان) لەگەڵ شێخ برۆیان موراز شێرنۆویچ (سەرۆکی کۆمەڵگای کوردە ئێزدییەکان کە خەڵکی تفلیس، پایتەختی گورجستان بوو) ئاشتیان بووەوە بە گەرمی یەکتریان لە ئامێز گرت. سەیید شێخ حەسەن رایگەیاند کە لە پلەی یەکەمدا کوردە و موسڵمان بوون لە پلەی دووەم دایە. شێخ برۆیان موراز شێرنۆویچ- یش رایگەیاند کە بۆ ئەو کوردبوون لە پلەی یەکەم دایەو ئێزدی بوون لە پلەی دووەم دایە. یەکێکی



دیکە لە پڕشکۆترین کاتەکانی کۆنفرانس ئەو کاتە بوو کە موحەممەد بابایۆڤ (سەرۆکی "یەکبوون") و نادر نادرۆڤ (کەسایەتیی ئاکادیمیست) یەکتریان لە ئامێز گرت و لە ناکۆکییەکانی پێشوویان- کە لەسەر خۆشەویستبوونی بابایۆڤ لە نێوان کرێکاران‌و خۆشەویستبوونی نادروڤ لە نێوان رۆشنبیراندا سەریهەڵدابوو- خۆش بوون.

بڕیارنامەی کۆتایی کۆنفرانس پەسەندکراو لە کۆنفرانسێکی چاپەمەنیدا خرایە بەردەم راگەیاندنە گشتییەکان. هەروەها نامەیەك بۆ سەرۆك کۆمار، گورباچۆڤ بەرێ کرا. لە کۆتایی کۆنفرانسدا پێشنیاری ئەوە کرا کە ئاماژە بە بڕیارنامەی ئەو کۆنفرانسە بکرێت کە لە ٢٧ـ٢٩ی نیسانی ١٩٩٠ لە لۆزان و لەمەڕ کوردستان بەرێوە چووەو ٨٠٠ کورد لە نوێنەرانی هەموو گرووپە سیاسییەکان، لەوانە PKK و هەروەها نوێنەرانی پەرلمانی سویس بەشدارییان تێدا کردووە. لە بڕیارنامەکەدا ئاماژە بەم خاڵانە کرابوو:

"نەتەوەی کورد یەك نەتەوەیە، کوردستان بێ رەزامەندی کوردەکان لە نێوان ئێران، عێراق، تورکیا و سوریا دابەشکراوە. مەسەلەی کورد، لەوانە کوردەکانی سۆڤیەت، دەبێ بخرێتە بەردەم نەتەوە یەکگرتووەکان تا رێگاچارەیەك لەسەر بنەمای مافی خودموختاری بۆ ئەم پرسە بدۆزرێتەوە".

ئەوکاتە گەلێ لە کوردەکان زۆر لەوە خۆشحاڵ بوون کە کۆنفرانسی موسکۆ بڕیارنامەی کۆنفرانسی لۆزانی پەسەند کردووە، بەلاّم کاتێك کە بڕیارنامەی مۆسکۆ مانگێك دواتر لە رۆژئاوا بلاّوبووەوە، هەموو خاڵەکانی کۆنفرانسی لۆزان-ی لە قەڵەم خستبوو، واتا تەنانەت لە ژێر سیاسەتی "فکری نوێ"شدا یەکێتی سۆڤیەت ئامادە نەبوو کە بە شێوازێکی دادپەروەرانەو یەکسان لەگەڵ پرسی کورد مامەڵە بکات.

لێکۆڵەرە زانستییە سۆڤیەتی و بیانییەکانی مەسەلەی کورد، کۆمەڵناسان، نووسەران، رۆشنبیران‌و نوێنەرانی رۆشنبیرانی کوردی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت لەم کۆنفرانسەدا بەشدارییان کرد، بەلاّم دەبێ ئەم راستییە لە بەرچاو بگرین کە ئەم کۆنفرانسە لە پلەی یەکەمدا لە بارەی کوردەکانی سۆڤیەت بوو و یەکەم کۆنفرانس لە جۆری خۆیدا بوو کە بەرێوە چوو و بەرزترین کاربەدەستانی یەکێتی سۆڤیەت پشتوانیان لێکرد. کەوابوو بڕیارنامەی کۆتایی دەرچوو کە تێیدا جەخت لەسەر هەڵەبوونی سیاسەتی نەتەوەیی ستالین لە سەردەمی راوەستان (زاوەستویا) لە پەیوەندی لەگەڵ گەلی کورد (وەك هەڵوەشاندنەوەی ناوچەی خودموختاری کوردستان لە ساڵی ١٩٢٩، تاواندنەوەی زۆرەملی کوردەکان، دوورخستنەوەکانی ساڵی ١٩٣٧و ١٩٤٤، داخستنی قوتابخانە و ناوەندەکانی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کوردی و دەستێوەردان لە ئاماری حەشیمەتی کوردەکان) کرا. لە درێژەی بڕیارنامەکەدا هاتبوو کە: "تەنانەت لە سەردەمی پروستۆریکا، پرسی کورد چارەسەر نەکراو مافەکانیان پێ نەدرایەوە".

بڕیارنامەکە جەختی لەسەر پێویستی پەرەپێدانی چاپ و بڵاوکردنەوەو پەخشی بەرنامە بەزمانی کوردی و هەڵگرتنی کەند و کۆسپە جۆراوجۆرەکانی سەر ڕێگای پەروەردە بە زمانو ئەدەبیاتی کوردی کردەوەو ئاماژەی بەوە کرد کە: "تەنها یەك بڵاڤۆك بە زمانی کوردی هەیە. پەخشی بەرنامە بە زمانی کوردی لە ئەرمەنستان و گورجستان کەمەو هیچ هاوکارییەك لەگەڵ کوردەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجی نەتەوەیی و مەعنەوی گەلی کورد ناکرێت. لەمە زیاتر ساڵەهای ساڵ، کورد لە دامەزران لە پلە بەرزە دەوڵەتییەکان بێبەش بوونە و لە دوایین هەڵبژاردندا، هیچ کوردێك نەبووە بە ئەندامی ئەنجوومەنەکانی کۆمارە جۆراوجۆرەکانی سۆڤیەت".

هەروەها لەمەڕ نەبوونی هیچ چەشنە پێوەندییەك لە نێوان کوردەکانی سۆڤیەتو کوردەکانی دەرەوەی سۆڤیەت و هاتنی چاپەمەنییە کوردییەکان لە دەرەوەی سۆڤیەت بۆ سۆڤیەت، نیگەرانی دەربڕاو پێداگری لەسەر ئەوە کرایەوە کە دەبێ ئەلفوبێی ڕۆمانی (کە لە ناو کۆمەڵگا کوردییەکانی دەرەوەی سۆڤیەت کەڵکی لێوەردەگیرێت) لە ناو کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەت-یش کەڵکی لێوەربگیرێت و هەموو کەند و کۆسپەکانی سەر ڕێگای هاتنی بەرهەمە کوردییەکان بۆ یەکێتی سۆڤیەت لە ناو ببردرێت. کۆمیتەی کۆنفرانس هەروەها ئاماژەی بە بەرژەوەندی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوو لە زیادبوونی کوردەکانی سۆڤیەت لە پەیڕەویکردن لە کوردەکانی دەرەوەی سۆڤیەت و خەباتیان لە پێناوی خودموختاری کردو ناڕەزایەتی خۆی لەوە دەربڕی کە پرسی کورد لە سیاسەتی "فکری نوێ"ی دەوڵەتی سۆڤیەت و سیاسەتی ناونەتەوەیی واتا پەیوەندی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا گرینگی پێ نەدراوە. هەروەها ڕەخنە لە بێدەنگبوونی دەوڵەتی سۆڤیەت لە بەرامبەر زوڵم و زۆرداریيەکان لە دژی کوردەکان، بەتایبەت بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن دەوڵەتی عێراق لە ساڵی ١٩٨٨ دژی کوردەکان، گیراو ئاماژە بەوە کرا کە:

((نابێ هیچ چەشنە یارمەتییەك و پشتیوانییەك لەو ڕێژیمانە بکرێ کە لەم ئامرازانەو ئامرازەکانی دیکە بۆ سەرکوتکردنی خەباتی کورد لە پێناو گەیشتن بە خودموختاری، کەڵك وەردەگرن. دەبێ یەکێتی سۆڤیەت لە ژێر ڕۆحی سیاسەتی "فکری نوێ"دا دەستپێشخەر بێ





لەوەی کە سەرنجی کوتوپڕی ڕێکخراوە ناونەتەوەییەکان، بەتایبەت نەتەوە یەکگرتووەکان بەرەو لای ئێشو زامەکانی گەلی کورد رابکێشێت.))

لە دەرەنجامدا، بڕیارنامەکە پێی لەسەر دامەزراندنی "ئەنجوومەنی فیدراڵی کورد" (پێکهاتوو لە کوردەکانی هەموو کۆمارەکانی سۆڤیەت) و ناوەندێکی کولتووری کوردی لە مۆسکۆ و ناوەندێکی چاپ و بڵاوکردنەوە وەك پێشەکییەك بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی خودموختار لە ناوچە گونجاوەکان، گرتەوەو لە کۆتاییدا بە گەرمی پشتیوانی لە سیاسەتی گۆڕانکارییە دیموکراتیکەکان و لیبراڵیزەکردنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی یەکێتی سۆڤیەت کردو لە هەمان کاتدا شۆڤینیزم و دەستدرێژی ڕەتکردەوەو جەختی لەسەر پەیوەندییە مێژووییەکان لە نێوان کوردەکان و خەڵکانی دراوسێ لە یەکێتی سۆڤیەت کردەوە.

ئەوە کە چارەنووسی یەکێتی سۆڤیەت چ دەبی دیار نییە، بەڵام ئەوەی کە دیار و ڕوونە ئەوەیە کە کوردەکانی سۆڤیەت لە پاراستنی زمان، کولتوور و داب و نەریتەکانیان سەرسەختنو لەگەڵ کوردەکانی دەرەوەی سۆڤیەت لە خەونی دوایی کوردەکان واتا "کوردستانێکی سەربەخۆ و یەکگرتوو" شەریکن.

## کورد لە ئیسراییل

ئایینی جوولەکە لە کوردستان خاوەنی مێژوویەکی کۆنە، بە گوێرەی باسکردنی تەلموود دەربەدەرکراوانی جوولەکە لە ۲۸۰۰ ساڵ لەمەوبەرەوە لەسەر دەستی شەلماننەسری سێیەمی پادشای ئاشوورییەکان (۸۵۸-۸۲٤ پێش لە زایین) لە کوردستان نیشتەجێ کراون و تەلموود دەڵێ کەوا ئەو جوولەکانە لە سەردەمێکی درەنگدا، ڕەزامەندی رابینەکانیان وەرگرت کە کوردەکانی هاووڵاتیان وەربگێڕنە سەر جوولەکە و ئەوان لەم هەوڵەیاندا سەرکەوتنێکی بەرچاوییان دەزگیربوو. بنەماڵەی پادشاییانەی بەناوبانگی "ئەدیابین" کە هەولێر پایتەختی بوو، هەموو وەرگەڕانە سەر جوولەکایەتی. بەهەرحاڵ هەموو لایەك لەسەر ئەوە ڕێکن کەوا لە سەرەتای سەدەی دووەمی پاش زایینـدا، ئایینی جوولەکە لە کوردستانی ناوەند جێگیر بووە.

جوولەکە کوردەکان لە ناو ماڵی خۆیان و لە کۆبوونەوە ئایینیەکاندا بە شێوەیەکی کۆنە ئارامی دەدوان کە پێی دەوترێ سوریانی (واتە سریانی) و لە کاروباری سەوداکاری و بازرگانیدا و لە ناو کۆمەڵگای فراوانتردا بە کوردی دەدوان.

سەربەستیی کەم و زۆری ژنی کورد لە ناو کۆمەڵگای جوولەکەی کورددا، بوو بە هۆکاری ئەوەی لە سەدەی ۱۷دا، یەکەم رابی ژن دابنرێ. ئەم رابییە "ئەسێناپ بارزانی" یە کە کچی رابی بە ناوبانگ "سامۆئێل بارزانی" (دەوروبەری ۱٦۳۰ مردووە) یە و دامەزرێنەری چەندین قوتابخانە و مەکتەبی ئایینی بووە لە کوردستان. لە دواییدا خاتوون "ئەسێناپ" بوو بە سەرۆکی ئەکادیمیای پایەبڵندی جوولەکەناسی لە مووسڵ.

گۆڕی کەوناری گەورە جوولەکەکان وەکو ناحۆم لە ئەلقۆش، یونا (یونس) لە نەبی یونس (نەینەوای دێرین)، دانیال لە کەرکووك، حەبەقووق لە تویسرکان، شاژن ئیستەر و موردەخای لە هەمەدان و چەندین ئەشکەوت کە دەڵێن ئەلیا سەردانی کردوون، بەشێکن لە ئارامگاو مەزارە هەرە گرنگەکانی جوولەکەکان لە کوردستان کە ئەمڕۆکە هەموو جوولەکەکان ڕێزیان لێدەگرن و بە پیرۆزیان دەزانن.

کۆچی کوردە جوولەکەکان بۆ سەرزەمینی ئیسراییل لە سەدەی ۱٦ دەستی پێکرد و لە دەیەی ۱۹۲۰ و ۱۹۳۰ خێراتر بوو و پاش دامەزرانی دەوڵەتی ئیسراییل لە ۱۹٤۸ نزیکەی سەرجەم جوولەکەکانی کوردستانی عێراق، ئێران و تورکیا لە ساڵەکانی ۱۹۵۰-۱۹۵۱ لە ئۆپەراسیۆنێکدا



به ناوی "قالێچەی سیحراوی" بۆ ئەو وڵاتە کۆچیان کرد و لە گەلێ لە شار و گوندەکانی ئیسراییل، بە تایبەت دەوروبەری "ئۆرشەلیم" نیشتەجێبوون و دەستیان بە کشتوکاڵ لەو وڵاتە کرد.

ئەمڕۆ نفووسی کوردەکانی ئیسراییل نزیکەی ۱۵۰ هەزار کەسە، بەڵام نەوەی نوێی کوردە جوولەکەکان زیاتر خۆیان وەك ئیسراییلی (نە کورد) پێناسە دەکەن و زۆربەیان زمانی کوردی و تەنانەت زمانی ئارامیش نازانن و بە زمانی عیبری قسە دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا گەلێ لە جولەکە کوردەکان ئێستاش لەوێ ژیان و کولتووری کوردانەی خۆیان پاراستووە و زیاتریش خەملاندووە و لە ئاهەنگ و بۆنە و داب و نەریتەکاندا بەشداری دەکەن. هەروەها گەلێ لە جوولەکە کوردەکان لە بواری زانستی و سیاسیدا پێشکەوتنی باشیان بە دەستهێناوە کە نموونەی سەرەکیان ئیسحاق موردخای (Yitzhak Mordechai)، وەزیری پێشووی بەرگری دەوڵەتی ئیسراییلە.

## کورد لە ئەفغانستان و پاکستاندا

سەرەتای مێژووی کورد لە ئەفغانستان و پاکستان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی ۱۵۰۰ کە کوردەکان لە لایەن شا عەباسی سەفەوییەوە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە دوورخرانەوە بۆ ئەوەی سنوورەکانی ئێران لە بەرامبەر هێرشی نەتەوەکانی دیکە بە تایبەت ئوزبەکەکان بپارێزن. گەلێ لەم کوردە دوورخراوانە سەرەنجام ڕێیانکەوتە ئەفغانستان و پاکستان و بە تایبەت لە شاری هەرات (لە ئەفغانستان) و ناوچەی بەلووچستان و پیشاوەر و مولتان (لە پاکستان) نیشتەجێ بوون.

نفووسی کوردەکانی ئەفغانستان و پاکستان دیار نییە، چونکە ئێستا ئەم کوردانە بە تەواوی لە ناو گەلانی دەوروبەری خۆیاندا تاویاونەتەوە و زمانی باوباپیرانی خۆیان لە بیر کردووە، بەڵام بۆ خۆیان دەزانن کە بە ڕەچەڵەك کوردن. گەلێ لە کوردەکانی ئەفغانستان و پاکستان توانیویانە پۆستی باڵا لە ناوچەی خۆیان بەدەست بهێنن وەك "عەلی مەردان خان" کە لە ساڵی ۱٦٤۱ کراوە بە حاکمی "کابول" ی پایتەختی ئەفغانستان و پاشان "قەندهار" بەڵام پاشان بە هۆی ئەوەی لە لایەن "شا تەهماسب"ی سەفەوییەوە لە سەر پۆستەکەی لابراوە، دژی دەسەڵاتی سەفەوییەکان ڕاپەڕیوە و ساڵی۱٦٤۳ ناوچەی قەندهار تا سنووری موغولستانی گرتووە، بەڵام سەرنەکەوتووە و پەنای بۆ دیهلی(دیلهی) بردووە. شاهی جیهان ٤ لاخی(ناوچە)ی بەخشیوە بە خۆی و و براکەی و کراوە بە حاکمی شاری لاهور و کیشمێر(لە پاکستانی ئەمڕۆدا).

له نێو نەوەی نوێی دەسەڵاتدارانی بە ڕەچەڵەك کوردی پاکستانیش دەتوانین ئاماژە بە سەرۆك وەزیرانی تیرۆرکراوی پاکستان خاتوون "بینەزیر بۆتۆ" (کە بۆ خۆی دانی بە کوردبوونی باوباپیرانی خۆیدا ناوە) و هەروەها عەلی ئەحمەد کورد، سەرۆکی دادگای باڵای ئێستای پاکستان بکەین.

## کوردەکانی ئۆردون:

له سەردەمی دەسەڵاتداری سەلاح الدین ئەیوبی گەلێ لە کوردەکان بوون بە ئەندامی سوپاکەی و لە ئۆردون (لە ساڵی ١١٧٣)، لوبنان، فەڵەستین و میسر نیشتەجێبوون، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٨ و ١٩٦٧ زۆربەی کوردەکانی فەڵەستین کە لە دەوروبەری شاری "قودس" دەژیان، بۆ ئۆردۆن کۆچیان کرد.

زۆربەی کوردەکانی ئۆردون لە ناوچەی سالت و هراتلاکراد دەژین و بە تایفەی الکوردی، الئەیوبی، ئەلرەشوانی، ئەلشێخانی، جالۆ، سەعدونی، ئەلقەیماری دابەش دەکرێن. کوردەکانی ئۆردون لە ناو کۆمەڵگای ئۆردوندا تاویاونەتەوە و زمانی باوباپیرانی خۆیان لە بیر کردووە، بەڵام دەزانن کە بە ڕەچەڵەك کوردن.

## کورد لە ئەفریقا

ڕژیمی بەعسی عێراق ژمارەیەك لە بنەماڵە کوردەکانی بۆ وڵاتی دیکە دوورخستەوە کە ژمارەیەکی کەمیان لە سومالیا و ئیریتیریا سەریانهەڵدا و ئێستا لە دەوروبەری "موگادیشۆ "ی پایتەختی سومالیا دەژین. لە کوردستانی عێراق کەس ئاگای لە چارەنووسی ئەم کوردانە نەبوو تا ئەوە کە ژمارەیەك لە کوردەکانی سومالیا بۆ ئەورووپا کۆچیان کرد و باسی چارەنووسی خۆیان بۆ کوردەکانی دیکەی دانیشتووی ئەورووپا کرد.

هەروەها ژمارەیەکی بەرچاو کورد لە وڵاتی "لیبیا" دەژین. ئەم کوردانە لەم چەند سەدەیەی دواییە بە بنەماڵەوە لە سوریا و لوبنان بۆ ئەو وڵاتە کۆچیان کردووە و ئێستاش هاتووچۆی زێدی باوباپیرانی خۆیان دەکەن.

له رۆژئاوا هەتا سەرهەڵدانی نەتەوەپەرستی نۆژەن (لە دوای شۆڕشی فەرەنسا) و لە رۆژهەڵات (هەتا شەڕی یەکەمی جیهان) کەمینەکان تەنها چینێکی ئایینی بوون. بۆ نموونە بۆ گەلی پرۆتستانی فەرەنسا، بەڕێوەبردنی ئەرکی ئایینی لە ژیان لەبن دەسەڵاتداری (لویسی١٤یەم) زۆر گرنگتر بوو. ئاوارەبوونی گەلی پرۆتستانی فەرەنسا کە پاش لەناوچوونی "بریاری نانت" لە ساڵی ١٦٨٥روویدا، هەتا سەرەتای سەدەی ١٨بە توندی درێژەی هەبوو.

هەتا ناوەڕاستی سەدەی ١٩ئیمپراتۆری عوسمانی لە بەرامبەر کەمینە مەسیحی و یەهوودییەکان (کە لەسەر بنەمای سیستەمی "میللەت" خودموختارییەکی سنوورداریان هەبوو) زۆر نەرمونیانی دەنواند. کەمینە مسڵمانەکانیش بە لەبەرچاو گرتنی رەگەزیان (عەرەب، ئالبانی، کورد و...) بەشێك لە کۆمەڵگای ئیسلام واتا "ئوممەت" بوون.

لە رۆژئاوای ئەوروپا لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩نەتەوەپەرستی سەرەتایی ئەڵمانیا و ئیتالیا شێوازی دەوڵەتێکی یەکگرتووی بەخۆوە گرت. لە ئەورووپای ناوەڕاست و دانوب زۆربەی وڵاتان پاش هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری هابسبوورگ دامەزران، بەڵام هەندێکیان لە سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهان هێشتا لەبن دەسەڵاتداری ئیمپراتۆری عوسمانیدا بوون.

نەتەوەپەرستی لە دوایین رۆژەکانی سەدەی ١٩بەرەبەرە لە بەشێکی مەزنی بالکان، قەفقاز، ئاسیای ناوین و "هیلالی زێڕین" سەریهەڵدا، بەڵام پاش شەڕی یەکەمی جیهان هەموو شت بە خێرایی گۆڕا و چووە پێش. هەتا شەڕی یەکەمی جیهان قسە و باس لە بارەی مافی کەمینەکان (واتا کەمینە رەگەزی، زمانی و ئایینیەکان) زۆر کەم دەکرا. لە ماددەی ٦٢ی کۆنگرەی بەرلین (١٧٧٨) وەبیر هێنرابووەوە کە دەبێ ئیمپراتۆری عوسمانی رێز لە ئازادیی ئایینی بگرێ. بۆ یەکەمجار "کۆنگرەی بەرلین" تەنها بە شێوەی ئایینی هەڵسووکەوتی لەگەڵ کێشەی کەمینەکان نەکرد، لەبەرئەوە کە لە ماددەی ٤دا گووترابوو کە لەو هەرێمانە گەلی بولگاری، یۆنانی و رۆمانی پێکەوە دەژین، دەبێ مافی کەمینە غەیرە بولگارەکانیش لەبەرچاو بگێردرێت. بەهەرحاڵ ئەم پێشنیارە شەفاف نەبوو.

لەو سەردەمەدا جگە لە مافی ئازادیی ئایینی، زۆرتر پشتیوانیکردن لە کەمینەکان ئەساس دەگیرا تا جێبەجێکردنی مافی کەمینەکان، بەڵام سەرەڕای ئەمەش پشتیوانیکردن لە





کەمینەکان لە کردەوەدا لە ساڵی ١٨٧٨ و ١٩١٨تووشی شکستێکی قورس بوو، ئەویش کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لە ساڵی ١٨٩٥-١٨٩٦و هەروەها١٩١٥-١٩١٦بوو. لەو سەردەمەدا گەلانی لاوازی ئیمپراتۆری عوسمانی خوراگریی خۆیان بە تەواوی لەدەستدا بوو و ببوون بە ژێردەست، بەڵام ئەوانەی کە بەهای هەرە زۆریان لەم رووەوە دا، کەمینەکان بوون کە بەرچاوترین نموونەکانی ئەمانەن: ئەرمەنییەکان بە تەواوی لە ئەنادۆڵی دەرکران و بە کۆمەڵ کوژران، یۆنانییەکان لە پنتوس دەرکران و لەناوبران، کلدانی و ئاشوورییەکان و کەمینە مەسیحییەکانی دیکە لە ئەنادۆڵی دەرکران و بە کۆمەڵ کوژران.

پاش شەڕی یەکەمی جیهان، کێشەی کەمینەکان هێشتا بە ئایینیانەوە گرێدراوبوو، بۆ نموونە گۆڕینەوەی حەشیمەت لە نێوان تورکیا و یۆنان لەسەر بنەمای پێوانگەلی ئایینی ئەنجامدرا: ٦٥٠ هەزار موسڵمان لەگەڵ ١ملیون و ٢٠٠ هەزار مەسیحی گۆڕدرانەوە و ئەم راستییە کە گەلێك لەو موسڵمانانە نە بە زمانی تورکی، بەڵکو بە زمانی یۆنانی قسەیان دەکرد، لەبەرچاو نەگیرا. پێچەوانەی ئەمەش لە بارەی مەسیحییەکان وەڕاست دەگەڕا.

پەیماننامەی لۆزان (١٩٢٣) لە خاڵەکانی پەیوەندیدار بە مافی کەمینەکان تەنها باسی لە کەمینە ئایینییە ناموسڵمانەکان کرد. لەو پەیماننامەیەدا پشتگیری لە مافی راستەقینەی ئەرمەنییەکان، یۆنانی و یەهوودییەکان کرا، بەڵام وەك کەمینەیەکی رەگەزی و زمانی هیچ مافێك نەدرا بە کوردەکان و کەمینە ئایینییە غەیرە سوننەکان (وەك عەلەوییەکان). لەو سەردەمەدا واتادان و تێگەیشتن لە مافی کەمینەکان ئەوەندە سنووردار بوو. بەهەرحاڵ دۆخەکە هەروەها درێژەی هەبوو، تا ئەوە کە لە ساڵی ١٩٨٨دا ریچارد شیفتر، جێگری وەزیری دەرەوەی ئامریکا (کە بەرپرسیاری مافی مرۆڤ و کاروباری کەمینەکان بوو) پشتڕاستی کردەوە کە سەرەڕای ئەوە کە پەیماننامەی لۆزان قەت ناوی کوردەکانی نەهێناوە، بەڵام لە روانگەی ئێمەوە کورد بە گوێرەی حوقوقی ناونەتەوەیی کەمینەیەکی خاوەن سەرزەوین.

لە ئاستی نێونەتەوەییدا، خاڵی گرنگی مافی کەمینەکان و پشتیوانیکردن لێیان، پاش شەڕی یەکەمی جیهان پێکهات. سەرۆك کۆماری ئامریکا، وودرۆ ویلسۆن لە بەرنامە ١٤خاڵییەکەی خۆیدا لە ساڵی ١٩١٨ (بە مەبەستی هاوکاریکردن لەگەڵ ئەرمەنستان و ئیمپراتۆری نەمسا- مەجارستان) وتی کە مافی هەموو نەتەوەیەکە (ئەڵبەتە ئەو نەتەوانە کە کۆلۆنیاڵ بوون) کە چارەنووسی خۆی دیاری بکات. کۆمەڵەی گەلان هیچ پێناسەیەکی تەواوی لە مافی کەمینەکان کە لە ئاستی جیهانیدا قەبووڵ کرابێت، نەخستەڕوو و بە شێوەیەکی جیاواز

مامەڵەی لەگەڵ کێشەی کەمینەکان کرد. سەرەڕای ئەمەش پاش ساڵی ١٩٢٣هەندێك یاسای گشتی لە بارەی کەمینەکانی ئەوروپا و عێراق پەسەند کرا وەك مافی بەشداریکردنی بێ جیاوازی لە پۆستە دەوڵەتییەکان، مافی قسەکردن بە زمانی زگماکی لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی و خۆبەڕێوەبردنی کولتووری. لەمە زیاتر پشتڕاست کرایەوە کە دەبێ دەوڵەت دەرفەتی پەروەردەیی بۆ قوتابخانەکان و ڕێکخراوە کولتوورییەکانی کەمینەکان بڕەخسێنێ. کۆمەڵەی گەلان لە بەرامبەر چەسپانی ئەم مافە بەرپرسیار بوو. لەمە زیاتر بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی پەیوەندیدار بە کەمینەکان، دەسەڵاتێکی یاسایی درا بە کۆمەڵەی گەلان و دیوانی دادی نێونەتەوەیی.

سەرەڕای ئەمەش، جارێکی دیکە چارەنووسی کەمینەکان بوو بە تراژدیی. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٢٤دەوڵەتی پۆڵۆنیا هەندێك خاڵی پەیماننامەی ئاشتیی کە لە بارەی کەمینەکان بوو، پێشێلکرد. لە هەمان ساڵدا لە تورکیا زمانی کوردی قەدەغەکرا و مافی کولتووری کوردەکان بە تەواوی پێشێلکرا. لەمە زیاتر بە تەواوی حاشا لە بوون و ناسنامەی کوردەکان کرا. نادادپەروەرییەکی وەها لە مێژووی سەدەی ٢٠دا بێ وێنە بوو. ئەم دۆخە هەتا ساڵی ١٩٩١ درێژەی هەبوو. بێبەشکردنی کوردەکان لە هەموو مافەکانیان و کۆماریخوازیی بێ ئەم لاولای ڕێژیمی تورکیا بووە هۆی ئەوە کە ٣ ڕاپەڕینی کوردەکان لە ساڵەکانی ١٩٢٥، ١٩٣٠و ١٩٣٦-٣٧ رووبدات و پاش ئەوە قۆناخی چەوساندنەوەی توند و دوورخستنەوەی بە کۆمەڵی کوردەکان دەستی پێکرد. هەرێمی کوردستان هەتا ساڵی ١٩٦٥لە گۆشەگیریدا هێڵرایەوەو دەوڵەتی تورك بە درێژایی ٣٠ یان ٤٠ساڵ خوێنی کوردەکانی خۆی مژی. لە عێراق کە کوردەکان زۆربەی دانیشتووانی پارێزگای "موسڵ"یان پێکدەهێنا سەبارەت بە داخوازییەکانی داهاتوویان هیچ پرسوڕایەکیان پێنەکرا.

پشتیوانیکردن لە کەمینەکان کە لە لایەن کۆمەڵەی گەلانەوە گارانتی کرابوو، بە خێرایی لە دژی دەسەڵاتداری دەوڵەتەکان دەرکەوت و سەرەنجامیش لەسەر بنەمای ڕێژەی دادپەروەری ئەو دەوڵەتانە مایەوە.

لە نێوان شەڕی یەکەم و دووەمی جیهاندا، دەوڵەتی ئەڵمانی هیتلەری بوو بە سەرچاوەی زۆربەی کێشەی کەمینەکان. لە شوێنەکانی دیکە وەك ڕۆمانیا و مەجارستان، دەوڵەت یان بزووتنەوە فاشیستەکان یان نەتەوەپەرستە شۆڤینیستەکان لە دژایەتی کردنیان لەگەڵ یۆنانییەکان وەك ئامرازێك کەڵکیان وەرگرت. لە ئەنجامدا نزیکەی ٥ ملیۆن یەهوودی و چەن



سەد هەزار قەرەج بە دەستی نازییەکان کوژران. پاش هەرەسهێنانی هیتلەر، هێڵی کۆچبەری گۆڕا و لە ئەنجامدا نزیکەی ١٣ ملیۆن ئەڵمانی بەرەو ڕۆژئاوای ئەڵمانیا کۆچبەرکران.

قۆناخی پاش شەڕی دووەمی جیهان بۆ پەسەندکردنی یاسا نێونەتەوەییەکانی پەیوەندیدار بە مافی کەمینەکان قۆناخێکی باش بوو. لەو سەردەمەدا ئەو قەیرانانەی کە لە لایەن ئەڵمانیای هیتلەرییەوە لە مەڕ کەمینەکان (بە تایبەت ئەڵمانیاییە سودیتییەکان) هاتبووە ئاراوە، لە مێشکی گەلانی جیهاندا جێی خۆی کردبووەوە. لەو قۆناخەدا مافی مرۆڤ وەك ئەرکێکی جیهانی لە قەڵەم دەدرا و ئەگەر ڕێز لە مافی مرۆڤ دەگیرا، ڕێز لە مافی گرێدراوبونی تاکەکان بە کەمینەکانیشەوە دەگیرا. لەوە باشتر کێشەکانی کەمینە ڕەگەزیی، زمانی و ئایینییەکان کەوتبووە ناو یاسا نێونەتەوەییەکان، بەڵام هیچ ڕێکخراوێك ئەو یاسانەی جێبەجێ نەدەکرد، لەبەرئەوە کە ئەو کێشانە هەمیشە بە هەلومەرجی ناوخۆیی وڵات و بە گشتی دەسەڵاتداری ئەوە دەوڵەتانە دەبەسترایەوە.

کێشەی بنەڕەتی مافی کەمینەکان پاش شەڕی دووەمی جیهان، ڕزگارکردنی وڵاتانی کۆلۆنیای ئافریقیایی و ئاسیایی بوو. پاش شەڕی یەکەمی جیهان مافی کەمینەکان بۆ دیاریکردنی چارەنووس مافێکی تایبەت بوو، بەڵام پاش شەڕی دووەمی جیهان ئەو مافە بوو بە مافی وڵاتان یان گەلانی کۆلۆنیال (کە کۆلۆنیای دەوڵەتە ئەوروپییەکان بوون). ساڵی ١٩٤٧ هەتا ١٩٦٢ قۆناخی هەرە بەسوود بۆ سڕینەوەی کۆلۆنیالیزم بوو. بەهەرحاڵ پاش ماوەیەکی کورت کێشەکانی پەیوەندیدار بە کەمینەکان دیسان سەریانهەڵدایەوە کە تا ئێستاش هەر بەردەوامن. نموونەکانی ئەم تەوەرە بریتین لە کوردەکانی عێراق (لە ساڵی ١٩٦١وە)، کەمینەکانی باشووری سودان و ئەرتریا (لە ساڵی ١٩٦٢وەوە)، تەبەت، تامیلەکانی سریلانکا، سیکەکانی هیندوستان و...

کێشەکانی پەیوەندیدار بە چەوساندنەوەی کەمینەکان یان مامەڵەکردن بە هەڵاواردن لەگەڵیان لە ناوچەی دانوب و بەشێك لە باڵکانیش سەریهەڵدا وەکو مەجارەکانی ترانسیلڤانیا (ڕۆمانیا) و ئالبانیاییەکانی کۆزۆڤۆ (یۆگسلاڤیا). هەمان کێشە لە یەکێتی سۆڤیەتیش سەری هەڵدا، بۆ نموونە تاتارەکانی کریمە، مەسکەکانی ئۆزبەکستان و ئەرمەنییەکانی قەرەباخ.

لە ساڵی ١٩٦٦ئەنجوومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ماددەی ٢٧ی پەیماننامەی مافی مەدەنی و سیاسیدا پەسەندی کرد کە لەو وڵاتانە کە کەمینەی زمانی، ئایینی و ڕەگەزی تێیاندا دەژین، مافی کولتووری، ئازادی ئایینی و بەکارهێنانی زمانی خۆیان دەبێ جێبەجێ بکرێت. سەرەڕای ئەمەش ئەو بەڵگانەی کە لە دەستی ئێمەدان نیشان دەدات کە گەلێك لە وڵاتانی

نادیموكراتیك، كەمینەكان دەچەوسێننەوەو بە هەڵاواردن مامەڵەیان لەگەڵدا دەكەن. ئێستا چارەنووسی كەمینەكان هێشتاش بە ویژدان یان ڕێژەی دیموكراتبوونی دەوڵەتەكانەوە بەستراوەتەوە. لە سەدەی ڕابردوودا دیوانی دادی ناونەتەوەیی قەت بە شوێن كێشەی هیچ كەمینەیەكدا نەچووە.

لە ساڵی ١٩٧٥یاسای كۆتایی ڕێكەوتننامەی هلسینكی هەندێك تێبینی دەربارەی كێشەی كەمینەكان و پشتیوانیكردن لەوان پەسەندكرد. سەرەڕای ئەمەش لە هەر شوێنێك كە دیموكراسی بوونی نییە یان كۆتایی پێدێت، هەڵاواردن، زەخت و گوشار، چەوساندنەوەی فیزیكی یان كولتووری كەمینەكان بە توندی درێژەی هەیە.

لە ساڵی ١٩٨٩كۆنفرانسی ئاسایش و هاوكاری ئەورووپا بروشورێكی دەربارەی مافی كەمینەكان بڵاوكردەوە كە هەنگاوێكی گرنگ بۆ پێشخستنی مافی نەتەوەیی كەمینەكان بوو، بەڵام ڕێكخراوەكانی سەر بە نەتەوە یەكگرتووەكان لە پێناو مافی كەمینەكاندا هیچیان نەكردووە. بەهەرحاڵ بنەمای ئەم كێشەیە نەتەنیا لە مافی كەمینەكان، بەڵكو لەو ڕەوتەدایە كە تێیدا حوقوق دەپارێزرێت، تەنانەت ئەگەر گارانتیشی نەبێت.

لە بەرامبەر دەوڵەتێك كە بە شێوازێكی بێشەرمانە مافی كەمینەكان پێشێل دەكات چ كردەوەگەلێكی سیاسی یان ئەخلاقی دەكرێ ئەنجام بدرێت. ئەمە پرسیارێكە كە بێگومان دەبێ تاوتوێ بكرێ، ئەڵبەتە ئەگەر نامانەوێت سەرزەنشت بكرێین نابێ تەنها ئەم توندوتیژیانە شەرمەزار بكەین یان قوربانییەكانی بژمێرین. ئەگەر كەمینەیەك بچەوسێنینەوە و بە هەڵاواردن مامەڵەی لەگەڵدا بكەین، لەوە باشترە كە وڵاتێك لەسەر بنەمای هەڵاواردنی ڕەگەزی دابمەزرێنین. ئەگەر هۆ و بەڵگەی متمانەپێكراو لە بارەی پێشێل كردنی مافی كەمینەكان لە لایەن دەوڵەتەكانەوە (كە لە كاتی بە ئەندامبوون لە نەتەوە یەكگرتووەكاندا ڕێزگرتن لەو مافانەیان وەئەستۆ گرتووە) لە دەستدایە، بۆچی دەوڵەتانی دیكەی ئەندامی نەتەوە یەكگرتووكان لەگەڵ ئەو دەوڵەتە هەمان هەڵسوكەوتەی ناكەن كە پێشتر لەگەڵ دەوڵەتی ئافریقیایی باشوور كردبوویان، بە واتایەكی دیكە بۆ چ گەمارۆ ناخەنە سەر ئەو دەوڵەتانە.

ئێستا لە دوای شەڕی سارد كاتی ئەوە هاتووە كە تا ئەو شوێنەی پێوەندی بە مافی كەمینەكانەوە هەیە، بەرەوپێشچوونێكی نوێ دەستەبەربكرێ. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە تەنها دەركردنی ڕاگەیاندننامە بەس نییە. ئەگەر دەمانەوێت لە داهاتوودا پێش لە پێكدادانی دژوارو درێژخایەن بگرین، پێویستە هەندێك كردەوەی تایبەت ئەنجام بدرێت و هەندێك گەمارۆ بخرێتە سەر ئەو دەوڵەتانەی كە مافی كەمینەكان پێشێل دەكەن.

بێگومان كورد یەك لەو كەمینانەن كە لەم ڕووەوە بەهایەكی هەرە زۆریان داوە.

**سەدەی ٧:** کورد بوون بە موسڵمان و یارمەتی زۆریان دا بە شارستانی ئیسلام بەتایبەت لە بواری مۆسیقا و سەربازیدا. ئیبراهیم موسڵی، مۆسیقازانی کوردی خەڵکی موسڵ (٧٤٣-٨٠٦) یەکەم ئاکادیمی زانستی ئیسلامی مۆسیقای لە دیوەخانی هارون ئەلڕەشید دامەزراند کە کوڕەکەی بە ناوی ئیسحاق ئەم زانستەی لە بەغداد کۆکردووە و پەرەی پێدا.

**سەدەکانی ١٠-١٢:** پێکهاتنی ویلایەتە سەربەخۆکانی کورد:

- شەدادییەکان (٩٥١-١١٧٤) لە باکوور کە پایتەختەکەیان گەنجە بوو.
- حەسەن وەحیدییەکان (٩٥١-١٠١٥) لە باشوور.
- مەروانییەکان (٧٧٤-٩٩٠) لە رۆژئاوا کە پایتەختەکەیان دیاربەکر بوو.

**١١٦٩-١٢٥٠:** سلسلەی ئەیوبیان بە سەر موسڵمانانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست حکوومەت دەکات. سەلاحەدین بەرچاوترین و بەناوبانگترین فەرمانڕەواکانییەتی.

**سەدەکانی ١٤-١٥:** باشبوونەوەی رەوشی ویلایەتە کوردەکان لە دوای هێرشی مەغۆلەکان. ژیانی کولتووری کوردەکان لە دیوەخانی بیتلیس، هەکاری و بۆتان دەبوژێتەوە.

**١٥١٤:** هاوپەیمانی فەرمانڕەوایانی کورد لەگەڵ سوڵتان سەلیمی عوسمانی (بێ بەزەیی) دژی ئیمپراتۆری شیعەی ئێران. سوپای شائیسماعیلی سەفەوی لە شەڕی چالدێراندا لە باکووری کوردستانی ئێران لە هێزە تورك و کوردەکان شکست دەخوات. میرنشینە خودموختارە کوردەکان، سنوورەکانی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی پێکدەهێنن.

**١٥٩٦:** شەرەفخان، میری بیتلیس کتێبی "شەرەفنامە"، یەکەم کتێبی مێژوویی کوردەکان تەواو دەکات.

**١٦٩٥:** ئەحمەدی خانی شاکاری "مەم و زین" کە دیوانی حەماسی نەتەوەی کوردە دەنووسێت کە تێیدا داوای دامەزراندنی حکوومەتێکی یەکگرتووی کورد دەکات.

**سەدەی ١٩:** دەربارەی ئیمپراتۆری عوسمانی سیاسەتی ناوەندچێتی جێبەجێ دەکات. میرە کوردەکان کە بەرژەوەندییان کەوتووەتە بن مەترسی بە ئامانجگەلی زیادەخوازانە رادەپەڕن:

**١٨٠٦:** راپەڕینی عەبدولڕەحمان پاشای سلێمانی.

**١٨١٨:** راپەڕینی بیباس



**١٨٣٢:** راپەڕینی بەدرخان بەگ

**١٨٥٣-١٨٥٥:** راپەڕینی بەزدانشێر

**١٨٨٠:** راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵای نەهری

**١٨٩٨:** بڵاوبوونەوەی یەکەم رۆژنامەی کوردی بە ناوی "کوردستان"

**١٩٠٨:** شۆڕشی تورکە گەنجەکان. راگەیاندنی مەشرووتییەت (حکوومەتی یاسا) لە قوستەنتەنییە کە یەکسانی هەموو نەتەوەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی قەبووڵ دەکات، بەڵام لە ساڵی ١٩٠٩وە تورکە گەنجەکان سیاسەتی ناسیۆنالیزمی توندڕەوانە دەگرنە بەر و هەموو کۆڕو کۆمەڵە و چاپەمەنییە کوردییەکان دادەخرێن.

**٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨:** ئیمزای پەیماننامەی "مۆدرۆس" بۆ دەستهەڵگرتن لە شەڕ. ئیمپراتۆری هەرەسهێناوی عوسمانی کە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا لەگەڵ ئەڵمانیا هاوپەیمان بووە، تەسلیمی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دەبێت.

**١٩-٢٣ی نیسانی ١٩١٨:** بەرێوەچوونی کۆنفرانسی سانرێمۆ. سەرپەرشتی ویلایەتی عەرەبی عێراق و ویلایەتی کوردنشینی موسڵ دەدرێ بە بریتانیای مەزن و سەرپەرشتی سوریا دەدرێ بە فەرەنسا.

**١٩١٩-١٩٢٠:** یەکەم راپەڕینی کوردەکان بە رێبەرایەتی شێخ مەحموود لە ویلایەتی موسڵ بەدەستی بریتانیا لە رێگای هێزی هەواییەوە سەرکوت دەکرێت.

**١٠ی ئابی ١٩٢٠:** دەوڵەتە هاوپەیمانەکان، پەیماننامەی "سیڤەر" لەگەڵ ئیمپراتۆری عوسمانی ئیمزا دەکەن کە بڕیارەکانی پەیماننامەی "سانرێمۆ" پشتڕاست دەکاتەوە. پەیماننامەی "سیڤەر" لە بەشی سێیەمدا (ماددەی ٦٢، ٦٣ و ٦٤) پشتیوانی لە دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردی دەکات.

**٢٣ی ئابی١٩٢١:** پاش دەرکرانی مەلك فەیسەڵ، کوڕی شەریفی مەککە لە سوریا بە دەستی فەرەنسا، سێرپرسی کاکس، نوێنەری بەرزی بریتانیا لە مێزۆپۆتامیا دەیکات بە پادشای عێراق. هەموو کوردەکانی مووسڵ دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی فەیسەڵ بایکۆت دەکەن.

**٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٢١:** ئیمزای رێککەوتننامەی ئەنقەرە لە نێوان تورکیا و فەرەنسا. فەرەنسا دوو پارێزگای کوردنشینی جەزیرە و کورداغ کە لە ژێر چەتری پاراستنی خۆیدان، دەلکێنێ بە سوریاوە.

**١٩٢٢-١٩٢٣:** ڕاپەڕینی دووەمی شێخ مەحموود. شێخ مەحموود خۆی بە پادشای کوردستان دەزانێ و لەگەڵ سمکۆ، ڕێبەری کوردی ئێرانی کە لە ساڵی ١٩٢٠وە دژی ئێران ڕاپەڕیوە، پەیوەندی دەگرێ. بزووتنەوەی شێخ مەحموود سەرکوت دەکرێ و شێخ دووردەخرێتەوە.

**٢٤ی حوزەیرانی ١٩٢٣:** دەوڵەتی کەمالیستی ئەنقەرە و هێزە هاوپەیمانەکان پەیماننامەی "لۆزان" ئیمزا دەکەن کە یاسا و ڕێوشوێنەکانی پەیماننامەی "سیڤەر" هەڵدەوەشێنێتەوە.

**٣ی ئاداری ١٩٢٤:** لە تورکیا بە گوێرەی بڕیارێکی یاسایی، سەرجەم قوتابخانە، مەکتەبە ئایینی، کۆڕوکۆمەڵە و چاپەمەنییە کوردییەکان دادەخرێن. یەکەم پەرلمانی تورکیا کە ٢٧نوێنەری کوردی تێدایە هەڵدەوەشێتەوە.

**شوبات- نیسانی ١٩٢٥:** ڕاپەڕینی شیخ سەعید لە کوردستانی تورکیا دەستپێدەکات. هەروەها دەستپێکردنی یەکەم شەپۆلی دوورخستنەوەی کوردەکان بوو.

**١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥:** ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان ڕەزامەندی خۆی لەسەر داخوازی بریتانیا بۆ لکیانی ویلایەتی موسڵ بە حکوومەتی عێراق دەردەبڕی.

**ئابی ١٩٢٧:** کۆنگرەی دامەزرانی "خۆیبوون" (کۆمەڵەی نەتەوەیی کورد) بەڕێوە دەچێت. ئەم ڕێکخراوەیە هەموو کۆڕ و کۆمەڵە و گرووپ و پارتە کوردییەکانی پاش شەڕی یەکەمی جیهان یەکدەخات.

**١٩٢٨:** بەڕێوەبەرایەتی پارێزگا کوردنشینەکانی تورکیا لە ڕووی سەربازی و مەدەنییەوە دەدرێ بە نوێنەری باڵای دەوڵەت لەم ناوچانە.

**١٩٣٠:** ڕاپەڕینی ئارارات بە ڕێبەرایەتی "خۆیبوون" لە ناوچەی شاخی ئارارات دەستپێدەکات. تورکیا و ئێران بۆ دامرکاندنی ڕاپەڕین لەگەڵ یەك ڕێکدەکەون.

**پاییزی ١٩٣١:** جەعفەر سوڵتان ڕێبەرایەتی ڕاپەڕینێکی نوێ لە کوردستانی ئێران دەکات.

**١٩٣١:** شێخ مەحموود لەو شوێنەی کە دوورخرابووە، دەگەڕێتەوە و جارێکی دیکە ئالای ڕاپەڕین لە کوردستانی عێراق هەڵدەگرێت. شێخ بە دەستی بریتانیا دەستگیر دەکرێ و لە بەغداد دەخرێتە ژێر چاودێری. لە دوای ماوەیەك کوردەکانی عێراق بە ڕێبەرایەتی شێخ ئەحمەد بارزانی (برای مەلا موستەفا بارزانی) ڕادەپەڕن. هێزی هەوایی بریتانیا بە مەبەستی تێکشکاندنی ڕاپەڕینەکە دەستێوەردان دەکات.

**گوڵانی ١٩٣٢:** دەوڵەتی تورکیا یاسایەك پەسەند دەکات کە بەگوێرەی ئەوە دوورخستنەوە و بڵاوکردنەوەی کوردەکان دەبێ بە یاسایی. شەپۆلی دوورخستنەوەی بە کۆمەڵی کوردەکان بۆ ئەنادۆڵی ناوەڕاست دەستپێدەکات.





**١٩٣٣:** بارزانی ڕاپەڕینێکی نوێ لە کوردستانی عێراق ڕێبەرایەتی دەکات.

**١٩٣٦-١٩٣٨:** دەوڵەتی تورکیا کردەوەگەلێکی زۆر توند بۆ تێکشکاندنی ڕاپەڕینی مەزنی دەرسیم ئەنجام دەدات. بزووتنەوە ڕاپەڕیوەکانی کوردستانی تورکیا قەتیس دەبن.

**١٩٤٥:** حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دادەمەزرێت و پاش ماوەیەکی کورت پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە لایەن کوردەکانی عێراقەوە دادەمەزرێت.

**١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦:** بە هاندانی یەکێتی سۆڤیەت، یەکەم کۆماری کوردستان بە سەرۆکایەتی قازی موحەمەد لە مەهاباد ڕادەگەیەنرێت، بەڵام پاش کەمتر لە یەك ساڵ تێکدەشکێت. مەلا مستەفا بارزانی، سەرۆکی هێزە چەکدارەکان و ژمارەیەك لە هاورێیانی بۆ ناو خاکی تورکیا و عێراق پاشەکشە دەکەن و پەنا بۆ یەکێتی سۆڤیەت دەبەن.

**ئابی ١٩٥٣:** شای ئێران لە دوای کودەتایەك کە CIA ڕێکیخستووە، دەگەڕێتەوە سەر دەسەڵات.

**١٩٥٦:** بە پشتیوانی بریتانیاو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تورکیا، ئێران و عێراق"پەیماننامەی بەغداد" واژۆ دەکەن. بە گوێرەی یەکێ لە خاڵەکانی ئەم پەیماننامەیە، هەر ڕاپەڕینێکی کوردی کە لە هەرکام لەم سێ وڵاتانە ڕوو بدات، دەبێ سەرکوت بکرێت. کوتوپڕ پەیماننامەکە جێبەجێ دەکرێت، کاتێ کە ڕاپەڕینی کوردەکان لە جوانرۆ (لە کوردستانی ئێران) بە دەستی هێزەکانی ئێران و عێراق سەرکوت دەکرێت.

**١٩٥٧:** پارتی دیموکراتی کوردستانی سوریا دادەمەزرێت و قەدەغە دەکرێت.

**١٤ی تەمموزی ١٩٥٨:** حکوومەتی پاشایەتی هاشمی لە عێراق بە کودەتا سەربازی ژەنەراڵ عەبدولکەریم قاسم هەڵدەوەشێتەوە. کۆمارێك کە تێیدا کورد و عەرەب بە ئازادی بەشداری تێدا دەکەن، لە بەغداد ڕادەگەیەنرێت. مەلا مستەفا بارزانی لە یەکێتی سۆڤیەت دەگەڕێتەوە بۆ عێراق.

**٩ی کانوونی دووەمی ١٩٦٠:** چالاکی پارتی دیموکراتی کوردستان ئازاد دەکرێت.

**٢٧ی گوڵانی ١٩٦٠:** لە تورکیا، دەوڵەتی عەدنان مەندەرەس بە کودەتا سەربازی دەڕوخێت.

**بەهاری ١٩٦١:** لە عێراق چاپەمەنی و ڕۆژنامە کوردییەکان سووچی جیاییخوازییان دەخرێتە پاڵ و بەرەبەرە دادەخرێن.

**١١ی ئەیلوولی ١٩٦١:** دەستپێکردنی شەڕی چەکداری لە کوردستانی عێراق. ئاگربەستی کاتی لەلایەن هێزە کوردانەوە ڕادەگەیەنرێت.

شیوعییەکان دادگایی دەکرێن کە لە ئاکامیدا چەند هەزار کەس زیندانی دەکرێن یان لە سێدارە دەدرێن. ئەوانەی کە هەڵاتوون، لەناو هێزە نهێنییە کوردەکان خۆیان دەشارنەوە.

**حوزەیرانی ١٩٦٣:** سوپای عێراق دەست بە هێرشێکی نوێ دژی کوردەکان دەکات. دەوڵەتی سوریا کە پاش کودەتا ئاداری ١٩٦٣ی حیزبی بەعس گەیشتووەتە دەسەڵات، سوپا و هێزی هەوایی خۆی دەنێرێتە یارمەتی دەوڵەتی عێراق تا دژی کوردەکان شەڕ بکەن.

**١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣:** لە بەغداد ژەنەڕاڵ عارف، بەعسییەکان لەسەر دەسەڵات لادەبات.

**١٠ی شوباتی ١٩٦٤:** پاش ئەوەی کە ژەنەڕاڵ عارف رادەگەیەنێت مافی نەتەوەیی کوردەکان بە فەرمی دەناسێت، رێککەوتننامەی ئاگربەست ئیمزا دەکرێت. لە ئاکامی ئەم رێککەوتننامەیە، رێبەرایەتی کورد لەت دەبێت.

**ئاداری١٩٦٥:** دەستپێکردنەوەی شەڕی کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق کە تا کاتی راگەیاندنی ئاگربەستی حوزەیرانی ١٩٦٦درێژەی دەبێت.

**پاییزی ١٩٦٥:** پاش ساڵی ١٩٢٥ کە کوردستانی تورکیا وەك ناوچەی سەربازی راگەیەندراوە و هاتنی بیانییەکان بۆ ئەوێ قەدەغە بووە، پارێزگا کوردنشینەکان بە رووی بیانییەکان دەکرێتەوە.

**١٩٦٧-١٩٦٨:** خەباتی چەکداری جووتیاری لە کوردستانی ئێران.

**تەمموزی ١٩٦٨:** لە بەغداد، حیزبی بەعس دیسان دەگەڕێتەوە سەر دەسەڵات و لە دوای دوو کودەتا یەك لە دوای یەك (لە ١٧ و ٣٠ تەمموز) ژەنەڕاڵ ئەلبەکر، سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی بەعس وەك سەرۆك کۆماری عێراق رادەگەیەنرێت. شەڕ دژی جەنگاوەرانی بارزانی جارێکی دیکە لە نیسانی ١٩٦٣ دەستپێدەکاتەوە.

**١١ی ئاداری ١٩٧٠:** ئیمزای رێککەوتننامەی خودموختاری لە نێوان دەوڵەتی عێراق و کوردەکان کە دەبێ لە ماوەی ٤ساڵدا جێبەجێ بکرێت.

**١٩٧٠-١٩٧٤:** سەردەمی نە شەڕ، نە ئاشتی لە کوردستانی عێراق. هەوڵدان بۆ کوشتنی رێبەرانی کورد لە لایەن دەوڵەتی عێراق، سیاسەتی تەعریبی کوردستان و ناکۆکی لەسەر سنوورەکانی ناوچەی خودموختار، پەیوەندییەکانی بزووتنەوەی کورد و دەوڵەتی بەغداد تێکدەدات.



**١٢ی ئاداری ١٩٧١:** کودەتا سەربازی لە تورکیا. پارت و رێکخراوە چەپەکان دادەخرێن. چەند هەزار کورد بە تاوانی جیاییخوازی دەستگیر دەکرێن و لە دادگا سەربازییەکاندا دادگایی دەکرێن. رێژیمی زەبروزەنگ و سەرکوت لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ دەگاتە بە دەسەڵات.

**بەهاری ١٩٧٢:** ئاوەژۆبوونی هاوپەیمانییەکان. رێژیمی عێراق وەك بەشێك لە ستراتژی ناوخۆیی و بیانی خۆی بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کورد، پەیمانی دۆستی و هاوکاری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت دەبەستێت کە تا ئەو کاتە پشتیوانی لە کوردەکان دەکرد. دەوڵەتی ئێران بڕیار دەدات بە پشتیوانی نهێنی و بەپرسی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئامریکا، پشتیوانی لە کوردەکان بکات.

**ئاداری ١٩٧٤:** دەوڵەتی عێراق یاسای خودموختاری کوردستان کە لە رێککەوتننامەی ١٩٧٠کەوتووەتەوە، دەردەکات. لە مانگی نیسانەوە شەڕ جارێکی دیکە لە پێوەرێکی بەرفراوانتردا دەستپێدەکاتەوە.

**٥ی ئاداری ١٩٧٥:** پەیماننامەی جەزایر لە نێوان شای ئێران و سەدام حوسەین، جێگری سەرۆك وەزیرانی عێراق ئیمزا دەکرێت. ئێران کۆتایی بە یارمەتی سەربازی خۆی بە کوردەکانی عێراق دەهێنێت.

کۆتایی ئاداری ١٩٧٥: رێبەری کورد، مەلا مستەفا بارزانی دەچێتە ئێران. راپەرینی کورد هەڵدەوەشێتەوە.

**حوزەیرانی ١٩٧٦:** دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری لە کوردستانی عێراق.

**١٩٧٨-١٩٧٩:** دامەزرانی pkk. بەرزبوونەوەی لەناکاوی بزووتنەوەی کورد لە تورکیا.

**شوباتی ١٩٧٩:** رووخانی حکوومەتی پاشایەتی لە ئێران. بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە ئێران بەرێبەرایەتی عەبدولرەحمان قاسملو، کۆنترۆڵی مەهاباد دەگرێتە دەست.

**ئاداری ١٩٧٩:** کۆچی دوایی مەلا مستەفا بارزانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. دەوڵەتی ئێران ئیزن دەدات (لە شنۆ) لە کوردستانی ئێران بەخاك بسپێرێت.

**ئابی ١٩٧٩:** ئایەتوڵڵا خومەینی فەرمانی شەڕی پیرۆز دژی کوردەکانی ئێران رادەگەیەنێت. هەندێك چالاکڤانی کورد بێ دادگاییکردن لە سێدارە دەدرێن. ئەمە سەرەتای سەردەمێکی نوێی خەباتی چەکداری بۆ کوردەکانی ئێرانە.

**ئەیلوولی ١٩٨٠:** کودەتا سەربازی لە تورکیا.

دەستپێکردنی سەرکوتی کوردەکان لە تورکیا.

دەستپێکردنی شەڕی ئێران و عێراق. عێراق رادەگەیەنێ پەیماننامەی "جەزایر" کۆتایی پێهاتووە و دەست بە هێرشێکی بەرفراوان دژی ئێران دەکات. دەوڵەتی عێراق لە ناکۆکی کوردەکانی ئێران و دەوڵەتی ئێران و دەوڵەتی ئێران لە ناکۆکی کوردەکانی عێراق و دەوڵەتی عێراق بۆ لاوازکردنی دوژمنەکەیان کەڵك وەردەگرن، لەحاڵێکدا کە بزووتنەوەکانی کورد هەوڵ دەدەن خۆیان بەهێز بکەن.

**گوڵان – حوزەیرانی ١٩٨٣:** بە رەزامەندی دەوڵەتی عێراق، هێزە تایبەتەکانی تورکیا بۆ لەناوبردنی بنکەکانی pkk لە ناوچە سنوورییەکان دێنە ناو خاکی کوردستانی عێراق.

**تەمموزی ١٩٨٣:** سوپای عێراق شارۆچکەی قوشتەپە و دیانا لە پارێزگای هەولێر کە ژمارەیەکی زۆر لە هاورێیانی بارزانی ناچار بوون پاش شکستی راپەڕینی کورد لە ساڵی ١٩٧٥لەوێ بژین، گەمارۆ دەدات. هەموو کوڕان و پیاوانی ١٢تا ٧٠ساڵ تەمەن دەستگیر دەکرێن و بۆ شوێنێکی نادیار دەگوازرێنەوە. چارەنووسی ئەمانە کە نزیکەی ٨هەزار کەسەن، هێشتا نادیارە.

**تشرینی یەکەمی ١٩٨٣:** پێکدادانێکی توند لە نێوان هێزەکانی ئێران و عێراق روودەدات کە کوژرانی چەند هەزار کوردی لە ناوچەی پێنجوێن و گرماك لێدەکەوێتەوە.

مەهدی زانا، شارەداری هەڵبژێردراوی شاری دیاربەکر بە ٢٥ساڵ زیندان حوکم دەدرێت. لە هەمان دادگادا، پتر لە سەدان کەس لە ئەندامانی psk حوکمی ٦مانگ تا١٩ساڵ زیندانیان لەسەر دەدرێت.

**کانوونی یەکەمی١٩٨٣:** جەلال تاڵەبانی دەکەوێتە وتوویژ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق. ئەم وتوویژە یەك ساڵ درێژەی دەبێ، بەڵام لە لایەن دەوڵەتەوە هەڵدەوەشێنرێتەوە و شەڕ دەستپێدەکاتەوە.

**کانوونی دووەمی ١٩٨٤:** بەندکراوانی زیندانی سەربازی دیاربەکر بە مەبەستی پرۆتستۆ کردنی ئەشکەنجەی دەوڵەت، مانگ لە خواردن دەگرن. لە ماوەی یەك مانگدا، ٦بەندکراوی کورد گیانی خۆیان لە دەست دەدەن. ١١کەسی دیکە لە سەرەتای مانگی ئادار گیانی خۆیان لە دەست دەدەن.

**حوزەیرانی ١٩٨٤:** لە نێوان ٢٠٠ تا ٣٠٠ کەس لە ئاکامی هێرشی دەوڵەتی عێراق بۆ شاری بانە لە کوردستانی ئێران دەکوژرین.

**١٩٨٤:** دەستپێکردنی شەڕی چەکداری pkk دژی دەوڵەتی تورکیا.

**شوباتی ١٩٨٥:** لە دادگاییکردنێکدا کەبە هۆی زۆربوونی ژمارەی تۆمەتبارەکانی، یەکێ لە گرنگترین دادگاکانی مێژووی کۆماری تورکیا لە قەڵەم دەدرێت، ٢٢ ئەندامی pkk حوکمی



ئیعدام و ٣٠١ کەسی دیکە حوکمی زیندانی ٣ ساڵ تا زیندانی هەتاهەتاییان لەسەر دەدرێت. هەمووی ئەمانە، تۆمەتی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردی مارکسیستی – لنینیستی لە بەشێك لە وڵاتی تورکیایان خرابووە پاڵ.

**تشرینی دووەمی ١٩٨٥:** بە گوێرەی راپۆرتی رێکخراوی لێبووردنی ناونەتەوەیی، ژمارەیەکی زۆر لە بەندکراوانی کورد لە زیندانی ئەبووغرێب ئیعدام کراون. تەنها لە هەفتەی یەکەمی مانگی بۆڤەمبەر، ٦٠ کەس و پاشان ژمارەیەکی زۆری دیکە لە زیندانی موسڵ ئیعدام کراون.

لە ١٥ی تشرینی دووەم، هێزی هەوایی تورکیا بنکەکانی پێشمەرگەکان لە پارێزگای هەولێر و ناوچەی زاخۆ بۆمباردمان دەکات و هێزە زەوییەکانی تورکیا دێنە ناو ناوچەی زاخۆ لە کوردستانی عێراق.

**کانوونی دووەمی ١٩٨٧:** ئیدریس بارزانی، یەکێ لە رێبەرە سەرەکییەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە تەمەنی ٤٣ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات. دەوڵەتی عێراق تەرمی پارچە پارچەکراوی ٢٩لاوی کورد کە لە مانگی ئەیلوول و تشرینی یەکەمی ١٩٨٥ دەستگیرکراون لە بەرامبەر وەرگرتنی پارەی لە سێدارەدان دەداتەوە بە بنەماڵەکانیان.

**شوباتی ١٩٨٧:** بە پێی راپۆرتی رۆژنامەی "حورییەت"ی چاپی تورکیا، لەساڵی ١٩٨٣وە بە گشتی ٢٤٠کتێب بە تۆمەتی پرۆپاگەندای جیاییخوازی و هێرشکردنە سەر یەکگرتوویی نەتەوەیی دەستیان بەسەردا گیراوە، لەوانە نەقشەی جیهان و نەقشەی ئەوروپا کە لەلایەن دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی "پەنگوئەن" بڵاوکراونەتەوە.

**ئاداری ١٩٨٧:** وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە راپۆرتی ساڵانەی خۆیدا لەمەڕ پێشێلکردنی ماڤی مرۆڤ لە جیهان، بۆ یەکەم جار باسی کوردەکانی تورکیا دەکات. بە گوێرەی راپۆرتی رۆژنامەی "جمهورییەت"ی چاپی تورکیا، بڵاوبوونەوەی ئەم راپۆرتە ئاژاوەیەکی جیدی لە ناو دەوڵەتی تورکیا دەنێتەوە.

**نیسانی ١٩٨٧:** پەرلەمانی ئەوروپا بڕیارنامەیەك لەمەڕ شەرمەزارکردنی کوشتنی بە ئەشکەنجەی کوردەکان لە عێراق پەسەند دەکات.

**١٥-٢٢ی نیسانی ١٩٨٧:** دەوڵەتی عێراق دژی کوردەکان چەکی کیمیایی و گازی ژەهراوی بەکاردەهێنێت. لانیکەم ٢٠گوند خاپوور دەکرێن و نزیکەی ٥٠٠ گوندی دەکوژرێن.

**حوزەیرانی ١٩٨٧:** پەرلەمانی ئەوروپا لە بڕیارنامەیەکدا کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان بە فەرمی دەناسێت و داوا لە دەوڵەتی تورکیا دەکات کەمینەی کورد بە فەرمی بناسێت.

**ئابی ١٩٨٧:** هێزی هەوایی عێراق بە چەکی کیمیایی هێرش دەکاتە سەر قاردەشت کە ژمارەیەك ئاوارەی کورد لەوێ کۆ ببوونەوە.

**١٩٨٧:** بەرەی کوردستانی عێراق لە ٨ رێکخراو و حیزب پێکهات.

**ئاداری ١٩٨٨:** لە ئاکامی هێرشی دەوڵەتی عێراق بە چەکی کیمیایی بۆ شارۆچکەی هەڵەبجە، ٥ هەزار کورد دەکوژرێن.

**گولانی١٩٨٨:** بە گوێرەی هەڵسەنگاندنەکانی رێکخراوە کوردییەکان، لە نێوان ٥٠٨٦ گوند لە کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٧٥، ٣٤٧٦ گوند کاولکراون.

**٢٠ی ئابی ١٩٨٨:** ئیمزاکرا رێککەوتننامەی ئاگربەست لە نێوان ئێران و عێراق.

**٢٥ی ئاب-١٠ی ئەیلولی ١٩٨٨:** دەوڵەتی عێراق بە چەکی کیمیایی هێرش دەکاتە سەر ناوچە سنوورییەکانی عێراق و تورکیا. ١٠٠هەزار کورد ئاوارە دەبن. ٢ لە ٣ ی ئاوارەکان دەچنە ئێران و ئەوانی دیکە لەلایەن کاربەدەستانی تورکیاوە لە کەمپە کاتییەکاندا نیشتەجێ دەکرێن.

**١٣ی تەمموزی ١٩٨٩:** عەبدولرەحمان قاسملو، سکرتێری گشتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە سەروبەندی وتووێژ لەگەڵ نێردراوانی دەوڵەتی ئێران لە ڤییەنا، پایتەختی نەمسا دەکوژرێت.

**١٠ی گولانی ١٩٩٠:** پەسەندکردنی بڕیارە یاساییەکانی ٨٤و ٨٥ کە هێزێکی سەرکوتکەرانەی بەرچاو بۆ ماوەیەکی نادیار دەدات بە بەرێوەبەری پارێزگاکانی باشوور و رۆژهەڵاتی تورکیا (ئیلازیغ، بینگول، تونجلی، وان، دیاربەکر، ماردین، سێرت، هەکاری، باتمان و شەرناخ).

**ئابی ١٩٩٠:** داگیرکرانی کووەیت لەلایەن عێراقەوە.

**١٧ی کانوونی دووەمی ١٩٩١:** دەستپێکردنی شەڕی کەنداو کە لە ٦ی ئادار کۆتایی پێدێت.

**ئاداری ١٩٩١:** لە دوای راپەڕینی شیعەکان لە باشووری عێراق، کوردەکانیش رادەپەڕن. لە ٦ تا ١٤ی ئادار، کوردەکان بەرەبەرە کونترۆڵی سەرجەم شارە کوردنشینەکان دەگرنە دەست.

تورکیا ئیزن بە کوردەکان دەدات بە زمانی زگماکی خۆیان کە لە ساڵی ١٩٨٥وە قەدەغە بووە، قسە بکەن.

**٨-١٤ی ئاداری ١٩٩١:** لە شەڕێکدا پێشمەرگەکان کەرکوك دەگرن.



**٢٧ی ئاداری ١٩٩١:** دژە هێرشی هێزە تایبەتەکانی سەدام حوسێن دەبێتە هۆی ئاوارەبوونی بەرفراوانی نزیکەی یەك میلیۆن و نیو کورد. زۆربەیان بەرەو ئێران و٦٠٠ هەزار کەسی دیکە بەرەو تورکیا هەڵدێن.

**٥ی نیسانی ١٩٩١:** ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیارنامەی ٦٨٨ پەسەند دەکات کە تێیدا سەرکوتی خەڵکی مەدەنی لە عێراق شەرمەزار دەکات.

**١٠ی نیسانی ١٩٩١:** دەوڵەتی ئەمریکا دەوڵەتی عێراق هۆشیار دەکاتەوە لە باکووری وڵات کەڵك لە هێزی هەوایی خۆی وەرنەگرێت.

**١٦ی نیسانی ١٩٩١:** ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بیرۆکەی وڵاتانی ئەوروپایی بۆ جێگیربوونی هێزە زەوییەکان لە خاکی عێراق بە مەبەستی پاراستنی ئاوارە کوردەکان قەبووڵ دەکات. پاش چەند رۆژ سەربازانی ئەمریکایی، بریتانیایی و فەرەنسەیی دەگەنە ناوچەی زاخۆ.

**٢٤ی نیسانی ١٩٩١:** سەدام حوسێن و "بەرەی کورد" باس لە رێککەوتننامەیەکی بنەڕەتی دەکەن، کە خودموختاری کوردستان بە فەرمی قەبووڵ دەکات. ئەم رێککەوتننامەیە کە لە هەلومەرجی رۆژ هەڵقوولاوە، وتووێژێکی درێژخایەنی لێدەکەوێتەوە.

**گولانی ١٩٩١:** ١٢هەزار سەربازی ئەمریکایی، بریتانیایی و فەرەنسەوی لە ناوچەی پارێزراو لە باکووری عێراق و پتر لە ٢١٧٠٠ سەرباز لە تورکیا جێگیر دەبن.

**٢٤ی حوزەیرانی ١٩٩١:** ژمارەی سەربازانی هاوپەیمانان بۆ ٥١٠٠ کەس لە باکووری عێراق و ١١هەزار کەس لە تورکیا کەم دەکرێتەوە.

**ئابی ١٩٩١:** هێزەکانی تورکیا بە ماوەی چەند رۆژ بۆ ئۆپەراسیۆن دژی چەکدارانی pkk دێنە ناو خاکی باکووری عێراق.

**تشرینی دووەمی ١٩٩١:** بۆمببارانەکانی دەوڵەتی عێراق، ئاوارەبوونی پتر لە ٢٠٠ هەزار کوردی لێدەکەوێتەوە.

**تشرینی دووەمی ١٩٩١:** سلێمان دەمیرل، سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی تورکیا، راستی مەسەلەی کورد بە فەرمی قەبووڵ دەکات.

**گولانی ١٩٩٢:** هەڵبژاردنی کوردەکان لە کوردستانی عێراق بەرێوە دەچێت.

**٤ی حوزەیرانی ١٩٩٢:** پەرلەمانی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی عێراق دادەمەزرێت.

**١٥ی نیسانی ١٩٨٧:** هەڵەدن، بەرگەڵو، کانی توو، ئـاوەژێ، سـیروان، نولـچکە، چـنارنە (پارێزگای سلێمانی) چەند کەس کوژران و برینداربوون.

**١٦ی نیسانی ١٩٨٧:** شێخ وەسان، توتمە، زینێ، خەتێ، بالوکئاوا، داریش، چۆمی باڵیسان (پارێزگای هەولێر).

١٢١ کـەس کـوژران کـە ٧٦ کەسیان منـداڵانی ١تـا ٨سـاڵ بـوون. لـە شـێخ وەسـان ٢٨٦بریندار هەوڵیان دا بۆ چارەسەرکردنی برینەکانیان بـچن بـۆ هـەولێر، بـەڵام هـەموویان لەلایەن سوپای عێراقەوە دەستگیرکران و کوژران.

**١٧ی نیسانی ١٩٨٧:** قزلەر، سنگر، مێولاکە (پارێزگای سلێمانی)

١٠کەس کوژران.

**١٨ی نیسانی ١٩٨٧:** ناوچەکانی دەوروبەری قەیوان

٢کەس کوژران

**١٩ی نیسانی١٩٨٧:** موتین، کوواك، کونەکۆتر، دۆڵی بالیسان.

٥٢کەس کوژران.

**٢١ی نیسانی ١٩٨٧:** ناوچەی قەرەداغ (پارێزگای سلێمانی)

سەدان کەس برینداربوون.

**١ی گولانی ١٩٨٧:** زێوێ (ناوچەی دهۆك)

٢کەس کوژران و ژمارەیەك برینداربوون.

**٢٣ی گولانی ١٩٨٧:** تۆمار، گورکان، قەمەر (نزیکی کەرکوك)

١٠کەس کوژران کە ٧کەسیان منداڵ بوون.

**٢٧ی گولانی ١٩٨٧:** نازەنین، نەلاهان، گۆڕە شێر، کەندوولە.

٤٧ منداڵ کوژران.

بەردۆك، بلی، نالی، تاهێ

٧٤ کەس کوژران و سەدان کەس برینداربوون.

**٢٧ی حوزەیرانی ١٩٨٧:**



نازەنین و بالیسان.

چەند کەس کوژران.

زێوە، پیرەمەگرون، سەرگەڵو، بەرگەڵو، یاخسمەر.

٥٣کەس برینداربوون و ٥ ژن و منداڵ کوژران.

هەڵەدن، مالومە

چەند کەس برینداربوون.

**٣ی ئەیلوولی ١٩٨٧:** بەرگلۆ، یاخسمەر

٤کەس کوژران.

**١٤ی ئەیلوولی١٩٨٧:** مێرگەپان ٤١ کەس برینداربوون.

**٢٥ی شوباتی ١٩٨٨:** سەرگەڵو، یاخسمەر، هەڵەدن، گوێزیلە، دۆڵی جافایەتی

٣٦کەس کوژران و ٨٠٠ کەس برینداربوون.

**١٦ی ئاداری ١٩٨٨:** هەڵەبجە، عەنەب، زەمەقی ٥ هەزار کەس کوژران و ٩ هـەزار کـەس بریندار بوون.

**٢٢ی ئاداری١٩٨٨:** ناوچەی شاناخسێ ١٠ کەس کوژان و٦٤٠کەس برینداربوون.

سێوسینان، دوکان، بەلەکجار، جافەران، ولیان، ناوچەی قەرەداخ (پارێزگای سلێمانی)

٧٥ کەس کوژران کە ٤٧کەسیان ژن و منداڵ بوون و پتر لە ٣٠٠ کەس برینداربوون.

٢٧ی ئاداری ١٩٨٨: ٤١٢ بریندار کە لە قەرەداخەوە هاتبوون، لـە سـلێمانی بـە شـوێن یارمەتیدا دەگەڕان.

**١٥، ١٦، ٢٣، ٢٥، ٢٦ و ٢٧ی نیسانی ١٩٨٨:**

ناوچەی گەرمیان

چەندان کەس کوژران.

**٣ی گولانی ١٩٨٨:** گۆپتەپە، عەسکەر، مایلە، گڕشینان، گلنەگەج، سۆتکە، قۆچـەبلاخ، کەڵەشێرە، زرزێ، ناوچەی کۆیە، چەمی ڕێزان.

١١٢کەس کوژران و ٨٤٤ کەس برینداربوون.

**١٥ی گولانی ١٩٨٨:** نازەنین، هیران، دۆڵی سماقولی، وەرتێ

٥١کەس کوژران و سەدان کەس برینداربوون.

## ئەنجومەنی ئاسایش:

بە سەرنجدان بە ئەرك و بەرپرسیاریەتییەکانی خۆی بەگوێرەی مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی،

بە وەبیرهێنانەوەی برگەی ٧ی ماددەی 2ی مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان.

– بە دەربرینی نیگەرانیی قووڵ لە سەرکوتی خەڵکی مەدەنی عێراق لە گەلێ لە شوێنەکانی عێراق، لەوانە لەم دواییانە لە ناوچە کوردنشینەکان کە کۆڕەوی مەزنی ئاوارەکان بەرەو سنوورە نێونەتەوەییەکان، دەربازکردنی سنوور و بەزاندنی سنوورەکانی لێکەوتەوە کە هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایشی ناونەتەوەیی ناوچە دەکات.

– بە دەربرینی ئەوپەڕی خەم و پەژارەی خۆی بە نیسبەت ئەم ئێش و ئازارە مرۆڤایەتییە

– بە سەرنجدان بە نامەکانی نوێنەرانی تورکیا و فەرەنسا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەرواری ٢و ٤ی نیسانی ١٩٩١(S/22435 S/22442).

– هەروەها بە سەرنجدان بە نامەکانی نوێنەری هەمیشەیی کۆماری ئیسلامی ئێران لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەرواری ٣و ٤ی نیسانی ١٩٩١(S/22436 S/22447).

– بە جەختکردنەوەی دووبارە لەسەر دەروەسبوونی سەرجەم وڵاتانی ئەندامی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەرامبەر سەروەری، یەکپارچەیی و سەربەخۆیی سیاسی عێراقو هەموو وڵاتانی ناوچە.

– بە لەبەرچاوگرتنی راپۆرتی سکرتێری گشتیی لە ٢٠ ئاداری ١٩٩١(S/22366)

١ـ سەرکوتی خەڵکی مەدەنی عێراق لە گەلێ لە شوێنەکانی عێراق، لەوانە ناوچە کوردنشینەکان شەرمەزار دەکات، کە ئاکامەکانی هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی ناوچە دەکات.

٢ـ داوا لە عێراق دەکات کە وەك یارمەتییەك بۆ سڕینەوەی هەڕەشەی سەر ئاسایشو ئاشتی نێونەتەوەیی ناوچە، دەستبەجێ کۆتایی بەم سەرکوتە بێنێ و هیوا دەردەبڕێت کە





وتووێژی ئازاد بۆ گارانتیکردنی رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و مافی سیاسیی هەموو هاووڵاتیانی عێراق، ئەنجام بدرێت.

٣ـ لەسەر ئەوە پێداگری دەکات کە عێراق رێگە بە رێکخراوە نێونەتەوەییە مرۆڤدۆستەکان بدات تا دەستبەجێ دەستیان بگات بە هەموو ئەو کەسانەی کە لە هەموو شوێنەکانی وڵات پێویستیان بە یارمەتی هەیە و ئاسانکاری پێویست بۆ چالاکیی ئەم رێکخراوانە بکات.

٤ـ داوا لە سکرتێری گشتیی دەکات درێژە بە هەوڵە مرۆڤدۆستانەکانی خۆی لە عێراق بداتو دەستبەجێ (ئەگەر گونجاو بێ لە رێگای ناردنی لیژنەی زۆرتر بۆ ناوچە) لەمەڕ رەوشی دژواری خەڵکی مەدەنی عێراق، بەتایبەت خەڵکی کورد کە لە هەموو شێوازەکانی سەرکوت بە دەستی کاربەدەستانی عێراقەوە ئازار دەبینن، راپۆرت بدات.

٥ـ هەروەها داوا لە سکرتێری گشتیی دەکات لە هەموو ئامرازەکانی بەردەستی، لەوانە رێکخراوەگەلی پەیوەندیدار بە نەتەوە یەکگرتووەکان کەڵك وەربگرێت بۆ وەڵامدانەوەی خێرا بە پێداویستییە ژیانییەکانی ئاوارەکان و خەڵکی ئاوارە و دەربەدەربووی عێراق،.

٦ـ لە هەموو وڵاتانی ئەندام و رێکخراوە مرۆڤدۆستەکان داوا دەکات لەم هەوڵە سارێژکەرە مرۆڤدۆستانەیە بەشداری بکەن.

٧ـــ داوا لە عێراق دەکات بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە لەگەڵ سکرتێری گشتیی هاوکاری بکات.

٨ـ بڕیاری داوە بە شوێن مەسەلەکەدا بچێت.

بزاڤی هاوبەش بۆ دەرکردنی بڕیارنامە لە لایەن:

– خاتوو دوری بە نوێنەرایەتی گرووپی سۆسیالیست.
– بەڕێز پندرز و خاتوو کاسامگناگو سیریتی، بە نوێنەرایەتی گرووپی حیزبی خەڵکی ئەوروپا
– بەڕێز برتینز و بەڕێز کالوۆ ئۆرتێگا، بە نوێنەرایەتی گرووپی ڕیفۆرمخوازی لیبراڵ دیموکرات
– بەڕێز کریستۆفر جەکسۆن و بەڕێز مەکمیلان ئیسکۆت بە نوێنەرایەتی گرووپی دیموکراتی ئەوروپا.
– بەڕێز رۆز و بەڕێز لانگر بە نوێنەرایەتی گرووپی سەوز.
– بەڕێز کولەجانی بە نوێنەرایەتی گرووپی چەپی یەکگرتووی ئەوروپا.
– بەڕێز دلامالین بە نوێنەرایەتی گرووپی یەکێتی دیموکراتی ئەوروپا.
– بەڕێز وندی میولبروك و بەڕێز ئیونیگ بە نوێنەرایەتی گرووپی کەسك و سوور.
– بەڕێز پیکویت بە نوێنەرایەتی یەکێتی چەپ

پەرلمانی ئەوروپا دەربارەی ڕەوشی کوردەکان بە تێکڕای دەنگ پەسەندی کرد:

– بە لەبەرچاوگرتنی بڕیارنامە پەیوەندیدارەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان
– بە لەبەرچاوگرتنی بڕیارنامەکانی پێشووی خۆی لەمەڕ ڕەوشی کوردەکان
– بە لەبەرچاوگرتنی ئەنجامەکانی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئەوروپا لە ٨ی نیسانی ١٩٩١ لە لوکزامبورگ
ـ بە هۆی ئەوەی کە هێزەکانی ژێر دەسەڵاتی سەدام حوسێن هەوڵ دەدەن بۆ کۆمەڵکوژی کوردەکان
ـ بە لەبەرچاوگرتنی کردەوە گشتییەکانی دەوڵەتە سەرەڕۆکان، لەوانە ئەشکەنجەی زۆری خەڵك و منداڵان لە عێراق بە دەستی سەدام حوسێنو هێزەکانی
ـ بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە هەزاران کەس بە هۆی هێرشو بومبباران دەمرنو بۆمببارانی ناوچە کوردنشینەکان درێژەی هەیە



– بەتوندی لە ئێش و ئازاری ئاوارە کوردەکان کە بێ هیچ پەناگایەك و لە هەژاری تەواودا بۆ ناوچە شاخاوییەکان هەڵدێن، تێکچووەو نیگەرانە دەربارەی هەواڵە پڕ لە داخەکانی ڕێکخراوە مرۆڤدۆستەکانی ناوچە کە بە گوێرەی ئەوە هەزاران ئاوارە (زۆرتر منداڵان) لە جادەکاندا بە هۆی برسێتی، زوقم، نەخۆشی و بریندابوون گیانی خۆیان لەدەستداوە و بە وتەی پزیشکەکان هەر ڕۆژ زۆرتر لە ١٠٠ کەس دەمرن.
– جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە سوپای عێراق هەندێك خەڵکی شیعەی باشووری وڵات ئیعدام دەکات.
– بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە هێزە هاوپەیمانەکان، ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیان پاڵ پێوەنا تا بێنە سەر ئەو بڕوایە کە دەبێ پێشوازی و پشتیوانی لە بزووتنەوەی ڕووخاندنی سەدام حوسێن بکرێت
ـ بەزانینی ئەوە کە تا کاتێك کە ڕێگاچارەیەکی سیاسی بۆ مەسەلەی کورد نەدۆزرێتەوە، هەڕەشەی ئاسایش و ئاشتی ناوچە هەروەها درێژەی دەبێ:

١ـ بەتوندی هەوڵی ڕێژیمی سەدام حوسێن بۆ کۆمەڵکوژی کورد و سەرکوتی خەڵکی عێراق بە گشتیی شەرمەزار دەکات.

٢ـ داوا دەکات هێرش بۆ سەر خەڵك کوتوپڕ کۆتایی پێبێت و دیسان جەخت لەسەر پێویستی گەمارۆکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات هەتا کاتێك کە سەرکوتی خەڵکی کورد و خەڵکی عێراق بەگشتیی درێژەی هەبێ.

٣ـ پشتیوانی لە پێشنیاری ئەنجوومەنی ئەوروپا بۆ پێکهێنانی ناوچەگەلی پارێزراوی کاتی بۆ گارانتیکردنی تەناهی کوردەکان و خەڵکانی دەربەدەری دیکەی عێراق دەکات، بەڵام هەتا ئەو شوێنە کە پەیوەندی بە ئاکام و لێکەوتەکانی درێژکردنەوەی ئەم ڕەوشە هەیە، لە بڕیاری کوتوپڕ دەرکراو بۆ گەیاندنی یارمەتی بۆ کوردەکان پشتیوانی دەکات و پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت کە ئەم یارمەتییە دەبێ وەکو پێویست و کاریگەر بێت. لە ئەنجامدا لە بڕیاری دەوڵەتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بریتانیا و فەرەنسا بۆ ناردنی سەرباز بۆ عێراق بە مەبەستی دابینکردنی ئاسایشی ئەم ناوچانە پێشوازی دەکات.

٤ـ داوا لە ئێران و تورکیا دەکات ئاسانکاری بکەن بۆ یارمەتیدانی خەڵکی کورد و سنوورەکانی خۆیان بەرەو ڕووی ئاوارەکان و ڕێکخراوە مرۆڤدۆستە نێونەتەوەییە ناحکومییەکان بکەنەوەو داوا لە کۆمەڵگای ناونەتەوەیی دەکات کە لە ژێر چەتری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، لە هەوڵەکان بۆ گەیشتن بەم مەبەستە پێشوازی بکەن.

٥ـ جەخت لەسەر ئەركی ئەخلاقیی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان دەكاتەوە، ئەگەر پێویست بێ لە ڕێگای چاكسازی پەیمانی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ دەربازكردنی سنوورە نەتەوەییەكان و پەرەپێدانی ئامرازەكانی پێشگرتنی ڕژێمە سەرەڕۆكان لە كۆمەڵكوژیی.

٦ـ وەبیر دەهێنێتەوە كە ئەو كردەوەیە كە لەگەڵ خەڵكی كورد كراوە، بە گوێرەی كۆنڤانسیۆنی ١٩٤٨ لە حوكمی كۆمەڵكوژیی دایە، هەروەها كە لە كۆبوونەوەی هاوكاریی سیاسی وەزیرانی دەرەوەی ئەورووپا وەبیرهێنراوەتەوەو داوا لە دەوڵەتەكانی ئەندام دەكات ئەم بابەتە بخەنە بەردەم دیوانی دادی ناونەتەوەیی تا ژنۆسایدبوونی ئەم كردەوانە پشتڕاست بكرێتەوەو بە گوێرەی ئەو كونڤانسیۆنە شەرمەزار بكرێت.

٧ـ هیوادارە كە پرسی كورد ببێتە ئەجیندای كۆنفرانسی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەگەڵ بەشداری هەموو وڵاتانی پێوەندیدار تا لەگەڵ نوێنەرانی كورد كۆببنەوە بۆ بەفەرمی ناسینی مافەكان و خودموختاری كوردەكان لە هەموو ئەو وڵاتانە كە كورد تێیاندا دەژین.

٨ـ لە بڕیارنامەی ٦٨٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان لە بارەی ڕەوشی كوردەكان لە عێراق پێشوازی دەكات و هیوادارە كە ئەنجوومەنی ئاسایش لە هەموو ئامرازێكی پێویست بۆ پاراستنی ئاسایشی خەڵكی كورد و یارمەتیدانی ئاوارە كوردەكان بۆ گەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان كەڵك وەربگرێت و زەمانەتی ئەوە بكرێت كە ئەم كەسانە نابن بە قوربانی هیچ جۆرە ئەزیەت و ئازارێك.

٩ـ لەسەر ئەوە پێداگری دەكات كە نابێ هیچ كەسێك كە لە دەستی ڕژێمی عێراق هەڵاتووە، ناچار بكرێت بەپێچەوانەی خواست و ئیرادەی خۆی بگەڕێندرێتەوە بۆ عێراق و داوا لە حكوومەتەكانی ئەندامی كۆمەڵگای نێونەتەوەیی دەكات ئاسانكاری بۆ ئەو كوردانە بكەن كە پێویستیان بە پەناگا هەیە.

١٠ـ لەو بڕوایەدایە كە جێبەجێكردنی بڕیارنامەی ٦٨٨ پێویستی بە بوونی ژمارەیەكی پێویست هێزی ئاشتیپارێز هەیە.

١١ـ فەرمان بە دەفتەری پەرەپێدانی پەرلمانی ئەورووپا دەدات كە كار بۆ ناردنی لیژنەیەكی ناونەتەوەیی بۆ ناوچە بكات.

١٢ـ فەرمان بە سەرۆكی پەرلمان دەدات كە ئەم بڕیارنامەیە بنێرێ بۆ ئەنجوومەنو كۆمیسیۆنی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان و دەوڵەتەكانی توركیا، ئێران، سوریا و عێراق.




||||||||||||| ناوچە کوردنشینەکان








**زاراوەکانی زمانی کوردی**

زاراوەی باکووری
زاراوەی زازاکی
زاراوەی گۆرانی
زاراوەی باشووری
زاراوەی باشووری رۆژهەڵات

## کتێبەکانی دیکەی وەرگێڕ:

١- **کولتور و ناسنامەی کورد،** فیلیپ کرینبروك - کریستییەن ئالێسۆن، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨.

٢- **کوردستان و کورد لە روانگەی نەخشەوانییەوە،** دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٩.

٣- **کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا (دوو بەرگ)،** وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات، ٢٠٠٩.

٤- **تراژیدیا کوردان (راپۆرتەك ژ بۆ نەتەوەیێن یەکبوویی)،** ژێرار شالیان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی کرمانجی، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، ٢٠٠٨.

٥- **بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی تورکیا،** پاوڵ وایت، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، چاپ نەکراوە.

٦- **ئەدەبیاتی زارەکی کورد لە روانگەی توێژەرانی رۆژئاواوە،** وەرگێڕان لە فەرەنسییەوە، چاپ نەکراوە.

٧- **مەم و زین لە هەژدە گێڕانەوەی جیاوازدا،** مایکل چایت، نامەی دکتۆرای زانکۆی کالیفۆرنیا، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.